# تەوحیدو ئەرکی ئیستیخلاف

## (بریکاری خوای گەورە لەسەر زەمین)

## نووسینی: نجم الدين فرج أحمد



چاپی یەکەم ٢٠٢١ز-١٤٤٣ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
حسنين، علي محمد
تەوحیدو ئەرکی ئیستیخلاف (بریکاری خوای گەورە لەسەر زەمین)، نجم الدين فرج أحمد (نووسەر)،
٢٥٨ لاپەڕە،
١٧* ٢٤ سم
بابەت، ئاینیی، فیکری
ISBN: 978-9922-654-33-1

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٣٤٣)ی ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە.



خەتی بەرگ: نەوزاد کۆیی
دیزاین :نوسینگەی تەفسیر

# بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إِنَّ الحمد للهِ نَمحمدهُ وَنَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنا وَمِنْ سَيِّئاتِ أعْمَالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ.

أَشْهَدُ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا الله وَأَشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾

آل عمران: ١٠٢.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء: ١.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب: ٧٠ – ٧١.

أمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كِتابُ اللهِ، وَخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمد صَلى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ

وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ.

پێشکەشە بەو موسوڵمانە خوا ویستانەی

هیممەتبەرزانە،کەبە ئەرکی ئیستیخلافەکە هەڵدەستن.

-کرێکار-

# پێشەکی

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**الْحمد لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلَى رَسُولِه الاَمِيْنِ، محمد وَعَلَى آلِهِ وَصَحبِه أَجْمَعِين.**

کتێبی (رقابة الأمة حلى الحكام)، کە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بەنرخی (عەلی موحەممەد حەسەنەینە)و ساڵی( )١٩٧٩ بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی ئەزهەری میسر لەسەر وەرگرتووە.

دوای (فصل تمهيدي)یەکەی سێ (باب)ەو ،هەر بابێکی دوو (فصل)ە،کتێبەکە هەمووی لەسەر چاودێری ئوممەتە بۆ دەسەڵاتدارانی سیاسیی وڵات لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، پاشان بەراووردکراوە بە تیۆرییە رۆژئاواییەکان لە هەمان بواردا..

ساڵی (٢٠١٤) ماڵ ومنداڵی خۆم بۆیان هێنام بۆ زیندان، بینیم :کتێبێکی زۆر نایابەو شایانی ئەوەیە ـ بۆ زێدە هۆشیاریی سیاسیی ـ بە کوردی بیخەینە بەردەستی نەوەی نوێمان لە ڕابوونی کوردستان، بۆیە کەوتمە بەکوردی کردنی.

دوای زیندان لە ساڵی(٢٠١٨) دا لە کاتی پێداچوونەوەی وەرگێڕانەکەیدا، بینیم: بەشی دووەمی بەندی یەکەم، واتە: (الفصل الثاني) لە (الباب الأول) باسێکی تێروتەسەل و کامڵی ئیستیخلاف (بریکاریی خوای گەورە لەسەر زەمین) دەکات لە روانگەی تەوحیدەوە.

بۆیە پێداچوونەوەیەکی وردم بۆ کردو توێژینەوەم لەسەر سەنەدی

فەرمووده‌كانی كردو له‌ چه‌ند شوێنێكدا، له‌ په‌راوێزدا هه‌ندێک ڕوونكردنه‌وه‌م -كه‌ پێویست بووبێت- بۆ كردووه‌..

هیوادارم خوێندكاران به‌ تایبه‌تی و خوێنه‌ران به‌ گشتیی سوودی وه‌ربگرن و ببێته‌ مایه‌ی بیرخستنه‌وه‌ی ئه‌هلی ئیمان له‌م ئه‌ركه‌ سه‌ره‌كییه‌، تا به‌ یارمه‌تی خوای گه‌وره‌، بانگه‌وازی خواویستیی ، شایسته‌تر هه‌ڵبگرن و به‌لاغی دینه‌كه‌ جوانتر بگه‌یێنن.

خوای گه‌وره‌ به‌ لوتفی خۆی ئه‌م ره‌نجه‌ كه‌مه‌ش له‌ من و هاوكارانم قبوڵ بكات.. اللهم آمین.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما

كرێكار/ ئۆسلۆ

شه‌والی ١٤٣٩/ حوزه‌یرانی ٢٠١٨

## گۆشەنیگایەک

## لە دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی ئیسلامییەوە

**ڕێــڕەو:**

هەموو مەدرەسەیەکی فەلســەفی و دیــدو تێڕوانینــی هەمــوو بیروباوەڕێــک زەمینەی تایبەتی خۆی هەیە کە دەسەڵات و دەزگاکانی لەســەر دادەمەزرێنێــت، کە لەڕاستیدا دروستتر ئەوەیە بڵێین: دەسەڵات و دەزگاکان پراکتیزەکردنی دیدو تێــڕوانینە فەلســەفیەکەو بۆچــوونە فیکــرییە سیاســیەکەیە، کە بیرمەنــدان و هەڵکەوتوان بەدیدو ڕێیان زانیووەو وزەو ورەی خەڵکییان بۆ خستۆتەگەڕ..

شەریعەتی ئیسلامییش لەم ڕێسایە بەدەر نیــیە.. بێگومــان دیــدو تێڕوانینــی عەقائیدیی ئیسلامیی جودایەو روانگەو پێناسەی بۆ گەردوون و ژیان و مــرۆڤ جوداترەو زۆر تــایبەتترە... بەتەواویــی ســەربەخۆیەو لەهەمــوو دیــدو راو رێ و سیستمێک جیاوازترە.

ئەمە شەرح و باسی ووردەکاریی دەوێت، کە (إن شاء الله)ئەوەی پەیوەنــدی بەم بابەتەی ئێمەوە هەبێت دەیهێنینەوەو شیکارانە دەیخەنە بەردەست.

**زاراوەکان و بەکارهێنانیان:**

سەرەتا با کەس بەتوندڕەومان وەسف نەکــات کە دەڵێــین: تــا کۆتاســنوور پیلانێکی گومڕاکاریی خاوەن تین و فشارمان لەســەرە، کە دەخوازێــت خەڵکــی ناچاربکات جۆرەها زاراوە بەکاربهێنن، کە هیچ پەیوەندییەکیان لەدوورونزیــک بە ئیسلامەوە نییە...

دەخوازن زاراوەی نامۆو غەریبەو دوور بۆ دیدو تێڕوانین و ڕێساو سیستمی ئیسـلامیی بەکـاربهێنین.. ئەمە نـامومکینە..،چـونکە بـۆ یەکـتر ناشـێن و لێکناوەشێنەوە...

دیدو تیڕوانینی عەقائیدیی ئیسلامیی سیستمێکی کۆمەڵایەتی خـۆیی هەیە، هەر تایبەت بە خۆیەتی و لە هەموو ڕەهەندو لایەنێکەوە لەو سیستمانە جیـاوازە کە ڕۆژئاوا یان ڕۆژهەڵات دایانڕشتووە...

بۆیە ناشێت بە نەخشەی دیدو پێناسەی ئەوانەوە لە دووی دیـدو ڕاو بنەمـاو ڕێسای ئیسلام بگەڕێین و پێناسەو هەڵسەنگاندن بۆ موفرەداتەکانی بکەین.

ئەمە ناشێت و ناکرێت, ،چونکە کەس نـاگەێنێتە هـیچ... دیـدو تێـڕوانین و بزاوت و هەڵوێسـت و دەسـتورو سیسـتمی ئیسـلامیی، هەر دەبێـت لە ڕوانـگە زاراوەو چەمکەکانی خۆیەوە بێت.

ڕوانینی دیدو ڕاو دەسـتورو سیسـتمی ئیسـلامیی لە ڕوانـگەی فەلسـەفەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتەوە کەس ناگەێنێتە ڕۆشنیی، بە پێچەوانەوە، لێکـۆڵینەوەکە لە ڕێڕەوی خۆی لادەدات و دەیخاتە ناو ئاڵۆزیی و پشێویی و نامۆییەوە...

دەبێ هەڵوێسـتی شـەرع لە هەمـوو مەسـەلەیەکدا لە ڕوانـگەی عەقیـدەی ئیسـلامییەوە تەماشـابکرێت و بناسرێـت، نەک بە پێناسـەی غەیرەئیسـلام بناسێنرێت..

ئەمە بۆ هەموو خاڵێکی گەورەو گچکە هەریەکە... هەموو ئەو باس و بابەتە فیکریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیانەی لەم سەردەمەدا خەڵکی پێیانەوە سەرقاڵن و هەر لە دیدی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە دەیبینین، هەر وایەو دەبێ ـبۆ حـاڵیبوون لە دیدو هەڵوێستی ئیسلام لێیانـ بگەڕێینەوە سەر بنەمـاو ڕێسـاو زاراوەکـانی ئیسلام خۆی[١].

(١) بڕوانە: محمـد ئەسەد کتێبی: منهاج الإسلام في الحكم. بە عەرەبیکردنی منصـور محمـد مـاضي/ ←

ژیانبینی ئیسلامیی ،چونکە خۆی هەموو پێکهاتەکانی کامڵن، گشتگیرن، وردەکارن، بەرفراوان و قووڵن، ڕەسەنن، هەماهەنگیان لە نێواندا مەحکەمە، پەیوەندییان پێکەوە بۆ کامڵکردنی یەکتریی توندوتۆڵە.

بۆیە نە پێویستیان بە دیدو تێڕوانین و پێناسەو زاراوەی غەریبە هەیە، نە بواریشی بۆ دەکەنەوە... با تەنها زاراوەیەکیش بێت.. نا،چونکە هەموو زاراوەیەک بارودۆخ و حاڵەتی داهێنان و مولابەساتی خۆیی هەیە،ماناو واتای تایبەت بە بارودۆخ و کەشی لەدایکبوونی هەیە، کە دەخزێنرێتە بوارێکی ئیسلامییەوە _ چونکە غەریبەو نامۆیە_ جەستە ئیسلامییەکە قبووڵی ناکات و زاراوەکەش ناتوانێت _دوور لە کەش و بارودۆخی خۆی- خۆی بگرێت و بچەسپێت..

ژیانبینی ئیسلامییش وایە... پڕە لە زاراوەو پێناسەی تایبەت بە خۆی کە لە دیدە عەقائیدییەکەی خۆیەوە هاتووەو بە زمانی خۆی و دارشتن و داتاشین (اشتقاق)ی زمانەوانی خۆی داڕێژراوە، ماناو واتاو ئاماژەو مولابەساتی خۆیی هەیە، کە ناشێت نە ئەم ببرێتە ناو جەستەیەکی ترو نە زاراوەیەکی تری بهێنرێتەجێ... ئەم خاڵە دیاردەیەکی ووردەکارانەیەو هەستێکی ناسک و ساف دەخوازێت، تا پەی پێببات و مامەڵەی وەکو خۆی لەگەڵدا بکات و بەدەستەواژەی ڕەسەنی خۆی گوزارشتی لێبکات[1].

---

دار العلم للملايين_ بيروت چاپی یەکەم ١٩٥٧ ل:٥٢. سەید قوطب: خصائص التصور الإسلامي ومقوماته. دار الشروق بيروت والقاهرة ل ١١٧. (محمد ئەسەد ڕۆژنامەوان و بیرمەندێکی نەمسایی بوو، پێش موسوڵمانبوونی ناوی لیۆپۆڵد ڤایس بوو).

(١) سەید قوطب: خصائص التصور الإسلامي ومقوماته. دار الشروق بيروت والقاهرة ل ١١٧.

**بنەما عەقەئیدیەکانی ئیسلام گونجاوترن لە ڕێسا فەلسەفییەکان:**

لەو روانگە عەقائیدییەی سەرەوەوە دەبینین: زاراوەی (بنەمای عەقائیدیی) زاراوەیەکە نزیکترە لەرۆحی شەریعەتی ئیسلام، وەک لەوەی بوترێت: (بنەمـای فەلسـەفی) ،چـونکە فەلسـەفە بـۆ خـۆی وشـەیەکی یۆنـانیە، نە واتـای و نە مەدلـولاتی و نە مێـژووی لەگەڵ ئیسـلام و سیسـتم و ڕێسـاکانی ئیسـلامییدا ناسازیێت[١].

(١) دکتۆر فوئاد الأهواني لە کتێبـی الفلسـفة الاسـلامیة دا دەڵـێ: فەلسـەفە زاراوەیەکـی یۆنـانییەو کەوتۆتە ناو زمانی عەرەبییەوەو بە ماناکەی خۆی بەکارهێنراوەتەوە.

فـارابی دەڵـێ: نـاوی فەلسـەفە یۆنـانیەو کەوتـۆتە زمـانی عەرەبیـیەوە، لە زمـانی خۆیـدا (فیلۆسۆفیا)یە، واتە: (لەپێشگرتنی حیکمەت) یان: ڕەچـاوکردنی دانـایی، کە لە زمـانی ئەوانـدا لە دوو وشە پێکدێت: (فیلۆ) یان (فیلا) لەگەڵ (سۆفیا) وشەی فیلا واتە پێشچاوخستن و ڕەچاوکردن و گرنگی پێـدانی (سـۆفیا) کە دانـاییە. فەیلەسـووفیش لە وشـەی فەلسـەفەکەوە هـاتووەم کە بە زمانی خۆیان (فیلۆسۆفووس)ە، بە لای ئەوانەوە ئەمە ئەو کەسەیە کە دانایی دەخاتە پێش هەمـوو شتێک و حیکمەت لە هەمـوو ڕەفتارێکییـدا ڕەچـاو دەکـات. . پاشـان فـارابی دەڵـێ: ( پێناچێـت ناچاربین جەخت لەوە بکەینەوە کە فەلسەفەی ئیسلامی لە وشـەیەکی بێگـانەوە هـاتووە، چـونکە وشەکە خۆی دیارە کە بێگانەیەو لە خـودی یۆنـانییەوە وەرگیـراوە. ئەمـا (عیلمـی کەلام) لاریـی لەبەکارهێنانییدا نییە، چونکە زانستییەکی ڕەسەنی ئیسلامییە.

_ الفلسفة الاسلامیة /سلسلة المکتبة الثقافیة _ وزارة الثقافة والإرشاد القومي بمصر (الکتاب رقـم ٦٩ لە ١٩٦٩/٩/١٥) ل: ٢٠_٢١.

_ هەروەها بڕوانە: محمـد البهي: الجانب الإلهي في التفکیر الإسلامي/ مکتبة وهبة جاپی سێیەم ١٩٦٢ ل: ١٤ و دواتری.

_ وا دیارە مامۆستا عبـاس محمـود العقـاد بـایەخی زۆر بە ڕەسـەنکردنەوەی ئەم زاراوانە نەدەدا، بـۆیە بەلایەوە ئاسایی بوو کە زاراوەی فەلسەفە لە بابەتەکانت ئیسـلامدا بەکاربهێنێـت. بۆنمـوونە، کە دەڵـێ: (حـوکمی ئیسـلام بـریتییە لە حـوکمکردن بەقورئـان و سـوننەت کە هەمـوو لەسـەریی ڕێکەوتوون، وشـەیەکیش لە قورئـان و سـوننەتدا نیـیە کە ڕێ لە بیرکـردنەوە لە مەسـەلەیەک لە مەسەلەکانی فەلسەفە بگرێـت، یـان لە مەدرەسـەیەکی فەلسـەفی، مـادام لەو دیـدە فەلسـەفییەدا

←

**زاراوەی عەقیدە:**

ئەسڵی زاراوەی عەقیدە لە (عَقْد)ەوە هاتووە، ماناو واتاکانی بەم شێوەیەن:

عَقَدَ: العَقْد، واتە: کردنەوە. پێچەوانەی گرێدانە. عَقَدَهُ يَعْقِدُهُ عَقْداً وَتَعَاقَدَا وَعَقَدَهُ واعْتَقَدَهُ: وەکو (عَقَدَهُ)ە.

- انْعَقَدَ و تَعَقَّدَ: بەسترا ، عَقَدْتُ الحَبْلَ فهو مَعْقُودٌ: گوریسەکەم گرێدا ئێستا گرێدراوە، مارەییش لەمەوە هاتووە، کە دەوترێت: عَقَدَ النِّكَاحَ، واتە: گرێبەستی مارەییەکەی بەست.

-عَقَدَ الْعَهْدَ والْيَمِينَ يَعْقِدُهَا عَقْداً، واتە: پەیمانی بەست، بەڵێنیدا، سوێندەکە یان بەڵێنەکەی تەئکیدکرد.

الْعَقْدُ: الْعَهدُ: گرێبەست، پەیماندان، کۆیەکەی (الْعُقُودُ)ە. عَقْدٌ: توندوتۆڵترین بەڵێن. عَقَدَ قَلْبَهُ عَلَى شَىءٍ: لَزِمَهُ: واتە دڵی بەشتێکەوە پابەندکرد، لەدڵیدا بڕیاریدا پێوەی پابەندبێت. اِعْتَقَدَ الشَّيئَ : صَلَبَ واشْتَدَّ: توندو رەق بوو، بەهێزتربوو.

---

شتێکی وای تێدا نەبێت کە شەرع قبووڵی نەکات، یان کاریگەریی خراپی لەسەر یەکدەنگیی و یەکێتی کۆمەڵی موسوڵماناندا هەبێت. ڕێ لەوە نەگیراوە دیدی فەلسەفی چۆن دەیەوێت با وا دەرببڕێت(. بڕوانە: التفكير فريضة اسلامية چاپی دار الهلال/ مصر ل: ٥١.

_ عەققاد لە شوێنێکی تریشدا دەڵێ: (ئەگەر ئەو حکومەتە پێک بێت کە دەقە قورئانییەکان داوای دەکەن، بە زاراوەیەکی سەردەم وەسف بکرێت، دەوترێت (حکومەتێکی دیموکراسی) چونکە حکومەتێکی شورایی و یەکسانییەو ڕێگرە حوکمی تاکڕەویی دەبێت). بڕوانە: الفلسفن القرآنية/ دار الكتاب العربي _ بيروت چاپی دووەم ١٩٦٩ ل: ٣٧.

_ بۆ بەرپەرچی ئەم بۆچوونانە بڕوانە: د. عبدالكريم عثمان: معالم الثقافة الإسلامێن/ مؤسسة الأنوار/ الرياض ل: ٢٤٠ و دواتری. هەروەها: محمد أسد: ،مهاج الإسلام في الحكم ل: ٤٨ و دواتری.

عَقْـد: بـۆ زێـدەمتمانەکردنە... واتاکـانیتریش دەگەڕێـنەوە سـەر ئەم، بـۆیە دەوترێت: (عَقَدَ قَلْبَهُ عَلى كَذَا فَلا يُنْزَعُ عَنهُ).[1]

واتە: دڵی پابەندکرد بە فڵان شتەوەو لێی داناماڵرێت.

سـەرجەمی مانـاو واتاکـان دەبـنە تەوەری بەسـتن و تونـدو تـۆڵکردن و متمانەپێکردن و جەختکردن لەو شتەی کە کەسێک باوەڕی وایە: کە ئاوایە... بە واتایەکیتر: باوەڕبوونێکی پتەوو جێگر بە شتێک کە نە لە کەسەکە دادەماڵرێت و نە لەقیش دەکرێت لای.

ئێمە لێرەدا وا باس لە بنەماکانی بـاوەڕ لە عەقیـدەی ئیسـلامییدا نـاکەین، وەکو کە عەقیدەوانانی (علماء الكلام) لە کتیبی عەقائییدا باسیان لێـوەکردووە، چونکە نە ئێرە بوارێتی و نە ئەوەش مەبەستی ئەم باسەی بەردەستمانە...

ئێمە لێرەدا جەخت لە بنەما عەقائیدییەکان دەکەینەوە کە قورئـان و سـوننەت جەختیان لێکردوونەتەوەو ئـوممەت لەسـەری ڕێکەوتـووە، کە (تەوحیـد) واتە: ناسین و پەرستنی خوای گەورە بە تاکوپاکیی.

پاشان پەیوەندی و کـاریگەریی ئەم بنەمایـانەی تەوحیـد لەسـەر سیسـتمی حوکمڕانی ئیسلامیی و بوارو لقەکانی ،چونکە تەوحیـد زەمیـنەی عەقائیـدیی و فیکریی باسەکانی حاکمێتیە..

دوای ڕوونکـردنەوەی ئەم بنەمـا عەقائیـدییانە _کە زەمیـنەو ڕوانـگەی

(١) ابن منظور: لسان العرب/ دار بيروت للطباعة والنشر چـاپی ١٣٧٤ک/ ١٩٥٥ز بەرگـی سـێیەم ل: ٢٩٦ و دواتری. هەروەها: أبوالحسين أحمد بن فارس ابن زكريا: معجم مقاييس اللغة _ توێژینەوەی عبدالسلام محمـد هارون/ دار إحياء الكتب العربية چاپی یەکەم/ قاهیرە ١٣٦٩ک بەرگی٤ ل: ٨٦.

ژیانینی ئیسلامییین_ دێینه سەر باسی (الخلافه) که بریکارێتیی خـوای گەورەیه لەسەر زەمیندا، بریکارێتیی بەو سیفەتە کە ئەرک و رۆڵی مرۆڤە، خوای گەورە فەرزیکردووە لەسەری...

پاشان دێینه سەر باسی پەیوەندی حـاکمی موسـوڵمان بە خـوای گەورەوە، کە بەهۆی ئەم پەیوەندییەوەیە بە کۆمەڵگەکەیەوە پەیوەستبووەو بۆتە دەسەڵاتداری باڵایان.

هەمـــوو ئەمـــانەش لەو ســـەرچاوانە وەردەگـــرین کە موســـوڵمان، بنەمـــا عەقائیدییەکانی خۆیی لێ وەردەگرێت.

ئەم کتێبە دەکەینە چوارباس:

باســی یەکەم: دیـاریکردنی ســەرچاوەکانی بنەمـای عەقائیـدیی لە سیســتمی ئیسلامییدا.

باسی دووەم: دەربارەی تەوحید.

باسی سێیەم: بریکارێتیی مرۆڤ بۆ خوای گەورە لە سەرزەمین.

باسی چوارەم: دەربارەی حاکمی موسوڵمان و پەیوەندیی بە خوای گەورەوە.

## باسی یەکەم

## سەرچاوەی بنەما عەقیدییەکان لە ئیسلامداو سیفەتەکانی

**بڕگەی یەکەم:**
**سەرچاوەی بنەما عەقائیدییەکان:**

گومانی تێدا نییە پێناسەی ژیان لە دیدو تێڕوانینێکی عەقائیدییەوە دێت، عەقیدەکە هەر چۆنێک بێت ژیان بینیەک بە خاوەنەکەی دەدات،ئەگەر خەڵکی غەیرەموسوڵمان لە وەرگرتن و دارِشتنی ژیانبینی خۆیاندا سەربەست بن، بە پێی ئەو دیدو تێڕوانین و پێناسە فەلسەفییەی گرتوویانەتەبەر، کە هزرو ژیری خۆیان رێنماییکردوون و، گەیشتوونەتە ئەوەی ئەو دیدو تێڕوانینە بکەنە ئایدیۆلۆژیای ژیانی خۆیان.

موسوڵمان سەربەست نییە ئاوا دوای وەرگرتنی ئیسلام لەم دیدو راو لەو تێڕوانین و پێناسەوە ئەمبەرەوبەر بکات و چی ویست وەریبگرێت و چۆنی ویست وا دابرِێژێت..

نا، موسوڵمان بۆی نییە دوای موسوڵمانبوونی بە کەیفی خۆی لە دیدو تێڕوانینی فەلسەفی جوداو دوور ئاراستە وەربگرێت،موسوڵمان دوای موسوڵمانبوونی ،دەبێت بە دوو سەرچاوەی عەقیدەکەیەوە پابەندبێت و بە موو لێیان لانەدات.

دەبێ پێیانەوە پابەندبێت، نەک هەر لە وەرگرتنی ژیانبینییدا، بەڵکو لە وەرگرتنی هەموو رێساو سیستمێکی ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی وئابووریشییدا، دەبێت هەموو ژیانی لەبەر رۆشنایی ئاراستەی ئەو دوو سەرچاوە عەقائیدییە دابرِێژێت.

دەبێت چۆنییەتی پەیوەندییەکانی لە روانگەی پەیوەندێتی عەبدێتی خۆیەوە بۆ خوای کردگاریی دیاریی بکات،هەر پەیوەندییەک لە روانگەی قورئان و سوننەتەوە شیاونەبن، نابێت ئەم پێی شیاوبێت، نابێت هیچ بزاوت و هەڵوێستێکی ئیجابی لەسەر بنیاتبنێت.

دکتور (عەلی سامی النشار) دەربارەی قورئان و دیدی فەلسەفیی دەڵێ: (قورئانی پیرۆز لای یاوەران هەر کتێبی ئامۆژگاریی ئەخلاقی نەبوو، هەر باسی مێژووی سەدەکانی رابوردووی مرۆڤایەتیی نەبوو، کە دەبێت پەندیان لێوە وەربگیرێت، بەڵکو کتێبێکی غەیبی و مرۆڤایەتیی بوو.

کتبێکی رەوشتسازیی و کردەوەیی بوو، خاڵە سەرەکییەکانی (حەقیقەتی وجود)ی ڕوونکردەوە ،چونکە قورئان کتێبی گەردوون و ژیانە، لە دەستپێکیانەوە تا کۆتاییان)..

(ئەوەی دەربارەی قورئان دەوترێت و پێی پێناسە دەکرێت، بۆ سوننەتیش هەر وایە.. لەگەڵ ئەم سەرچاوەی حەقیقەتە عەقائیدییەکاندا کە قورئانە، سەرچاوەی دووەمییش هەیە کە سوننەتە، کە بریتییە لە: هەموو گوفتارو کردارو ئاماژەو بڕیارێک کە لەپێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەرچووە.

ئەوەی لەم سەرچاوە دووەمینەوە وەردەگیرێت، کەمتر نییە لەوەی لە سەرچاوەی یەکەمینەوە وەردەگیرێت، هەردووکیان دەربارەی حەقیقەتی خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی مەخلووقات _بە تایبەتی مرۆڤ_ دەکەن، هەردوو سەرچاوەکە وەکو دەق وراقە، ژیانبینیی موسوڵمان دادەڕێژن و دیدو روانگەی خواناسیی و رێساکانی عەبدێتیی پێدەناسێنن)[1] .

---

(١) لە هاوڕێ دکتۆر فارووق ئەحمەد حەسەن دەسسووقییەوە وەرمگرتووە لە کتێبی: مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص. ماستەرنامەیە پێشکەش کراوە بە کۆلیجی ئادابی زانکۆی ئەسکەندەرییە لە ١٩٧١دا. ل: ٧.

←

داوا لە موسوڵمان کراوە: کە بەردەوام لەم دوو سەرچاوەیە وەربگرێت و لە هەموو شتێکدا بگەڕێتەوە سەر ئەمان.

گەڕانەوەلایان زۆرەملێ نییە، ترس و تۆقاندن نییە، بەڵکو ڕەفتارێکی هۆشیارانەی سەرپشکە بە ڕەزامەندیی خۆیەتی، بۆ ئاسوودەیی دەروونی خۆیەتی، بۆ ڕەچاوکردنی حەق و لێلانەدانێتی، بە ئومێدی پاداشتی قیامەتێتی..

ئایەتی قورئانی لەم بارەوەو زۆرن لەوانە: ﴿قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾﴾ آل عمران: ٣٢ .

واتە: پێیان بفەرموو: گوێڕایەڵی خوای گەورە پێغەمبەری خوا بن ((صلى الله عليه وسلم)) ئەگەر گوێیان نەدایەو پشتیانتێکردیت ئەوە بزانە کە خوای گەورە کافرانی خۆشناوێت.

- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى

_تێبینی ئەوە دەکرێت کە کتێبەسەرچاوەکانی (إصول الفقه) بە شێوەیەکی گشتی باسیان لە سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلام کردووە، بۆیە ئێمە لێرەدا هەر ئەوەندە باسی لێوە دەکەینەوە، کە پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەبێت. لەو کتێبە سەرچاوانەش:

_ المستصفى من علم الأصول/ ابوحامد الغزالي. توێژینەوەو ناساندنی شێخ محمد مصطفى أبوالعلا. بڵاوکار: مكتبة الجندي لە قاهیرە. چاپی ١٣٩١ک/ ١٩٧١ز ل ١١٩ و دواتری.

_ الشيخ محمد الخضري: أصول الفقه ل: ٢٠٧ و دواتری.

_ الشيخ عبدالوهاب خلاف: علم أصول الفقه ل: ١٢٠ و دواتری.

_ الشيخ عبدالوهاب خلاف: مصادر التشريع الإسلامي فيما لا نص فيه/ چاپی دار القلم. کوەیت/ چاپی سێیەم ١٣٩٢ک؟ ١٩٧٢ز ل ١٩ و دواتری.

_ الشيخ محمد زكريا البرديسي: أصول الفقه ل: ١٦٩ و دواتری.

_ د. علي جريشة: المشروعية الاسلامية العليا ل ٩٣ و دواتری.

_ بە ئینگلیزییش بڕوانە:

The Religion of Islam by Maulana Muhamed Aly, A.R.E.., P.P. 17 ff

ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾ النساء: ٥٩.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتانهێناوە! ملکەچی فەرمانی خوای گەورەو ملکەچی فەرمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و بەرپرسانی خۆتان بن، کە هەر لە خۆتانن، ئەگەر لە ناوخۆتاندا لە شتێکدا راجوێ و ناکۆک بوون، بگەڕێنەوە لای خوای گەورە (داوەریی ببەنەوە لای قورئان) و لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (مادام لە ژیاندا بێت، دوای کۆچی دوایی کردنیشی بچنەوە سەر سوننەت)، ئەگەر ڕاستدەکەن و باوەڕتان بە خوای گەورەو بەرۆژی دوایی هێناوە (واتە ئەگەر ڕاستەو ترسی قیامەتتان لە دڵدایە) ئەمەتان چاکترەو خێرەوەدەرترە وەک لە راوبۆچوونی خۆتان.

- ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ النساء: ٦٥ .

واتە: سوێندبێت بە خوای پەروەردگارت، بە موسوڵمان هەژمارناکرێن، ئەگەر جەنابت نەکەنە داوەری یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکیی و کێشانەی لە ناویاندا درووست دەبێت،هەر دەبێت بێنەوە خزمەت جەنابت بۆ داوەرییکردن (نەک هەر ئەوەندە) بەڵکو دەبێت بە داوەریی و بڕیارەکەشت رازیبن (نەک هەر ئەوەندەش بەڵکو) نابێت لە دڵ و دەڕوونیشیاندا هیچ گرێ وگۆڵیی (نارەزایی) یەک هەبێت و دەبێت بە تەواویی بە بڕیارەکەتەوە پابەندبن و جێبەجێیبکەن.

- ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾﴾ النساء: ١٣ – ١٤ .

واتە: ئەو ئەحکامانەی باسکران (لە ئایەتەکانی پێشتردان) هەموو ئەحکامی شەریعەتی خوای گەورەن و سنووریانی دیاریکردووە، تا پێوەی پابەندبن، هەر

کەسێک ملکەچی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بێت ئەوە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتانێکەوە کە جۆبارو ڕووباریان پێدادێت و دەڕوات و بە نەمریی تێیدا دەمێننەوە، هەر کەسێکیش سەرپێچی لە فەرمانی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بکات و سنووری ئەحکامەکانی شەرع ببەزێنێت، خوای گەورە دەیخاتە ئاگری دۆزەخەوەو، هەتاهەتایە بە نەمریی تێیدا دەمێنێتەوەو سزای بەژان دەچێژێت.

- ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٣٢﴾ آل عمران: ١٣٢ .

واتە: ملکەچی خوای گەورەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بن، تا خوای گەورە روحمتان پێ بکات.

- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ ٢٠ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ٢١ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ٢٢ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ٢٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٤ ﴾ الأنفال: ٢٠ – ٢٤ .

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتانهێناوە!ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بن (صلی الله علیه وسلم)، وانەبن پشتهەڵ بکەن و گوێ نەدەنێ، لە کاتێکدا کە دەبیستن و فەرمانەکان ڕۆشنە لاتان، وەکو ئەوانە مەبن کە دەیانوت: بەڵێ، گوێمان لێیەو نەشیاندەبیست،خراپترین مەخلووق، کە بەسەر ئەم زەویەدا دەڕوات ئەو کەسانەن کە خۆیان لە حەنای بیستنی حەقدا کەڕو لاڵکردووە، ئەوانە ئەقڵیان پێناشکێت.

ئەگەر خوای گەورە بیزانیایە ئەوانە خێریان پێوەیە وایلێدەکردن گوێ بـدەنێ و ببیســـتن، بەڵام کاتێــک وایــان لێــدەکات ببیســـتن، خۆگێــل دەکەن و پشـــتهەڵدەکەن. ئەی ئەو کەســانەی باوەڕتانهێنــاوە! کاتێــک خــوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بانگهێشـتتان دەکەن بـۆ باوەڕهێنـان، بـۆ ئەو بەرنامەیەی کە ژیانتانی پێـوە بەنـدە، زوو وەدەنگیـانەوە وەرن و وەڵامیـان بدەنەوە.

ئەوەش بزانن کە خوای گەورە دەتوانێت بەربەست بخاتە نێوان کەسێک و دڵییەوە.. بشزانن کە هەموتان بۆ لای خوای گەورە دەگەڕێنەوەو لای ئەو کۆدەبنەوە..

- ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ۝٥١ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ۝٥٢﴾ النور: ٥١ – ٥٢ .

واتە: هەر کاتێـک کە موسـوڵمانان بـۆ لای خـوای گەورەو پێغەمـبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بانگهێشتدەکرێن، تا حوکمێکی خـوای گەورە وەربگـرن، یەکسەر دەڵێن: بەسەرچاو واهاتین، دەڵێن: گوێمان لێبوو، ملکەچیـین.. ئـائەوانە ســەرفرازن. هەر کەســێک ملکەچــی فەرمــانی خــوای گەورەو فەرمــانی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بێت و ترسی خوای لە دڵدا بێت و سڵ لە سزای بکات و خۆی لێ بەدووربگرێت، بەڕاستی سەرکەوتوو ئائەوانەن.

- ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ۝٣٦﴾ الأحزاب: ٣٦ .

واتە: بــۆ پیــاوو ئــافرەتی موســوڵمان نیــیە ، ئەگەر خــوای گەورە یــان

پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) فەرمانێکیان بۆ دەرکردن، خۆیانی تێدا سەرپشک بکەن (حەتمەن دەبێ بە خۆشحاڵییەوە وەریبگرن و جیبەجێی بکەن).

هەر کەسێک سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە یان پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بکات، بە دڵنیاییەوە ئەوە کەوتۆتە گومڕاییەکی زۆر دیارو دژوارەوە.

- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ١ ﴾ الحجرات: ١.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتانهێناوە! پێشنیار مەخەنە پێش فەرمانی خوای گەورەو فەرمانی پێغەمبەرەکەیەوە (صلی الله علیه وسلم) و لە خوای گەورە بترسن، خوای گەورە بیسەرو زانایە.[1]

**بڕگەی دووەم: حەق یەکە:**

کە موسوڵمان پابەندە بەوەی ئەو دووسەرچاوە عەقائیدییە وەربگرێت و بۆ هەموو حوکمێک بگەڕێتەوە سەریان، لەبەر ئەوەیە کە لە دیدو تێڕوانینی ژیانبینیی موسوڵماندا وایە، کە ژیانی مرۆڤایەتیی دوو حاڵەتی هەیە، کە پەیوەندییان بە کات و شوێنەوە نییەو کات و شوێن بەهایان دیاری ناکەن.

هەر حاڵەتێکیشیان لە تەرازووی خوای گەورەدا کێشیان هەیەو بەهای کێشیان دیاریکراوە، تەرازووی خوای گەورەش نەگۆڕەو کات و شوێن کاریگەریی لەسەر نییە... دووحاڵەتەکەش:

- حاڵەتی وەرگرتنی هیدایەتی خوای گەورەو پێوەپابەندبوون (حاڵەتی حەق و حەقخوازیی).

(١) هەمان هەڵوێست لە سوورەتی ئەنفال/ ٢٠،٢١،٢٤ و سوورەتی الاحزاب/٣٦ داوا دەکات.

- حـاڵەتی لادان لە ڕێبــازی خــوای گەورەو گومڕابــوون (حــاڵەتی باتــڵ و ناڕەوایی).

حاڵەتی یەکەم یەکێکە، کە وەرگرتنی دینی خوای گەورەو پێوەپابەندبوونێتی.

حاڵەتی دووەم زۆرو جۆرەهایە ،چـونکە لادان لە دینـی خـوای گەورە سـەدان دیدی لێڵ و ڕێگای وێڵە.

_ کەوابوو: خەڵکی ،یان بەدینەکەی خـوای گەورەوە پابەنـد دەبـن (کە دیـدو تێڕوانینی عەقائیدیی و خواپەرستیی و قیەمی کۆمەڵایەتی و ڕەفتارو ڕەوشت و دەستورو ڕێساکانی حوکمڕانییە)،یـان دینـی خـوای گەورە وە ل دەکەن و هەواو هەوەس و ناڕەوایی و گومڕایی دەگرنەبەر.

_ خوای گەورە فێری کردووین کە حەق یەکەو فرەیی ناگرێتەخۆ، نـاڕەواییش زۆرە.. لە دنیاشـدا هەق و نـاهەق (کە هەواوهەوەس و نـاڕڕەوایی و گـومڕاییە) هەیە.. لە حەق بترازێت ناهەقییە... خوای گەورە ناهەقییەکەی ناوناوە باتـڵ.. کە هەواو هەوەس و ناڕەوایی و گومڕایی (ضلال)ە:

﴿فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾﴾ يونس: ٣٢ .

واتە: خـــــوای گەورەیە، کە (بــــکەرو هەڵســــوڕێنەری ئەو هەمــــوو مەخلووقاتانەیە... لەئایەتەکانی پێشوودا باسکراون)، ئەو، خوای پەروەردگارتانە کە خەلقیکردوون، خوای حەق، خوای ڕاست ودرووست و ڕەوایی نەگۆڕ، ئیـدی کە لە حەق بترازێت جگە لە گومڕایی هیچیتر نییە... لە حەق ترازا باتڵە... ئیـدی بۆچی وا خۆ لە حەق لادەدەن؟ بۆچی گومڕاییتان پێ پەسەندترە؟!

_ خوای گەورە پێشی ڕاگەیاندووین: هەر وەکو کە خـۆی حەقە (کە لە قورئانـدا ڕوونکراوەتەوە) نێرراوەکەشی محمد (صلی اللـه علیـه وسـلم) پەیـامی حەقـی

خواویستی هێناوەو لەسەرحەقە، وەک دەفەرمووێ ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ١١٩﴾ البقرة: ١١٩ .

واتە: ئێمە جەنابتمان بەدیدو رێی حەقەوە ناردووە، تا مژدەدەربیت بۆ ئەوانەی باوەڕدەهێنن، کە چارەنووسیان بەهەشت دەبێت و هۆشدەربیت بۆ ئەوانەی، کە باوەڕناهێنن، کە چارەنووسیان دۆزەخ دەبێت.

_ هەروەکو کە خوای تاکوپاک حەقەو پێغەمبەرەکەشی (صلى الله عليه وسلم) لەسەر حەقە، قورئانەکەش حەقەو لە خوای گەورەوە هاتووە، وەک دەفەرمووێ:

- ﴿نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ﴾ آل عمران: ٣ .

واتە: خوای گەورە ئەم قورئانەی بۆ ناردوویەتە خوارەوە، کە پەیامی حەقە.[1]

(١) خصائص التصور الإسلامي ل: ١٠٢ هەروەها: عبدالقادر عودة: المال والحكم في الإسلام/ الدار السعودية للنشر والتوزيع. جدة چاپی سێیەم ١٣٨٩ک ل:٥١. هەروەها: د. عبدالكريم عثمان: معالم الثقافة الاسلامية ل: ١٤٧ و دواتری.

## برگەی سێیەم:
## بنەما عەقائیدییەکانی دیدو تێڕوانین لە ئیسلامدا:

**-لەقورئانی پیرۆزدا:**

﴿ ۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ۞﴾ البقرة: ١٧٧ .

واتە: چاکەخوازیی ئەوە نییە (وەکو جولەکەو دیانەکان دەیانوت) لە نوێژدا ڕووبکەیتە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا، ئەوە گرنگ نییە ،چونکە تۆ هەر خوادەپەرستیت، چاکەخوازیی بریتیە لەو دیدو دینەی کەسێک گرتویێتیەبەر (کە پەیامی حەقی خوایی وەرگرتووە)، کە باوەڕی بە خوایەتی خوای گەورەو بەهەبوونی ڕۆژی دوایی وبەفریشتەو بەپەیامی خوایی و بەپێغەمبەران ((علیهم السلام) هێناوە) (ئەمە ئیمان).. ئینجا _لە خۆشەویستی خوای گەورەو بۆ ڕەزامەندیی ئەو_ ماڵ وسامانی بە کەسوکارە موحتاجەکانی و بە هەتیوو بەهەژارو نەدارو بە ڕێبوارانی لێقەوماوو بەوانەی داوای یارمەتی لێدەکەن دەبەخشێت، هەروەها بۆ کۆیلە ئازادکردنی خەرجدەکات (ئەمەش ڕەفتار و ڕەوشتی موسوڵمانانە) دیسان چاکەخوازی ئەو کەسەیە کە نوێژەکانی دەکات و زەکات دەدات و بە پەیمان و بەڵێنەوە پابەنددەبێت (ئەمەش خواپەرستیی)..

هەروەها بە ئارام و بە سەبرەو خۆی لە حاڵەتەکانی هەژاریی و

دەستکورتیی و نەخۆشیی و کوێرەوەرییدا رادەگرێت، هەروەها خۆگرو جێگیرانە لە مەیدانی جەنگو جیهاددا خۆدەگرێت (ئەمەش بواری بانگەوازو جیهاد).. ئا ئەوانە لە دینداریێتیاندا، ڕاستگۆو سەرڕاستن، بەڕاستی ئەوانەن تەقواکاران.

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥﴾ البقرة: ٢٨٥ .

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باوەڕی بەو پەیامە هێناوە، کە خوای گەورە بۆی ناردۆتەخوارەوە، هەروەها موسوڵمانانیش... هەموو باوەڕیان بە خوای گەورەو بە فریشتەکانی و بە پەیامەکانی و بە نێرراوەکانی ((عليهم السلام)) هێناوەو دەڵێن: ئێمە باوەڕمان بە هەموویان هێناوە (نەک وەکو جولەکەو دیانان کە باوەڕ بە هەندێکیان ناهێنن) موسوڵمانان بەملکەچییەوە دەڵێن: گوێبستین، گوێڕایەڵین، ملکەچی هەموو فەرمانێکی خوای گەورەین... دەڵێن خوایە باوەڕمان بە هەموو فەرمانەکانت هێناوەو داوای لێخۆشبوونت لێدەکەین، خوایە چارەنوسمان هەر لای تۆیە.

-﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَـٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَـٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَـٰلَۢا بَعِيدًا ١٣٦﴾ النساء: ١٣٦ .

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتانهێناوە! باوەڕبهێنن (یەقینتان هەبێت، باوەڕتان پتەوبێت، سەرڕاستانە بە ئیمانداریيەوە پابەندبن) باوەڕ بەپێغەمبەرەکەی خوا (صلى الله عليه وسلم) بهێنن و سیيرەو سوننەتی بگرنەبەر، باوەڕ بەو کتێبە بهێنن کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی (صلى الله

علیە وسلم) ناردۆتە خوارەوە (و بیکەن بە بەرنامەو ڕێبازی تاکو کۆتان) باوەڕیش بەو کتێبە ئاسمانیانە بهێنن، کە خوای گەورە پێش قورئان ناردوونیەتەخوارەوەو بشزانن کە هەر کەسێک باوەڕ بە خوای گەورەو بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە نێرراوەکانی و بە ڕۆژی دوایی نەهێنێت، ئەوە بە تەئکید گومڕابووەو، هەر زۆر لە حەق دوورکەوتۆتەوە.

- **لەفەرموودەدا:**

- ئەبوهورەیرە -خوا لێی رازی بێت- دەگێڕێتەوە: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَارِزًا يَوْمًا لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ ، فَقَالَ : مَا الْإِيمَانُ ؟ قَالَ: الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَبِلِقَائِهِ وَرُسُلِهِ وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ، قَالَ: مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، قَالَ: مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ... ( تا کۆتایی فەرموودەکە..).[1]

واتە: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەناوخەڵکییدا بوو،

(١) سەحیحی بوخاری چاپی الشعب بەرگی یەکەم/ل: ١٩. راستە. هەموو فەرموودەکە ئەمەیە کە ژمارە(٤٩)یەو لە: (كتاب الإيمان)دایە؛ (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَارِزًا يَوْمًا لِلنَّاسِ ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ ، فَقَالَ : مَا الْإِيمَانُ ؟ قَالَ : " الْإِيمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَبِلِقَائِهِ وَرُسُلِهِ وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ ، قَالَ : مَا الْإِسْلَامُ ؟ قَالَ : الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ ، قَالَ : مَا الْإِحْسَانُ ؟ قَالَ : أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ ، قَالَ : مَتَى السَّاعَةُ ؟ قَالَ : مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ ، وَسَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا إِذَا وَلَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّهَا ، وَإِذَا تَطَاوَلَ رُعَاةُ الْإِبِلِ الْبُهْمُ فِي الْبُنْيَانِ فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ ، ثُمَّ تَلَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ سورة لقمان آية ٣٤ ، ثُمَّ أَدْبَرَ ، فَقَالَ : رُدُّوهُ ، فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا ، فَقَالَ : هَذَا جِبْرِيلُ ، جَاءَ يُعَلِّمُ النَّاسَ دِينَهُمْ " ، قَالَ أَبُو عَبْد اللَّهِ : جَعَلَ ذَلِك كُلَّهُ مِنَ الْإِيمَانِ).

جیبریل (جوبرەئیل) هاتە خزمەتی و پرسیاری لێکرد: باوەڕهێنان چییە؟

فەرمووی: باوەڕ ئەوەیە: کە باوەڕ بە خوای گەورەو فریشتەکانی و دیداریی و نێرراوانی بهێنیت، باوەڕت بە زیندووبوونەوە هەبێت.

جیبریل فەرمووی: ئەدی ئیسلام چییە؟

فەرمووی ئیسلام ئەوەیە: کە وا خوای گەورە بپەرستیت، کە بە هیچ کلۆجێک هیچ جۆرە هاوبەشێکی بۆ دانەنێیت و نوێژەکان بکەیت و زەکاتە فەرزکراوەکە بدەیت و مانگی رەمەزان بەڕۆژووبیت.

پاشان پرسی: ئەدی ئیحسان چییە؟

فەرمووی: ئەوەیە: کە وا خوای گەورە بپەرستیت وەکو ئەوەی دەیبینیت و بۆی دەڕوانیت، خۆ کە تۆ ئەو نەبینیت، ئەو تۆ دەبینێت.

- ئیبنوعەبباس -خوالێبان رازی بێت- باسی وەفدەکەی (عبدالقیس) دەگێڕێتەوە، کە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و پرسیاریان دەربارەی خواردن و خواردنەوە لێکرد: (أَتَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ باللَّه وَحْدَهُ قَالُوا : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ، قَالَ : شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ ، وَصِيَامُ رَمَضَانَ ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ المَغْنَمِ الخُمُسَ) تا کۆتایی فەرموودەکە.[1]

(١) سەحیحی بوخاری ب١/ل:٢٠. راستە. هەموو ریوایەتەکەش ئاوایە: (إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ القَيْسِ لَمَّا أَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : مَنِ القَوْمُ ؟ - أَوْ مَنِ الوَفْدُ ؟ - قَالُوا : رَبِيعَةُ . قَالَ : مَرْحَبًا بالقَوْم ، أَوْ بالوَفْدِ ، غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ نَدَامَى ، فَقَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لاَ نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيكَ إِلَّا في الشَّهْرِ الحَرَام ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الحَيُّ مِنْ كُفَّار مُضَرَ ، فَمُرْنَا بِأَمْر فَصْل ، نُخْبِرْ به مَنْ وَرَاءَنَا ، وَنَدْخُلْ به الجَنَّةَ ، وَسَأَلُوهُ عَنِ الأَشْرِبَةِ : فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَع ، وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَع ، أَمَرَهُمْ : بالإِيمَان باللَّه وَحْدَهُ ، قَالَ : أَتَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ باللَّه وَحْدَهُ قَالُوا : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ، قَالَ : شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ ، وَصِيَامُ رَمَضَانَ ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ المَغْنَمِ الخُمُسَ وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ : عَنِ
←

واتە: دەزانن باوەڕهێنان بە تاکێتی خوای گەورە چییە؟

عەرزیان کرد: خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چاکتر دەزانن، فەرمووی: شاهێدیدانە لەسەر ئەوەی ،کە هیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتی بێتو جگە لە خوای گەورەو شاهێدیدان لەسەر ئەوەی، کە محمد (صلى الله عليه وسلم) نێرراوی خوای گەورەیە ، هەروەها نوێژکردن و زەکات دان و ڕۆژووگرتنی رەمەزانە... هەروەها دەبێت پێنجیەکی دەستکەوتی کاسبیتان بدەنە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)...

ئەمانە بنەماو ڕێسای روانگەی عەقائیدی موسوڵمانن... باوەڕ هێنان (الایمان) لە زمانەوانییدا بریتیە لە: بە ڕاستگۆزانینی بەرامبەرەکەو بەڕاست زانینی ئەوەی وتوییێتی.

لە ڕووی زاراوەی شەرعیشەوە بریتیە لە :بە ڕاست و دروست و حەقزانینی باوەڕهێنان بە خوای گەورەو فریشتەکانی و کتێبەکانی و نێرراوانی و رۆژی دوایی و خێرو شەڕی قەزاو قەدەر..

بە مانایەکیتر بریتییە لە: بەڕاست وڕ زانینی ئەو ئەحکامە دینییانەی، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە خوای پەروەردگارییەوە هێناویێتی..

(الاسلام)یش بریتیە لە: ئەنجامدانی فەرزەکانی دین، واتە: نیشاندانی زاهیریی دینداریێتییەکە[1].

---

الحَنْتَمِ وَالدُّبَّاءِ وَالنَّقِيرِ وَالْمُزَفَّتِ ، وَرُبَّمَا قَالَ : الْمُقَيَّرِ وَقَالَ : احْفَظُوهُنَّ وَأَخْبِرُوا بِهِنَّ مَنْ وَرَاءَكُمْ). بوخاری (٥٣)، موسلیم (١٧).

(١) فتح الباري ب١/ل:٥١ هەروەها: يحيى بن شرف الدين النووي: شرح الأربعين النووية/ چاپی الشمرلي . مصر چاپی حەوتەم ل: ١٢و١٣.

**بڕگەی چوارەم:**
**سەرەکیترین سیفەتی بنەما عەقائیدییەکان لە ئیسلامدا:**

بنەمـا عەقائیـدییەکانی ئیسـلام لە بنەمـا دیـدو تێـڕوانینە فەلسـەفییەکان جودایە، کە هەردوولایان دەبنە زەمینەی فیکریی سیستمەکانی حوکمڕانیان، هەر یەکەیـان سـیفاتی تـایبەتی خۆیانیـان هەیە، بـۆیە ناشـێت هیچیـان بەوی تریـان بچوێنرێت.

بۆ نموونە: بنەما عەقائیـدییەکانی ئیسـلام، (وەحیـی)ن و لە خـوای گەورەوە هاتوون، حەقیقەتن، پڕاوپڕ پێناسەو وەسفی ڕێساکانی گەردوون و ژیـان دەکەن، گشتگیرو پارسەنگن، نەگۆڕن، واقیعیی و کاریگەریی ئیجابین...

ئەگەر لەبەر دوورودرێژبوونەوەی باسەکەمان نەبوایە ،تەفسیلمان دەدایە ئەم سیفەتانەو سـیفەتی تریشـی... بەڵام کە ئەویـان نـاتوانین، هەر دەبـێ یەک دوو سیفەتی سەرەکییان باس بکەین:

**١-ئەم بنەما عەقائیدییانە (وەحیی)ن و لە خوای گەورەوە هاتوون:**

ئەم بنەما عەقائیدیانە کامڵن بواری بۆ زیادکردن و لێگۆڕینیـان تێـدا نیـیە ،چـونکە حەقـن، پڕاوپـڕ وەسـفی واقـیعە مەخلووقەکـان دەکەن، وەحـی خـوای گەورەن، بۆ ئەوە نەهاتوون مرۆڤ بۆیـان زیادبکـات و لێیـان کەمبکـاتەوە، یـان بیانگۆڕێت..

بۆ ئەوە هاتوون مرۆڤ خۆیـان لەگەڵـدا بسـازێنێت، دیـدو تێڕوانینـی خـۆی لەبەر ڕۆشناییاندا ڕاستبکاتەوەو بیانکاتە دیدو ڕێی ژیـانی، تـا لە ژیـانی تـاک وکۆیاندا بیچەسپێنن، موسوڵمان بێخەم و ترس و دڵەڕاوکێ ،دەتوانێت شـاهێدیی بـدات کە ئەم بنەمـاو ڕێسـایانە هەر ئەوەن کە لە خـوای گەورەوە بە وەحـی بـۆ

پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) هاتوون، نە نوقسان بوون و نە گۆڕاون و نە بۆیان زیادکراوە.. وەکو پەیامەکانی پێش ئیسلام دەستکاریی نەکراون و لێیان نەگۆڕاوە، وەکو ئەوەی ئەوان کە لە ئەسڵ و لقیدا گۆڕاوە.

ئەوەی ئەوان سروشتی پەیامێتی وەحی خوایی پێوە نەماوە، هەمووی بۆتە دیدوتێڕوانینی بەشەریی.. ئەمە خاڵێکی جەوهەرییە... ئەمە ئەو حەقیقەتە سەلمێنراوەیە، کە دڵ لێی ئاو دەخواتەوە، هێمن و دڵنیادەبێت، کە بنەما عەقائیدییەکان لە ئیسلامدا ڕاستە وەحیی خوایین و وەکو خۆیان ماون.

ئەم دڵنیابوونە لێی، متمانە درووستدەکات، کە دیدی عەقائیدی ئیسلامیی ڕاست و دروست و ڕەوایەو لەگەڵ ڕێساکانی گەردوون و ژیاندا پڕاوپڕن.. ئەم بنەمایانە دوورن لە لاسەنگیی و لێڵیی ونوقسانیی ، کە عادەتەن بە دیدو ڕاو ڕێی مرۆڤەوە دەبینرێن.

هەر کەسێک وردەکارانە بڕوانێتە دیدە فەلسەفیەکانی مرۆڤ و بە بنەما عەقائیدییەکان ئیسلامییان بەراوردبکات، زۆر زوو هەست بەم حەقیقەتە دەکات، دەبینێت دیدە فەلسەفیەکان لێڵ و لاسەنگن، جۆراوجۆرو پێچەوانەن، هەر ماوەیەک و دیدێکی نوێی فەلسەفی دێتە جێی دیدە فەلسەفیە کۆنەکانی پێش خۆی، زۆر نابات (٥٠ - ١٠٠ ساڵ) ئەمیش کۆن دەبێت و چەوتیی و نوقسانیی و هەڵەکانی دەردەکەون... بەڵام بنەما عەقائیدییەکان ڕوون و ڕۆشنن، پارسەنگن، ئاسان و سادەن و،لەگەڵ سروشتی هەموو جۆرە مرۆڤێکی هەموو کات و شوێنێکدا گونجاون، نەگۆڕن، گشتگیرو کامڵن.

بۆیە بوونەتە زەمینەیەکی جێگیرو پتەوی داڕشتنی کەسایەتی تاک وکۆی کۆمەڵگەو روانگەی سیستمەکانی ڕێکخستنی ژیان.

**٢ -ئەم بنەما عەقائیدییانە گشتگیرو پارسەنگن:**

گشتگیرن ،چونكە هەر هەموو رەهەندو لایەنێكی كیانی مرۆڤی دەگرنەوە، هیچ لایەنێكی فەرامۆش ناكەن، (لە دیدو تێروانین و پێناسەی گەردوون و ژیان و مرۆڤەوە بۆ خواپەرستیی و رەفتارو رەوشت و قیەمی كۆمەڵایەتیی، بۆ دەستوورو یاساو رێسای حوكم و ئاراستەكردنی كۆمەڵگەو دەوڵەت)... پارسەنگیشن، هیچ لایەنێكی مرۆڤ و ژیانی تاك وكۆ ئیهمال ناكەن و، بایەخ بەیەكێكیان لەسەر حسابی ئەوی تریان نادەن (ناڵێن دنیا بەردەن و قیامەت بگرن، ناڵێن هاوسەرگیریی مەكەن و بۆ خواپەرستیی لێبڕین... وەهەروەها).

ئەم بنەما عەقائیدییانە دەستپێك و كۆتای مەخلوقات و قۆناغەكانی وجودیان بۆ مرۆڤ ڕوون دەكاتەوە، تا بزانێت كە ئەویش یەكێكە لە موفرەداتەكانی گەردوون و ژیان و دەبێ وا رێكات كە لەگەڵ رێساكانی گەردووندا بسازێت[(١)].

چونكە مرۆڤ سنوردارە، كات و شوێن و زانست و ئەزموونی دیاریكراوی هەیە، نوقسان دەبێت، دەكەوێتە ژێرتینی لاوازیی و گوڕی هەواوهەوەسی خۆی، بۆیە كاتێك بنەماو رێسای فەلسەفی دەربارەی وجود دادەڕێژێت بیرۆكەكەی ئەو نوقسانیی و لاوازیی ولاسەنگییەی هەواوهەوەسەكەی پێوە دەبێت..

بە واتایەكی تر: دیدو تێڕوانینی فەلسەفی سیماو سیفاتی كەم و كورتێتیی بەشەریی لە خۆدا هەڵگرتووە.. بۆیە ئەگەر دیدو تێڕوانین و پێناسەی فەیلەسووفانی سەردەمێك یەكبن (كە هەرگیز یەكنابن) لەوانەیە شیاوی ئەو سەردەمە كەمەو ئەو شوێنە بن، كە لێی ژیاون، بۆیە بۆ كات و شوێن و حاڵی نەوەیەكی تری مرۆڤایەتیی گونجاو نامێنن.

(١) خصائص التصور الإسلامي ل: ٥١ و دواتری.

ئەمە جگە لەوەی بە هەموویان پەی بە هەموو رەهەندو لایەن و ماهییەت و چۆینەتی هەموو شتێک نابەن.

دیدە فەلسەفیەكان ئاڵقەی پساون، پێكەوە نالكێن ،چونكە نوقسانیەكانی كات و شوێنی خۆیان و رادەو بڕی زانین و ئەزموونی خۆیان هەڵگرتوە، یەكتریان پێ تەواوناكرێت ،چونكە بواری هەستی هەموویان كەمە، سنوری پەیپێردنیان دیاریكراوە، رادەی درككردنیان زۆر كەمە، لەچاو گەرودوون و ژیان و مرۆڤدا.،چونكە بیركردنەوەی مرۆڤ (جوزئیە)، ناتوانێت گشتگیربێت، ناتوانێت لەیەككاتدا پەی بەدەستپێكی ژیان و ماهییەت و كۆتایی ژیان ببات.

(هەر وەكو كە كەسێک لە دوورەوە نابینێت و گوێی لە قسە نییە و بۆنی عەترەكەی ناكات!) بۆیە هەر چی دەریدەبڕێت نوقسان دەردەچێت، دەكەوێتە ئاڵۆزیی بیرو پشێویی پێناسەو گەڕەلاوژێی راو رێوە.. ئەمە لاوازییەكەیەتی ئەو ئەنجامە دروستدەكات.. ئەدی ئەگەر حەزو هەواوهەوەسە لاسەنگەكەشی تێكەڵكرد چی دەردەچێت؟!.

بەڵام كاتێک خوای گەورە دیدو تیڕوانین و پێناسەی گەردوون و ژیان و مرۆڤ (بە تەفسیلاتی موفرەداتەكانیانەوە) دیاریدەكات و بۆ مرۆڤایەتیی دەكاتە بنەمای عەقائیدیی، تا سیستەمەكانی حوكم و ئاڕاستەوانی تاكوكۆی كۆمەڵگەو دەوڵەتی لەسەر بنیات بنرێت، بە كامڵیی و گشتگیریی و پارسەنگیی دێنە بەردەست.. بێ هەڵەو پەڵەو نوقسانیەكانی دیدو زەینی بەشەریی... بۆیە ئیسلام كە دینی پەسەندی خوای گەورەیە، تاكە بەرنامەو رێبازی ژیانی مرۆڤایەتیی ە[1].

(١) سەرچاوەی پێشوو ل: ٤٩ و دواتری (بە كورتكراوەیی).

## بڕگەی پێنجەم: گرنگی دیاریکردنی بنەما عەقائیدییەکان و سیفەتیان:

دیـاریکردنی ئەم بنەمایـانەو زانینـی سـیفەتەکانیان زەروورپـن ،چـونکە موسوڵمان، دەبێت پێناسەیەکی گشتگیریی وجـودی هەبێـت، تـا بزانێـت چـــۆن ڕاست و دروست و رەوا رەفتاردەکات.

دەبێـــت لێکـــدانەوە (تەفســـیر)ێکـــی گەردوون و ژیـــان و مرۆڤـــی لەبەردەستدابێت، تا پەی بە حەقـیقەتە گەورەکـانی وجـود ببـات ،چـونکە دەبـێ بزانێت چۆن رەفتاریان لەگەڵدا دەکـات، تـا بزانێـت سروشـتی پەیوەنـدی نێـوان مرۆڤ و گەردوون چیـیەو چـۆنەو پەیوەنـدیی گەردوون بە خـوای کردگـاریەوە چۆنە، تا بزانێت دەبێت پەیوەندی خۆی بە خوای گەورەوە چۆن بێت؟

ئـاوا لە حەقیقەتـی خـوایەتیی و عەبـدێتیی تێـدەگات... تێگەیشـتنی ئەم حەقیقەتە عەقائیدییانە ،زەروورییە بۆ تێگەیشتن لە رێسا گەردوونیەکان، تا لەم روانگەوە بـڕوانێتە جـێ و رێ و رۆڵـی مـرۆڤ لەم گەردوونە بەرفـراوان و لەم ژیانە گشتگیرە کورتە، تـا بزانێـت مەبەسـت لە وجـودی مـرۆڤ لەسـەر زەمـین چییەو، رۆڵ و ئەرک و سـنووری لەم گەردوون و ژیـانەدا دەبێـت چـۆن دیـاری بکات، تا بزانێت تایبەتمەندێتی مرۆڤ چییەو سنوری پەیوەندییەکانی بە خـوای گەورەوە چییەو چۆنە[١].

لە ڕاسـتییدا هـیچ رێسـاو سیسـتمێک لە ئیسـلامدا دەربـارەی ژیـان چەقبەستوو نییە.. دەقە شەرعیەکان کە چۆنیەتی ژیانی تاک وکۆی مرۆڤایەتیی دیاری دەکەن، لەڕاستییدا رۆحێکن کە سەلماندن وچەسپاندنی (ئیمان و یەقین) لە

(١) سەید قوتب: تفسیر سورة الشوری چاپی دارالشروق. بیروت و قاهیرە ١٣٩٣ک/ ١٩٧٣ز ل: ٨٤

دڵدا دەڕوێنن، کە لە هەست و هۆشدا دەبێتە داینەمۆی کاریگەریی ڕاست و ڕەوایی و پارسەنگێتی، لەسەر رەفتارو رەوشت درووستدەکات.

توێژینەوەو باسکردنی رێساو سیستمەکانی ئیدارەی دەوڵەت و ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگە لە ئیسلامدا ناشێت لەم بنەماعەقائیدییانە جوێبکرێنەوە .. خوێندنی سیستمی حوکمی ئیسلامیی بێ پەیوەستکردنی وجودەکەی خۆی بە دیدو تێڕوانین و پێناسە عەقائیدییەکانەوە نوقسان و هەڵە دەردەکەون...چونکە لە ئیسلامدا هیچ شتێک نییە لەسەر باوەڕ بنیات نەنرابێت..

ئەم بنەماو رێسا عەقائیدییانە، پێشئەوەی زەمینەی فیکریی و سیاسیی حوکمڕانیی بن، مەنزڵ و هەوارگەی ئیمانین... لەمەشەوە پارسەنگیی ژیریی و هەست وهۆش و ئینفیعال درووست دەبێت.. ئیسلام ئاوا کاریگەریی لەسەر داڕشتن و ئاڕاستەکردنی موسوڵمان دەبێت... حەقیقەتە عەقائیدییەکانی لە هزرو ژیرییدا دەچەسپێنێت و دڵ و دەڕوونی ئاڕاستەی خواناسیی دەکات، ئینجا بە خواپەرستیی و رەفتاری خواویستیی تاک وکۆ پەروەردەدەکات، ئینجا سیستمی حوکمڕانیان دەخاتەبەردەست..

یەکسەر مرۆڤ ئاڕاستەی سیستمێکی دیاریکراوی حوکمڕانی ناکات ،چونکە هەوڵدان بۆ سەلماندن و چەسپاندنی دەسەڵات ـبێ پەروەردەبوون ـ کارەساتی لێدەکەوێتەوە... بۆیە دەقەکان شێوازو چۆنیەتی ئیدارەو ئاڕاستە ناخەنە بەردەست ،چونکە ئەمە وازلێهێنراوە بۆ بارودۆخەکان و ئەقڵ پێشکانی مرۆڤ خۆی کە ئیجتیهادیان تێدادەکات و سیستمی حوکم لەبەر رۆشنایی ئەو دەقانەدا دەمەزرێنێت، کە ڕاستەوخۆ بنەمای حوکم دیاریدەکەن.

## باسی دووەم

## دەربارەی تەوحید

تەوحید (التوحید): بەیەکدانانە. واتە: وا دادەنێیت، کە ئەو شتە یەکە.

لە زاراوەدا: نکوڵیکردنە لە هەبوونی هاوبەش لە سیفەتێکی خوایەتی خوای گەورەو، نەفیکردنی هەبوونی هەر رادەو بڕو چۆنیەتیەکی هاوبەشبوونە، لە زات یان لە سیفەتی خوای گەورەدا ،چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: (لـيْسَ كَمِـثْلِهِ شَيْءٌ )الشورى/١١ .

واتە: لە هیچ شتێکدا نموونەی ئەو نییە[1].

**بڕگەی یەکەم: تەوحید بناغەی سەرەکی یەکەمینی ئیسلامە:**

ئیسلام لە سەر دووبنەمای سەرەکی دامەزراوە:

١- جگە لە خوای گەورە هیچ نەپەرستین.

٢ - بەو شێوەیە خوا بپەرستین کە خۆی دیاریکردووە، نەک بە بیدعەو داهێنانی خۆی.

خـوای گەورە ئەم دوو بنەمـا سـەرەکییەی تەوحیـدی لە یەک ئایەتـدا کۆکردۆتەوە، کە دەفەرمـووێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾ الكهف: ١١٠ .

---

(١) الرسائل السلفية في إحياء سنة خير البرية _ محمد علي الشوكاني/ إدارة الطباعة المنيرية بالقاهرة چاپی ١٣٤٨ک/ ١٩٣٠ز الرسالة الثالثة ل: ٢٤.

واتە: ئەو کەسەی کە ئومێدی بە دیداری خوای گەورە هەیە، کە ڕووسوورو سەرفرازانە لە لێپرسینەوەی دەربچێت، با کردەوەی چاک بکات و هیچ یەکێک لە پەرستنی خوای پەروەرگارییدا نەکاتە هاوبەشی .. (عمل صالح: بێگومان ئەوەیە کە قورئان و سوننەت دیارییانکردووە).

هەروەها دەفەرمووێ ﴿بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾﴾ البقرة: ١١٢ .

لە وەڵامی جولەکەو دیانەکاندا کە دەیانوت: غەیری جولەکەو دیان ناچنە بەهەشتەوە (لە ئایەتی پێشتردا هاتووە)، لێرەدا قسەکەیان ڕەتدەکاتەوە، ئەو حەقیقەتە ڕوون دەکاتەوە: واتە: نەخێر وانییە، هەر کەسێک بە دینی خوای گەورەوە پابەندبوویێت و فەرمانەکانی خوای گەورەی سەرڕاستانە جێبەجێکردبێت و، خوای بە تاک وپاک ناسیبێت پاداشتی لای خوای پەروەردەگاری خۆی مسۆگەرە، نە خەفەت لە رابوردووی دەخوات و نە خەمی داهاتووی دەبێت.

ئەم دوو بنەماسەرەکیەش خودی شایەتمانەکەن، کە روکنی یەکەمی ئیمان و مایەی موسوڵمانبوونە، کە: (اشهد ان لااله الاالله واشهد ان محمدا رسول الله)یە...

واتە: بڕیاردەدەم و شاهێدم :کە تەنها خوای گەورە خوایەو هیچ خوایەکی تر نییە، شاهێدیش دەدەم: کە محمد (صلى الله عليه وسلم) نێرراوی خوای گەورەیە.

-دێری یەکەم (لااله الاالله) جەخت کردنە لەوەی، کە غەیری ئەو، بەخوادانانێین و غەیری ئەو ناپەرستین.

-دێری دووەم (محمد رسول الله) جەختکردنەوەمانە لەسەر باوەڕهێنانمان

بەوەی، کە محمد (صلی الله علیه وسلم) ڕاستی فەرمووەو نێرراوی خوای گەورەیە، بۆیە شاهێدیی دەدەین: کە هەرچی فەرموویەتی ڕاست و دروست و رەوایەو، ئێمەش هەموو گوێڕایەڵیی و ملکەچییەکی بۆ دەردەبڕین و شوێنی دەکەوین.

خوای گەورەش لەم ڕووەوە دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ۝٥٩﴾ التوبة: ٥٩ .

واتە: ئەگەر بەوە رازیبوونایە کە خوای گەورە بە نسیبی کردبوون کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەسەریاندادابەشیکردبوو (دەستکەوتەکانی جەنگ) و بیانوتایە: ئێمە خوامان بەسە، خوای گەورە لە فەزڵ و چاکەی خۆی بێبەشمان ناکات و پێماندەبەخشێت و ئێمە قەناعەتمان بەوەیە: کە خوای گەورە دەمانداتێ، ئەمە چاکتربوو بۆیان (ئەم دیدو هەڵوێستی رازیبوونە بە بەشی خوای گەورە چاکترە وەک لە چاوبڕینە ماڵ و سامانی دنیایی)[1].

کەوابوو: دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی ئیسلامیی لە تەوحیددا لەسەر ئەوە دامەزراوە کە خوایەتی هەیەو عەبدێتی هەیە... خوایەتیەک کە خوای گەورەو باڵادەست هەیەتی و بەس، عەبدێیتیەکیش کە هەموو وجودێکی غەیری خوای گەورە دەگرێتەوە...

هەموو مەخلووقات عەبدێتیی بۆ خوای گەورە ئەنجامدەدەن: بە ناسین و

(١) ابن تیمیة: منهاج السنة النبویة في نقض کلام الشیعة القدریة- توێژینەوەی مامۆستامان دکتۆر محمد رشاد سالم- مکتبە دارالحروبة/ قاهیرە چاپی ١٣٨٢ک. ١٩٦٢ز ب١ ل: ٣٣٦.
_ ابن تیمیة: العبودیة بە پێشەکی مامۆستا عبدالرحمن ألباني چاپی المکتب الإسلامي للطباعة والنشر- بیروت و دمشق چاپی دووەم ١٣٨٩ک بیروت ل: ٥١ و دواتری.

پەرستن و جێبەجێكردنــی فەرمانەكـانی... لەم روانــگەوەیە كە خـوای گـــەورە ،تاك و پاك و بێوێنەیەو هەر هەمـوو سـیفەتەكانی خـوایەتی تێـدایەو هەمـوو سیفەتێكیشی بێسنوور و تەواوەو، هیچ شتێكیتر بە هیچ كلۆجێك و بە هیچ بڕو رادەو چۆنیەتیەك، لە هیچ یەكێك لە سیفەتەكانی خوای تاك وپاكدا هـاوبەش نییەو هیچی لەو ناچێت ،چونكە غەیـری ئەو مەخلـووقی ئەوەو ئەویـش خـالقی هەموانە.

ئاوا دەسەلمێت و دەچەسپێت :كە دوو (وجـود) هەیە: وجـودی خـوای تـاك وپاك و وجودی غەیری ئەو، كە هەمـوویـان عەبـدێتیی بـۆ خـوای تـاك وپـاك دەردەبڕن و ملكەچین.

پەیوەندیی نێوان ئەم دوو وجودە، پەیوەنـدیی (خـالق) و (مەخلـووق)ێتیــیە.. پەیوەنـدیی (خـوا) و (عەبـدێتی)یە... ئەمە ئەو رێسـا سـەرەتاییە سـەرەكییەكە هەموو بنەما عەقائیدییەكانی تری لەسەر داددەمەزرێت[1].

**بڕگەی دووەم: ئیسلام و تەوحیدی پاك و پوخت:**

ئیســلام دینــی هەمــوو پێغەمــبەرانە، دیــدو تێــڕوانینە عەقائیــدییەكانی هەموویان ،هەر لە خوای گەورەوە بۆ یەك یەكی ئەو پێشەوا سەروەرانە (علیهم السلام) هاتووە، هەموویان تەركیزیان لەسەر (عەقیدە)و (عیبادەت)ی خالیســانە بۆ خوای تاك وپاك دەكـردەوەو لە ئەحكـامی (شــەریعەت)دا جیـاواز دەبـوون ،چـونكە ئەحكـام بە گـوێرەی پێداویسـتی مـرۆڤ لە كـات و شـوێنی جیـاوازدا دەگۆڕێت...

---

(١) خصائص التصور الإسلامي ل: ٢١٥_٢١٦.

_ الامام الدكتور عبدالحليم محمـود: الاسلام والايمان. سلسلة (في إحياء المفاهيم الإسلامية) دار الكتب الحديثة- الطبعة الثانية ١٩٦٩ز ل: ١٨٥ و دواتری.

مەبەست لە هەمـوو دینەکـان :(ئیسـلام)بـوو، کە بـریتییە لە: تەسـلیمبوونی عەبـدانە بە خـوای تـاک وپـاک، بە شـوێنکەوتنی دیـنەکەی، بە جێبەجێکردنـی ئەحکامەکـانی، بەوەی وەحـی خـوایی و سـیرەو سـوننەتی پێغەمـبەران، تـاکە بەرنامەی ژیانی تاک وکۆی مرۆڤایەتیی بێت...

تەوحید تەوەری بانگەوازی هەموو نێرراوانی خوابوو ... بەڵام ئەو لـێ لادان و گۆڕانکارییەی بەسەر دینەکانی پێشیندا هـات، پـاکیی و پـوختیی تەوحیـدی نەهێشت، نەزانین و هەواوهەوەس لە لایەک و لەسـنووردەرچوونی تاغوتـان بـۆ گـۆڕینی دیــن لە لایەکــی تــرەوە وایکــرد کە لە هەمــوو ســەرزەمیندا دیــدو تێروانینێکی عەقائیدیی ڕاست و ڕۆشن نەمێنێت، تا ئەو کاتەی سـەیدنا محمــد (صـلی اللـه علیـه وسـلم) بەم دیـنە خـواییەوە تەشریفـی هێنـاو تەوحیـدەکەی ڕاستکردەوە.

خوای گەورە خۆی بەڵێنی پاراستنی قورئـان و پەیـامی پـاکی پێغەمـبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دا... بۆیە دەتوانین بەو پەڕی یەقیـنەوە بڵێـین: کە دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی ئیسلامیی، تاکە دیدو تێڕوانینێکی تەوحیـدییە کە بە کامڵیی و سەلامەتیی وجێگیریی ماوە..

تەوحید سیفەتێکی هەرە مەزن و جیاوازیی دیدو تێڕوانینی ئیسلامییە، لە دیـدو تێڕوانینــی دینەکـانی تـرو دیـدە فەلسـەفیەکان... نە ئەو وەکـو ئەمـانەو نەئەمانیش وەکو هیچ روکنێکی ئەون[1].

---

(١) خصائص التصور الإسلامي ل: ٢١٤ و دواتری. بۆ تەفسیلی زیاتر بڕوانە:

_ عباس محمود العقاد: الل. چاپی دارالمعارف/ مصر. چاپی پێنجەم ل:٧ و دواتری.

_ سليمان مظهر: قصة العقائد بين السماء والأرض. دار النهضة العربية بمصر ل: ٢٣٣ و دواتری.

_ سەید سـابق: العقائـد الاسـلامية. لە چاپکراوەکـانی کۆنفرانسـی ئیسـلامی. چـاپی یەکەم ١٣٨٣ک. ١٩٦٤ز ل: ٨ و دواتری.

*گرنگێتی ئەوە کە ئیسلام تاکە دیدو تێڕوانینی ڕۆشن و ڕاستی تەوحیدە:

کە تەوحید حەقیقەتەو بنەمای سەرەکی دیدو تێڕوانینی ئیسلامییە، سەرەتا عەقائیدییەکەی ئیسلامە، ئەوە گرنگێتییەکی ئێجگار کاریگەری بەرچاوی هەیە ،چونکە کاتێک مرۆڤ پێناسەی خوای گەورەی لا ڕۆشن دەبێت و دەزانێت پەیوەندیی (خوایەتی) ئەو بەم گەردوون و ژیان و مرۆڤەوە چییەو چۆنە؟

ئەم باوەڕو هەست و نرخ و بەهایە دەداتە (خوایەتیی)یەکە، ئەرکی (عەبدێتی)یەکەی مرۆڤ دیاریدەکات، ئەو کاتە مرۆڤ دەزانێت کە وەڵامدانەەی فەرمانی خوای خاوەنی و دینداریێتی بۆ کردنی دەبێ چۆن بێت.

مرۆڤ لە دیدوتێڕوانینی عەقائیدیی ئیسلامییەوە وا ڕەفتار لەگەڵ خوای گەورەدا دەکات کە خوای کردگاری وجودە، خوایەکی خاوەن ویست و ئیرادەو بە تواناو زاناو بە دەسەڵات و دانایە. هەرچی بوێت دەیکات.

لە هەموو ڕەهەندو لایەن و سیفەتێکییەوە کامڵ و ئیجابییەو هەڵسوڕێنەری ئان و ساتی هەر هەموو مەخلووقاتە. سەرەتای دەستپێکی گەردوون و ژیان و مرۆڤ بە ویستی ئەو بووەو کۆتاییشیان، هەر بە ویستی ئەوەو هەر هەمووش دەگەڕێنەوە بەردەستی ئەو... ئەو بە ئاگایە، ئاگای لە هەموو بزاوت و سرەوتێکی مەخلووقاتە، ئاگای لە هەموو گۆڕان و،گۆڕینێکە، هیچ بزوات و سرەوتێک لەم وجودەدا بە بێ ویست و تواناو زانست و تەگبیری ئەو نابێت...

ئەو،هەموو شتێک، هەموو ڕووداوێک، هەموو بزاوت و سرەوتێک ئەندازەگیریی دەکات و فەرمانی بوونی دەدات و دەبێت.

جێگیربوونی ئەم حەقیقەتە عەقائیدییە لە کیانی موسوڵماندا لە ویژدان و هەست و دڵ و دەروونییدا، لە هزرو ژیرییدا وایلێدەکات ئاسان ڕێسا

**گەردوونییەكان ئیستیعاب بكات و بە (سنن الله: یاسای خوایی)یان بزانێت.**

**ئەم حەقیقەتە عەقائیدییە، كە لە ناخی موسوڵماندا جێگیردەبێت ئیتر هەموو شتێكی ئەم مرۆڤە لەسەر ئەو دادەمەزرێت و هەر ئەویشە كە دەبێتە سەرچاوەی ئاڕاستەی هزرو بیرو هەست و هۆش و ڕەفتارو ڕەوشت و بزاوت و هەڵوێستی ..**

**هەر ئەم عەقیدەیەیە كە دەبێتە پاڵنەری چالاكیی و مایەی پارسەنگیی ئەم مرۆڤە.. هەر ئەم عەقیدەیەشە بۆی دەبێتە پێوەرو هێزی پەیوەندیی بوون بەخوای گەورەوە، كە لە دینداریی سەرڕاست و تەقواكارییەكەیدا دەدرەوشێتەوە.. ئەمە خاڵی جەوهەریی جیاوازیی نێوان ئەم عەقیدە بزوێنەرە كاریگەرەی ئیسلام و ئەو دیدە (دینی)یە ساردو سڕەی ئەوانی ترە[١].**

---

[١] خصائص التصور الإسلامي ل: ١٧٥ و دواتری.

_ دكتۆر فاروق ئەحمەد حەسەن دەسسوقی دەڵێ:( بزانە چەند چەمكی فەلسەفییانە دەبینیت دەربارەی گەردوون و ژیان كە لەو ڕۆژەوەی نوسراون هەروا بە بچووكیی بە مەرەكەبە وشكبووەكەیەوە بە لاپەڕەی تیانووسەكانەوە ماونەتەوەو لە سەری ئەو كەسانە تێنەپەڕیوە كە خوێندكاری ئەو فەلسەفەیە بوون! كە هیچ كاریگەرییەكیان لە دنیای واقیعی خەڵكیی و لە ڕەفتارو ڕەوشتیاندا جێنەهێشتووە!

بۆیە دەبینیت هیچ پەیوەندییەكی دروست نەبووە لە نێوان ئەو فەیلەسووف و خوێندكارانەو كۆمەڵگەی ئەو فەیلەسووفانەدا.

زەقترین نموونەی ئەوە چەمكی خوایەتییەكەی زۆرینەی فەیلەسووفەكانی یۆنانە، كە هیچ كاریگەرییەكی لەسەر ژیان و ڕەفتارو ڕەوشتی كۆمەڵگەكەیان دروستنەكردو _هەر وەكو مەتەڵ_ لەناو خوێندكارانی فەلسەفەدا مایەوە! لە بەرامبەردا سەیری كاریگەریی حەقیقەتەكانی دیدی عەقائیدیی ئیسلام بكە دەربارەی خوایەتی خوای گەورە، كە كۆمەڵگەكە هەمووی باوەڕی پێهێناو ژیانی خۆیان لەسەر داڕشتەوە.

دەبینیت گەورەترین كاریگەریی لەسەر ژیان و ڕەفتارو ڕەوشتی تاكوكۆی دەوڵەت و كۆمەڵگەی یاوەران دروستكرد، بە شێوەیەك ژیانی ڕێكخستن كە كاریگەریی بەردەوامی لەسەر هەموو نەوەكانی دوای خۆیان بەجێهێشت. هەموویان ژیانیان لەسەر

←

لەبەر ئەمەیە کە قورئان بە قەدەر ئەوەندەی کە جەخت لە هەبـوونی خـوای گەورە دەکاتەوە، ئەوەندەش جەخت لە تەوحیدی خوای تاک وپاک دەکاتەوە..

لە ئیسلامدا پابەندبوون بە تەوحیدەوە -بە پاکی و پـوختیی و بەو شـێوەیەی کە قورئان پێناسەو شەرحی تەواویی کردووە_ لە هەموو شـێتکی تـری ئیسـلام گرنگترە، بۆیە ئیسلام پێی وایە: باوەڕبوون بە هەبوونی هاوبەشێکیت بـۆ خـوای گەورە، لە هەر سیفەتێکیدا بێت، بە هەر رادەو بڕێک بێت، بە هەر چۆنیەتییەک بێت، قابیلی قبووڵ نییە ،چونکە پێچەوانەی حەقـیقەتە عەقائیـدییەکان و ڕێسـا گەردوونییەکان و سیستمەکانی ژیانە...

فرەخـوایی، یـان شـیرکخوازیی هەڵەیە، چەوتە، گونـاحە، تـاوانە، رەفتـارێکی (قەبیح)ە... مایەی لێڵبوونی دیدو وێڵبوونی مرۆڤە، مایەی ئاڵۆزیی و پشـێوێی و ویژدان و دەڕوونە، هۆکاری لاسەنگیی رەفتارو رەوشتەز

هۆکـاری لەدەسـتچوونی فەرزەکـانی خـوای گەورەیە، کە لەسـەر مرۆڤـی فەرزکـــردوون، مـــایەی تێکەڵوپێکەڵبـــوونی زانســـتییەکانی مـــرۆڤ و ســـەرگەردانبوونێتی، مـــایەی تینەگەیشـــتنی مـــرۆڤە لە حەقیقەتـــی (خـــالق) و (مەخلووق)ێتیی و پەیوەندیی (خوایەتی خالق) و (عەبدێتی مەخلووق).

ئەمەش لە هەموو لایەکەوە دژی وەحیی و خواویستیی و بانگەوازی حەقـی پێغەمبەرانە (علیهم السلام)[1].

---

ئەو دیدو تێڕوانینە عەقائیدییانەی ئیسلام _بەدیدی ئەوان_ دارِشت!

_ مشكلة الحرية في الفكر السلامي الخالص ل: ١٤.

(١) عباس العقاد: الفلسفة القرآنية ل: ١١٩.

**بڕگەی سێیەم: تەوحید لە دەقەکانی قورئانی پیرۆزدا:**

هەر کەسێک بەخێراییش چاوێک بە قورئانی پیرۆزدا بخشێنێت، ئەوەی لا دەبێتە بەڵگەنەویست کە تەوحید سەرەکیترین و ڕۆشنترین حەقیقەتی عەقائیدییە، کە دەقەکانی قورئان باسی لێوە دەکەن و لە هەموو باسێک زیاتر جەختی لێدەکەنەوە.

باسی تەوحید لە قورئاندا بوارێکی فراوان و ڕووبەرێکی زۆری قورئانی گرتۆتەوە، بە ڕیزبەندیی بابەتەکان و سەرنجدانێکی ئامارگیریی لە ئایەتەکان توانیمان ئەو حەقیقەتە عەقائیدییە ئاوا بخەینە بەرچاوان کە لە چەندین خانەدا ریزیان دەکەین:

**خاڵی یەکەم: سەلماندنی یەکبوونێتی خوای گەورەو ڕەتکردنەوەی فرەخوایی و هاوبەش بۆدانانی:**

**١- خوای گەورەیە، کە بەش و دابەش نابێت:**

-﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ الإخلاص: ١ .

**واتە: بفەرموو: خوای گەورە یەکەو تاقانەیە.**

**٢-خوای گەورە یەکە:**

﴿وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٣﴾ البقرة: ١٦٣ .

**واتە: خواتان یەک خوایە، هیچ خوایەکی تر جگە لەو نییە، ئەویش میهرەبان و بە بەزەییە.**

-﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ١١٠﴾ الكهف: ١١٠ .

**واتە: بفەرموو: منیش مرۆڤێکم وەکو هەر یەکێک لە ئێوە، بەڵام مـن وەحـیم بۆ دێت و پێتان رادەگەیێنم: کە خواتان یەکە، جا ئەو کەسەی بە ئومێدی دیداری سـەرفرازانەی خـوای پەروەرگـاری خـۆیەتی، بـا کـردەوەی چـاک بکـات و لە پەرستندا هیچ یەکێک نەکات بە هاوبەشی پەروەردگاریی.**

-﴿قُلۡ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٨﴾ الأنبياء: ١٠٨ .

**واتە: بفەرموو: وەحیی بۆ من دێت، تا پێتان رابگەیێنم :کە خوای ئێـوە یەک خوایە.. دەی سا ئێوەش موسوڵمانن ،یان نا؟!**

**-ئایەتی تری وەکو ئەمان جەخت لەم سیفەتەی دەکاتەوە وەکو:**

﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡقَصَصُ ٱلۡحَقُّۚ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٦٢﴾ آل عمران: ٦٢

﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكٗا لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ فَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَلَهُۥٓ أَسۡلِمُواْۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ٣٤﴾ الحج: ٣٤

**٣-هیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتیی بێت جگە لە خوای گەورە:**

-﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡقَصَصُ ٱلۡحَقُّۚ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٦٢﴾ آل عمران: ٦٢ .

**واتە: باسەکانی ئەم قورئانە هەمووی هەواڵی حەقن پێت ڕا دەگەینرێت، هـیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتی بێـت، جـگە لە خـوای گەورە کە بە دەسـەڵات و دانایە.**

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ٨٧﴾ النساء: ٨٧ .

**واتە: خوای گەورە ئەوەیە کە هیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتی بێت جگە لەو، تەئکیدیشە کە هەر هەموتان لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکاتەوە، قیامەتیش ڕۆژێکە بە هیچ شێوەو چۆنیەتیی و بڕو ڕادەیەک گومان لە هاتنییدا نییە، ئیدیی کێ هەیە لە خوای گەورە ڕاستر هەواڵ بگەیێنێت؟!**

-﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ طه: ٨ .

**واتە: خوای گەورە خوایە، هیچ خوایەک نییە شایانی پەرستن بێت جگە لەو. هەموو ناوە پیرۆزەکان (کە سیفەتی کامڵێتی بێ سنوورن) هی ئەون.**

**-ئەم ئایەتانەش هەر جەخت لەم حەقیقەتە دەکەنەوە:**

-﴿ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾ ﴾ طه: ٩٨

-﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ القصص: ٧٠

- ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد: ١٩

**٤-خوا یەکەو خوای تری وەلدا نییە:**

-﴿ ۞ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ إِلَٰهَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٥١﴾ ﴾ النحل: ٥١ .

**واتە: خوای گەورە فەرمووی: دوو خوا مەگرنەبەر ،چونکە خوای گەورە یەکە، دەبێ ترس وخۆفی منتان لە دڵدابێت و بەس... لەغەیری من مەترسن.**

-﴿ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾ الإسراء: ٢٢ .

**واتە: خوایەکی تر وەل خوای گەورەدا دامەنێ، ئەگینا لۆمەکراوو بێکەس و بێ پشتیوان دەستەوئەژنۆ دەکەویتە کەنار.**

- ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾ الإسراء: ٣٩ .

واتە: ئەمە لەو ئامۆژگارییانەیە کە خوای پەروەردگارت بە وەحی بۆی ناردوویت: خوایەکی تر وەل خوای گەورەدا دانەنێیت، دەنا لۆمەکراوانەو دەرکراو لە رەحمەتی خوای گەورە، فڕێدەدرێیتە ئاگری دۆزەخەوە.

- ئەم ئایەتانەش هەر جەخت لەم حەقیقەتە دەکەنەوە:

-﴿قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا ٤٢﴾ الإسراء: ٤٢

-﴿وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٨٨﴾ القصص: ٨٨.

**٥- لەخۆشەویستیی و مەزنییدا هاوشانی نییە:**

- ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٢﴾ البقرة: ٢٢.

واتە: ئەوە خوای گەورەیە کە زەمینی بە پانوپۆڕیی بۆ راخستوون و ئاسمانی وەکو سەربان بەسەرتانەوە بنیاتناوەو ئاوی لە ئاسمانەوە بۆتان ناردۆتەخوارەوەو جۆرەها بەرهەمی پێهێناوەتەدیی، تا ببێتە رزق و رۆزیی و بژێویتان.. دەی سا هاوبەش بۆ خوای گەورە لە خۆشەویستیی و مەزنێتییدا (کە جۆری پەرستنن) دا مەنێن.

**٦-بەهیچ کلۆجێک هاوبەشی نییە:**

-﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ١٠٠﴾ الأنعام: ١٠٠ .

واتە : موشریکانی قوڕەیش جنۆکەیان کردبووە هاوبەشی خوای گەورەو پەرستنیان بۆ ئەوانیش ئەنجامدەدا ! لە کاتێکدا کە خوای گەورە ئەوانیشی

خەلقکردووە، ئیدی چۆن ئەوانــی (مەخلـووق) دەچـنە ریـزی (خـالق) و شـایانی پەرستن دەبن؟!

ئەمانە هیچ زانستێکی وەحییان نییەو کەوتوونەتە جنۆکەپەرستیی! پاک و بێخەوشی بۆ خـوای بـاڵا لە وەی کە ئەو موشریکـانە ئـاوا بە نەزانیــی وەسـفی خوای گەورە دەکەن و دەڵێن فریشتە کچی خوان!.

-﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٨﴾﴾ يوسف: ٣٧ – ٣٨ .

واتە: من (سەیدنا یوسف علیه السلام) رێبازو دیدو کەسانی قەومێکم وەلکردووە کە باوەڕیان بە خوای گەورە نەبوو، نکوڵییان لە هاتنی رۆژی دوایی دەکرد، ئیتر کەوتمە شوێن دیدو رێی بابوباپیرانی خۆم: (ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب)، کە بۆمان نەبووە بە هیچ کلۆچێک و بە هیچ رادەو برِو شێوازو چۆنیەتییەک لە هیچ شتێکدا هاوبەش بۆ خوای گەورە دابنێین..

ئەمە (ئەم دیدو راو بزاوت و هەڵوێستەمان) فەزڵی خوای گەورەیەو داوێتی بەسەرماندا، هەروەها رێزەو لە خەڵکی تری گرتووە، بەڵام زۆرینەی خەڵکی سوپاس و ستایشی خوای گەورەی لەسەر ناکەن.

-(وَالَّذ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ ۖ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ ۚ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ ۚ إِلَيْهِ أَدْعُوا۟ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾﴾ الرعد: ٣٦ .

واتە: ئیماندارە سەرڕاستەکانی ئەهلی کیتاب خۆشحاڵن بە هاتنەخوارەوەی وەحی بۆ جەنابت ،چونکە دڵنیابوون لەوەی کە هەڵوێستی خۆیان ڕاستەو وەکو

گومڕاکانیان نین، کە دەستکاری دەقی تەورات و ئینجیلیان کردووە، بەڵام ئەوانەی تریان لەگەڵ موشریکانی قورەیشدا گەلەکۆمەکێیان لێکردوویت، ئەمانە باوەڕیان بە هەندێک باسی قورئانەکە نییە، کە باس لە خوای گەورە دەکات، یان تایبەتمەندێتی نادات بە جولەکە...

جەنابت بفەرموو: من فەرمانم پێدراوە کە سەرڕاستانە خوای تاک وپاک بپەرستم و هاوبەشی بۆ دانەنێم.. من خەڵکی بۆ خواویستی بانگهێشتدەکەم ،چونکە گەڕانەوە هەر بۆ لای خوای تاکو تەنهایە.

ئایەتی تریش هەیە کە هەر جەخت لەم سیفەتە دەکەنەوە، وەکو:

-﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ۖ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾ ﴾ الإسراء: ١١١.

٧-خوای گەورە باوکی نییە:

-﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ ﴾ الإخلاص: ١ – ٣ .

واتە: بفەرموو کە خوای گەورە یەکەو تاقانەیە،خوای گەورە بێنیازە لە مەخلووقات، مەخلووقات پێویستیان بەوە، نە لەدایکبووەو نە کەسی لێبووە.

٨-خوای گەورە هاوسەری نییە:

-﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾ الأنعام: ١٠١ .

واتە: خوای گەورە کردگاری بێهاوتای ئاسمانەکان و زەمینە، کە بەشێوەیەک خەلقیکردوون کە پێشتر شێوەی وا نەبووە، چۆن دەشێت خوای گەورە منداڵی هەبێت؟! لە کاتێکدا کە هاوسەری نییە، هەر هەموو شێتک ئەو خەلقیکردووەو ئاگای لە هەموو شتێکەو هەمووشێتێک لەژێر زانیاری ئەودایە.

**٩-خوای گەورە کوڕی نییە:**

-﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣﴾ الإخلاص: ١ - ٣

**واتە: بفەرمـوو کە خـوای گەورە یەکەو تاقـانەیە.خوای گەورە بێنیـازە لە مەخلووقات. مەخلووقات پێویستیان بەوە. نە لەدایکبووەو نە کەسی لێبووە.**

**١٠- خوای گەورە کەسی نەکردووە بە کوڕی خۆی:**

-﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ۝١١٦﴾ البقرة: ١١٦.

**واتە: وتیان (جـولەکەو دیانەکـان) کە خـوای گەورە کـوڕی هەیە، پـاک و بێخەوشیی بۆ خوای گەورە، چۆن شتی وا دەشێت؟!**

**هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدان هی ئەون، موڵکی ئەون، مەخلووقی ئەون، عەبدی ئەون، هەموویان ناچاری ملکەچیـین و لەسـەر ئەو رێسـایانە دەڕۆن کە خوای گەورە خەلقیکردوون لەسەریان.**

-﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ۝١٧١﴾ النساء: ١٧١ .

**واتە: خوای گەورە خوای تاکو تەنهـایەو تاقـانەو پـاک و بێخەوشـە، چـۆن دەشێت ئەو کوڕی هەبێت؟!**

**کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدان هـی ئەون... هەر خـوای گەورە خـۆی بەسە بۆ شاهێدیدان لەسەر ئەمە.**

-﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ الأنعام: ١٠١.

**هەمان جەخت کردنەوەش وا لە ئایەتەکانی:**

-﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ۝٣٠﴾ التوبة: ٣٠.

-﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيّٞ مِّنَ ٱلذُّلِّۖ وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا ۝١١١﴾ الإسراء: ١١١.

**١١-خوای گەورە نە کوڕی هەیەو نە کچ:**

- ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ۝١٠٠﴾ الأنعام: ١٠٠ .

**واتە : موشریکانی قورەیش جنۆکەیان کردبووە هاوبەشی خوای گەورەو پەرستنیان بۆ ئەوانیش ئەنجامدەدا ! لە کاتێکدا کە خوای گەورە ئەوانیشی خەلقکردووە، ئیدی چۆن ئەوانی (مەخلووق) دەچنە ریزی (خالق) و شایانی پەرستن دەبن؟!**

**ئەمانە هیچ زانستێکی وەحییان نییەو کەوتوونەتە جنۆکەپەرستیی! پاکوبێخەوشی بۆ خوای باڵا لە وەی کە ئەو موشریکانە ئاوا بە نەزانیی وەسفی خوای گەورە دەکەن و دەڵێن فریشتە کچی خوان!.**

**١٢-خوای گەورە پێویستی بە یارمەتیدەر نییە:**

--﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيّٞ مِّنَ ٱلذُّلِّۖ وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا ۝١١١﴾ الإسراء: ١١١.

**واتە: بفەرموو: سوپاس بۆ خوای گەورەیە، کە هیچ کەسێکی نەکردووە بەکوڕی خۆی و هیچ هاوبەشێکی لە موڵک و دەسەڵاتدارێتییدا نییە، پێویستی**

بەیارمەتیدەرو سەرخەر نییە ،چونکە ژێردەستە نییە تا پێویستی بە هێزێک بێت لەسەرییبکاتەوە.. دەی سا بە ڕێزو مەزن رایگرە.. بەڕێزتـر لە هەبـوونی منـداڵ و هاوبەش و یاریدەدەرو سەرخەران.

١٢-هیچ کۆمەڵ و گەلێک نییە تایبەت بە خوای گەورە بێت:

-﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾﴾ المائدة: ١٨ .

واتە: هەر یەک لە جـولەکەو دیـان وتیـان: ئـێمە ئەوەنـدە لە خـوای گەورە نزیکین بووین بە ئەولادو خزم و خۆشەویستانی ئەو! پێیان بفەرموو: دەی ئەگەر وایە، بۆچی تووشی ناڕەحەتیی و زەلیلیی و کوێرەوەریی دنیایی کردوون؟!

باوک چۆن ئەولادی خۆی تووشی کێشە دەکات؟

خۆشەویست چۆن خۆشەویستانی خۆی بە زەلیلیی دەخاتە بەردەست خەڵکی؟ ئێـــوەش هەر مـــرۆڤن وەکـــو ئەو هەمـــوو خەڵـــکەی تـــر، کە خـــوای گەورە خەلقیکردوون.

خـــوای گەورە لەو کەســـانە خۆشـــدەبێت کە خـــۆی دەیەوێـــت و ئەوانەش سزادەدات کە خۆی بە دادپەروەریی خـۆی حوکمیـان بەسـەردا دەدات.. هەمـوو مـولْکی ئاسـمانەکان و زەوی و هەرچـی لە نێوانیانـدایە هـی خـوای گەورەیەو چارەنووسی هەموان بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە.

١٣-خوای گەورە پەروەردگارو دەسەڵاتداری باڵاو خوای هەموانە:

-﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾﴾ النـاس: ١ - ٣.
.

واتە: بفەرموو: من پەنادەگرم بە خوای گەورە، پەروەردگارو خاوەنی هەموو خەڵکی، دەسەڵاتداری باڵای هەموو خەڵکی، خوای هەمووخەڵکی.

١٤-هیچ شتێک وەکو خوای گەورە نییە:

-﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى: ١١ .

واتە: خوای گەورە داهێنەری ئاسمانەکان و زەمینە، هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ خەلقکردوون، هەر وەکو کە نێرومێی لە گیانلەبەرانی تردا خەلقکردووە، بەهۆی ئەوەوە زۆریکردوون (بە زاوزێکردن) هیچ شتێک وەکو خوای گەورە نییە، خوای گەورە بیسەرو بینەریشە.

-﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤﴾ الإخلاص: ١ – ٤ .

بفەرموو: کە خوای گەورە یەکەو تاقانەیە،خوای گەورە بێنیازە لە مەخلووقات، مەخلووقات پێویستیان بەوە، نە لەدایکبووەو نە کەسی لێبووە،هیچ یەکێکیش وەکو ئەو نییە.

**خاڵی دووەم: رەتکردنەوەی هەموو بەڵگەو بەهانەی کافران:**

١-رەتکردنەوەی فرە خوایی وەل خوای گەورەدا:

-﴿قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ١٩﴾ الأنعام: ١٩ .

واتە: پێیان بفەرموو: چ بەڵگەیەک لە شاهێدیدانی خوا گەورەترە؟

بفەرموو: ئـێ خـوای گەورە شـاهێدی نێـوان مـن و ئێـوەیە، ئەوی چـاودێرو بەئاگا، ئەوی زاناو بیسەرو بینەر، ئەو شـاهێدە کە مـن نێـرراوی ئەوم و وەحـیم لەوەوە بۆ دێت.

ئەم قورئانەی وەحییەو بۆ منی ناردووە، تـا هۆشـداریتان بـدەمێ و نەکەونە شیرکەوە، تا لە قیامەتدا رەنجەڕۆنەبن.

ئەم حەزەردانە بۆ ئێوەشەو بۆ هەر کەسێکی ترە، کە بانگەوازیی ئەم دینەی پێدەگات، چما ئێوە هەر سوورن لەسەر ئەو باوەڕەتان کە گـوایە: خـوای تـر وەل خوای گەورەدا هەن؟!

من شاهێدیی لەسەر شتی وا نـادەم ،چـونکە دڵنیـام کە خـوای گەورە تـاکە خـوایەو یەکەو بێـوێنەیە، تەبەڕاش دەکەم لەوەی ئێـوە بە هاوبەشـانی خوایـان دادەنێن.

-﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ١١٦ وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ١١٧ وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١١٨﴾ المؤمنون: ١١٦ – ١١٨ .

واتە: پاک و مەزنیـی و بـاڵایی بـۆ خـوای گەورە (لەوەی کە وا دەزانـن ئەم گەردوونەی هەر وا بە هەوانتە خەلقکردووە)، خـوای خـاوەن دەسـەڵات، حەق و حەقخواز، کە هیچ خوایەک نییە شایانی پەرستن بێت جگە لەو... خوای خـاوەن عەرشی بەرزو پیرۆز، هەر کەسێک بڕیاربدات کە خوای تر وەل خوای گەورەدا هەیەو هاناو هاواریان بۆ ببات -کە هیچ بەڵگەیەکی وەحی لەسەر شیاوێتی ئەوە نیـــیە- ئەوە حەتمەن خـــوای گەورە خـــۆی موحاســـەبەکردنی ئەو کەســـە دەگرێتەدەست خۆی و خۆی لێیدەپرسێتەوە...

خــوای گەورە کــافران خۆشــحاڵ و ئاســوودەناکات، بفەرمــوو: خــوایە لە

ئیمانـداران خۆشـبەو بەزەیـی لە لێخۆشبوونیشـیان زیـاتر پێبەخشـە، خـوایە تـۆ گەورەترین و چاکترین بەبەزەییترینیت.

**٢-رەتكردنەوەی فرەخوایی كەمتر لە مەنزیلەی خوای گەورە:**

-﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴾ الرعد: ١٦.

واتە: پێیان بفەرموو: كە كێ خاوەنی ئاسمانەكان و زەمینە؟ كێ پەروەردگارو هەڵسوڕێنەریانە؟ پێیان بناسێنە كە ئەوە خوای گەورەیە، پێیان بفەرموو: دەی باشە ئێوە كە دەبینن خوای گەورە ئەم گەردوون و ژیانەی خەلقكردووە ئیتر چۆن ئەو ناپەرستن و بتتان داناوە دەیپەرستن؟! كە ناتوانن نە سوود بە خۆیان بگەیێنن، نە زیانیش لە خۆیان دووربخەنەوە! ئیدیی ئێوە بۆچی وا لە حەنای حەقدا كوێرن؟ چما كوێرو چاوساغ (بینا) وەكو یەكن؟!.

-﴿ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن يَتَّخِذُوا۟ عِبَادِى مِن دُونِىٓ أَوْلِيَآءَ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ ﴾ الكهف: ١٠٢ .

واتە: چما ئەو كەسانەی دیدو رێی كوفریان گرتۆتەبەر ئەوەیان پێ ڕاسـت و رەوایە كە هەندێک لە عەبـدەكانم: (فریشـتە، عیسـا، عـوزێر علـیهما السـلام) بكەنە خواو مەنزیلەی خوایەتییان لە خوار منەوە بدەنێ؟!

بەڕاستی ئێمە دۆزەخـمان ئامـادەكردووە ،تـا تەقـدیمی كـافرانی بكەیـن، تـا ئەوێیان بۆ ببێتە جێ سوكناو مەئواو هەوارگەی حەسانەوە!.

-﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓا۟ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الأنبياء: ٢١ – ٢٢ .

واتە: بەڵام هەر دارو بەردی زەمینیـــان داتاشـــیووەو كردوویـــانن بە خـــوای

خۆیان! واشدەزانن مردووەکانیان زیندوودەکەنەوەو ڕێزیاندەگرن! نا ئەمە چەوت و نارەوایە.. ئەگەر خوایەکی تر وەل خوای گەورەدا لە ئاسمان و زەمیندا هەبوایە حەتمەن ئاسمان و زەوی هەمووی تێکدەچوو (چونکە فەرمانی دژبەیەکیان بۆ دەچوو) سوپاس و ستایش بۆ خوای خاوەن عەرشە، پاک و بێخەوشی بۆ ئەو، لەوەی ئاوا بە نەزانیی وەسفیدەکەن.

**٣-رەتکردنەوەی هەبوونی هاوشانی خوای گەورە لە مەزنێتیی و خۆشەویستییدا:**

﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾﴾ فصلت: ٩ .

**واتە: پێیان بفەرموو : چما ئێوە باوەڕ بەو خوا بەدەسەڵاتە ناکەن کە زەمینی بە دووڕۆژ خەلقکرد، ئاوا لە مەزنێتیی و خۆشەویستییدا خوای تری بۆ دادەنێن؟! لە کاتێکدا ئەو پەروەردگار (کردگارو خاوەن و هەڵسوڕێنەر) ی هەموو جیهانیانە.**

**٤-رەتکردنەوەی هەبوونی هاوسەر بۆ خوای گەورە:**

-﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰ إِلَى الْإِسْلَامِ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٧﴾﴾ الصف: ٧ .

**واتە: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە بوختان هەڵدەبەستێ و دەڵێ: خوای گەورە کوڕو هاوسەری هەیە! لە کاتێکدا بانگهێشتی ئیسلام دەکرێت، خوای گەورە هیدایەتی ستەمکارانە نادات.**

-﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾﴾ الأنعام: ١٠١ .

واتە: خـــوای گەورە کردگــــاری بێهاوتـــای ئاســـمانەکان و زەمیـــنە، کە بەشێوەیەک خەلقیکردوون کە پێشتر شـێوەی وا نەبـووە، چـۆن دەشـێت خـوای گەورە منداڵی هەبێت؟! لە کاتێکدا کە هاوسەری نییە، هەر هەمـوو شـێتک ئەو خەلقیکردووەو ئاگای لە هەموو شتێکەو هەمووشێتک لەژێر زانیاری ئەودایە.

٥-رەتکردنەوەی هەبوونی کوڕ بۆ خوای گەورە:

-﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾ مريم: ٨٨ – ٩٥.

واتە: وتیان: خوای میهرەبـان کـوڕی هەیە! بە ڕاسـتی قسـەیەکی زۆر بەدو دژوارو خراپتـان کـرد، قسـەیەکە خەریـکە ئاسـمانەکان لە حەشـمەتدا، لە رق و نارەزاییدا، لە پێناخۆشبووندا شەق ببەن، درزیان تێکەوێت و بەسەریەکدا بڕمێن، خەریـکە زەمـین لەت وپەت ببێـت و ئەو چیـا سـەختانە دارمێنەخـوارێ لێـی، (هەمـــوو گەردوون دەخوازێـــت ســزایان بــدەن لەســەر ئەو قســە بەدەی کــر کردوویانە).

نابێت و ناشێت و نالوێت خوای میهرەبان ئەولاد بگرێتە خۆی.. لەسـەر ئەو بوختانەی بەنەزانـی وسـتەمکاریی وکەللەرەقـی خۆیـان کردوویـانە کەدەڵـێن : خوای گەورە کوڕێکی هەیە! شیاو شایستە نییە و مەحاڵە خـوای گەورە کـوڕی هەبێـت... لەرۆژی دواییـدا هەمـوو ئاسـمانەکان و زەوی و هەر چـی تێیانـدایە، هەرچی بەخوا دانراون (لەفریشتەو پەری و سەیدنا عیساو سەیدنا عوزێر (علیهم السلام)) هەموو ملکەچانە دێنەوە بەردەستی خوای تاکو دەسەڵاتدار.

-﴿لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٤﴾ الزمر: ٤ .

**واتە: ئەگەر وا بوایە وەکو جولەکەو دیان و موشریکانی عەرەب دەڵێن: کە گوایە خوای گەورە کوڕو کچی هەیە، ئەو کاتە کوڕێکی لە نێوان هەموو ئەوانەدا کە خەلقیکردوون هەڵدەبژاردو دەیکردە کوڕی خۆی! بەڵام ئەوە ناشێت. لایق بە خوای پاک و باڵا نییە... پاک و بێ عەیبیی بۆ خوای گەورە، چۆن ئەمانە قسەی وا پوچەڵ بۆ خوای تاک و بەدەسەڵات هەڵدەبەستن ؟!!.**

**٦-رەتکردنەوەی ئەوە کە سەیدنا (عیسا -علیه السلام) خوا بێت:**

-﴿لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ﴾ المائدة: ٧٢ .

**واتە: بە تەئکید ئەوانەی کە وتیان: خوای گەورە، هەر (عیسای کوڕی مەریەم)ە -علیهما السلام- کافربوون (ئەوانەی دەڵێن: خوای گەورە عیسای لە زاتی خۆی ئیجادکردووە!).**

-﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٣ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٤ مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٧٥ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٧٦﴾ المائدة: ٧٣ – ٧٦ .

**واتە: بە تەئکید ئەو کەسانە کافربوون کە وتیان : خوای گەورە سێیەمین خوایە :(سەیدنا عیساو دایکی علیهما السلام دوانەکەی ترن کە زۆر لە دیانە کان دەڵێن: هەموو یەکبوون و خوای گەورە رۆحی لە خۆی کردۆتەوەو کردویێتی بە**

سەیدنا عیسا علیه السلام) جگە لە یەک خوای حەقیقی، هیچ خوایەکی تر نییە، ئەگەر ئەوانەی وا دەڵێن، کۆتایی بەو قسە (پووچەڵ دژوارو خەتەرناکە) نەهێنن بە تەئکید کافردەبن و سەرەنجام دەکەونەبەر سزایەکی بەژان.

بۆچی پەشیمان نابنەوەو سەرڕاستانە ناگەڕێنەوە لای خوای گەورەو داوای لێخۆشبوونی لێبکەن، خۆ خوای گەورە لێخۆشبوو و بەبەزەییەو چاوپۆشیان لێدەکات...

مەسیحی کوڕی مەریەم (علیهما السلام) جگە لە نێرراوێکی خوای گەورە هیچ ئیمتیازێکی تری نەبوو، جەنابی (علیه السلام) پێغەمبەرێکی خوایە، وەکو هەر یەکێک لەو پێغەمبەرانەی پێش خۆی هاتن (علیهم السلام)...

(عیسا- علیه السلام) مرۆڤبوو، خۆی و دایکی وەکو ئەو خەڵکە بوون، خۆراکیان دەخوارد... بڕوانە ئێمە چۆن نیشانەو بەڵگەی حەقیان بۆ ڕووندەکەینەوە، کەچی ئەوان چۆن درۆو دەلەسە دەکەن و بوختان هەڵدەبەستن..

پێیان بفەرموو: چما ئێوە کەسانێک دەپەرستن کە هیچ سیفەتێکی خواییان بە هیچ رادەو بڕو شێوەو چۆنییەتییەک تێدا نییە، نە دەسەڵاتی سوود پێگەیاندنتانیان هەیەو نە دەسەڵاتی زیان دوورخستنەوە لێتان... خوای گەورە بیسەرو زانایە.

-﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾﴾ المائدة: ١١٦ – ١١٧ .

واتە: خوای گەورە بە سەیدنا (عیسا)ی فەرموو: ئەرێ عیسای کوڕی

مەریەم! ئەوە جەنابت بەو خەڵکەت فەرمووە، کە لە جیاتی خـوای گەورە مـن و دایکم بە دوو خوای خۆتان دانێن؟!

سەیدنا (عیسا علیە السلام) فەرمووی: خوایە! پاک و بێخەوشـی بۆتـۆ، مـن چۆن شتی وا دەڵێم؟! من بۆم نییە غەیری قسـەی حەق بـکەم (مـن مـافی ئەوەم نییە ئەو قسەیە بکەم) ئەگەر شتێکی وام بوتایە، خۆت دەتزانی، تۆ ئەوە دەزانی کە لە ناخ (نەفس)ی مندایە، بەڵام من نازانم چی لە ناخ (نەفس)ی تۆدایە.

بەتەئکید تۆ ئاگـاداری رەهـاو بێسـنووری هەمـوو نادیارەکانیـت،من هـیچم غەیری ئەوە پێڕانەگەیانـدون کە فەرمانـت پێـداوم پێیـان بگەیێـنم، کە بـریتییە لەوەی: خەڵکینە خـوای گەورە بپەرسـتن کە خـاوەن و پەروەردگـاری منـیش و ئێوەشە، ئەوەندەی لەناویاندابووم، شاهێدبووم بەسەریانەوەو نەمدەهێشت شـتی وا بڵـێن، کەمرانــدتم و بەرزتکــردمەوە بــۆ ئاســمان هەر خــۆت چــاودێرو سەرپەرشـتیارو ئاگاداریـان بوویـت، تـۆش شـاهێدو ئاگـاداری زانـاو بیسـەرو بینەری هەموو شتێکیت.

٧-رەتکردنەوە ئەوە کە سەیدنا (عیسا- علیە السلام) کوڕی خوا بێت:

-﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾﴾ المائدة: ٧٢.

واتە: سەیدنا( عیسا- (علیە السلام))بە بەنوئیسرائیلییەکانی فەرمووو: خوای گەورە بپەرسـتن، کە پەروەردگـاری مـن و ئێـوەیە، بشـزانن کە هەر کەسـێک هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیاربدات، خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغەدەکات و لەو پاداشت و نازو نیعمەتە مەحروم دەبێت و دەشچێتە دۆزەخەوە.

دۆزەخ دەبێــتە جــێ ســوکنای.. ئەوانەی لە دنیــادا کــافرو موشرێــک و ستەمکاربوون، لە قیامەتدا کەس بەهانایـانەوە نایـات و بێپشـتیوان و لایەنگـر دەمێننەوە.

-﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦٤ ﴾ الزخرف: ٦٤ .

واتە: سەیدنا (عیسا علیه السلام) فەرمووی: خـوای گەورە پەروەردگـاری مــن وپەروەردگــاری ئێــوەیە دەی سابیپەرســتن.. ئەمەشــە رێگــای ڕاســتی خواویستی.

٨-ڕەتکردنەوەی ئەوە ،کە گوایە خوای گەورە کچی هەیە:

-﴿ لَوۡ أَرَدۡنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهۡوٗا لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ١٧ بَلۡ نَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَى ٱلۡبَٰطِلِ فَيَدۡمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٞۚ وَلَكُمُ ٱلۡوَيۡلُ مِمَّا تَصِفُونَ ١٨ ﴾ الأنبياء: ١٧ – ١٨.

واتە: ئــێمە ئاســمانەکان و زەویــمان بە هەوانــتە دروســتنەکردووە، بــۆ گەمەسازیی و رابواردن خەلقمان نەکردوون. ئەگەر بـۆ خۆمەشـغوولکردن بـوایە هاوسەر و ئەولادمان بۆ خۆمان خەلقدەکردو پێیانەوە مەشـغوولدەبووین، جـۆری ئەولادمان بەتایبەت بـۆ خۆمـان خەلقـدەکرد، بەڵام ئەوەمـان نەکـردووە ،چـونکە ئاســمانەکان و زەویــمان بە دانــایی و بە مەبەســت خەلقکــردووە. بەڵام حەتمەن حەقدەگرین و زۆر بە توندیی لەسەرەوە بەسەر باتڵییـدا دەکێشـین (لە سـەرەوە حەق دەگرینە بـاتڵی سـەرزەمین) جـا حەتمەن باتـڵ نابوتـدەبێت... سـزای وەیـل (دۆڵێکە لە دۆزەخ یان جۆرە سزایەکە) بۆتان لە بەرامبەر ئەو وەسفەی بۆ خـوای گەورەی دەکەن.

-﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَلِرَبِّكَ ٱلۡبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلۡبَنُونَ ١٤٩ أَمۡ خَلَقۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثٗا وَهُمۡ شَٰهِدُونَ ١٥٠ أَلَآ إِنَّهُم مِّنۡ إِفۡكِهِمۡ لَيَقُولُونَ ١٥١ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٥٢ أَصۡطَفَى ٱلۡبَنَاتِ عَلَى

ٱلۡبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾﴾ الصافات: ١٤٩ – ١٥٥ .

واتە: بە تەوسەوە داوای وەڵام لە کافرانی قورەیش بکەو بفەرموو: چما خوای گەورە کچی هەیە؟ (کە ئێوە بە کچ رازی نین و زیندەبەچاڵیان دەکەن) ئێوەش کوڕ؟! کوڕ بۆ خۆتان هەڵدە بژێرن و کچیش بۆ خوای گەورە؟! یان پێتان وایە ئێمە فریشتەمان مێینە خەلقکردوون (کە ئێوە دەڵێن: فریشتە کچانی خوای گەورەن!) چما ئامادەبوون و دیتتان کە خەلقمانکردن؟! نا.. ئەمانە هەر لە درۆو بوختان و قسەی نابەجێیاندان. دەڵێن: خوای گەورە کوڕی هەیە! درۆدەکەن، چما خوای گەورە کچانی پێباشترە لە کوڕان؟! ئێوە چیتانە؟ چیتان بەسەرداهاتووە کە ئاوا بڕیاردەردەکەن؟ بۆچی بیرناکەنەوە؟.

**٩-رەتکردنەوەی ئەوە کە خوای گەورە یاریدەدەرو سەرخەری هەیە:**

-﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٣﴾﴾ سبأ: ٢٢ – ٢٣.

واتە: پێیان بفەرموو: ئادەی هانا ببەن بۆ ئەوانەی لەجیاتی خوای گەورە داتانناببوون و کردبوتانن بە خوای خۆتان، کە بە قەدەر گەرد (مسقاڵە زەڕە) یەکیان موڵک لە ئاسمانەکان و زەوییدا نییەو لە هیچ پشکێکییدا هاوبەشنین و تەنانەت یەک یاریدەدەرو سەرخەریشیان نییە، کە بتوانێت لە بەرامبەر غەزەبی خوای باڵادەستدا بیانگرێتەخۆ.. هیچ مەخلووقێک بۆی نییە لای خوای گەورە تکا (شەفاعەت) بۆ کەسێک بکات بە بێ ڕێپێدانی خوای گەورە (بەرپەرچی بتپەرستەکانە، کە دەیانوت ئەم خوایانەمان تکاکاری لای خوای گەورەن بۆمان).

جا دوای ئەوەی مۆڵەتی شەفاعەتکردن بە هەندێک دەدرێت ترس و بیمیان لەسەر لادەچێت و ئاهێکی سرەوت بە دڵیاندادێت و دەڵێن: ئۆخەی.. ئینجا لە

خۆشیاندا مژدە  بە یەکتریی دەدەن دەڵێن: ئەرێ خوای گەورە چی فەرمــوو؟ هەر خۆیانــدا (یــان فریشــتە وەڵامــدەدەنەوە کە فەرمایشــتی حەقــی فەرمــوو، کە تکاکاریی ئەوانە بۆتان قبووڵدەکات. خوا باڵادەست و مەزنە).

١٠-رەتکردنەوەی هەموو جۆرێکی هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە:

-﴿ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ٣١ ﴾ الحج: ٣١.

واتە: حاجیــانی سەرڕاســتی مــاڵی خــوای گەورە، موســوڵمانانی بــۆ خــوا سوڵحاون، بۆ خوای گەورە لێبڕاون و بە هیچ کلۆجێک هاوبەشی بۆ دانانێن. هەر کەسێک هاوبەش بۆ خوای تاکوپاک دابنێت وەکـو ئەوەی لێـدێت لە ئاســمانەوە بکەوێتەخوارەوەو باڵندەی بەهێز ڕایفــڕێنن، یــان ڕەشــەبا بەرەو جێگــایەکی زۆر دووری رادات (ئەو کەســەی هــاوبەش بــۆ خــوای گەورە بڕیــاردەدات کــات و شوێنی نامێنێت بۆ ئەمان و حەوانەوە).

-﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا ٤٠ ﴾ فاطر: ٤٠ .

واتە: ئادەی ئەو هاوبەشانەتان کە بۆ خوای گەورەتان داناون و کردوتانن بە خوای خۆتان، با بزانین چییان لە سەرزەمیندا خەلقکردووە، بــا نیشــانماندەن کە لە چییدا هاوبەشی خوای گەورەن؟ چییان لە ئاسمانەکاندا هەیە؟ هیچ، هیچ شــتێکی وانەبووەو نییە، بەڵام کافرو موشریک و ستەمکاران هیوادرۆزنە بە یەکتر دەدەن و مەغرورانە خۆدەنوێنن، کە گوایە دەتوانن بەرگریی لە یەکتریی بکەن.

-﴿وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾ لقمان: ١٣ .

واتە: (لوقمان) - سەلامی خوای لێبێت- وەسێتی بۆ کوڕەکەی دەکرد، پێیفەرموو: رۆڵەگیان! هەرگیزاو هەرگیز هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیارنەدەیت، هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە کوفرێکی گەورەو ستەمێکی زۆر گەورەیە.

-﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ٢٢ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٢٣ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٤﴾ الحشر: ٢٢ — ٢٤ .

واتە: ئەوە هەر خوای پەروەردگارە کە هیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتی بێت، جگە لەو، زاناو ئاگاداری جیهانی دیارو نادیارەو میهرەبان و بەبەزەییە.

ئەوە خوای گەورەیە کە هیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتی بێت جگە لەو، خوای خاوەن دەسەڵاتی بێسنوورو پیرۆز، خوای تاک وپاک و خوای ساغ و کامڵ و دوور لە هەر جۆرو ڕادەو بڕو چۆنیەتیەکی کەموکورتیی، خوای پشتیوانی نێرراوانی، کە بە موعجیزەی دەستیان سەریاندەخات، خوای بەتواناو بەئاگاو چاودێرو شاهێد لەسەر هەموو بزاوت و سرەوتێکی مەخلووقات، خوای بەهێزو بەتواناو قودرەت، خوای خاوەن قەهرو (کۆنترۆڵ)کار، خوای گەورە کە مەزنێتی لایەق بەخۆیەتی.. پاکیی و بێخەوشی بۆ خوای گەورە، لەوەی موشریکان وەسفیدەکەن پێیی..

خوای گەورە کردگارەو لە نەبووە مەخلووقاتی ئیجادکردووە، هەر یەکەیانی بۆ کات و شوێن و حاڵەتی خۆی و دەوروبەریی سازاندووە.. خوای گەورە دیمەن

و شێوەو وێنەی هەر یەک لەم مەخلووقاتانەی بەو شێوەیە نەخشاندووە..

خـوای گەورە خـاوەنی نـاوە بەرزو جوانەکـانەو هەرچـی لە ئاسـمانەکان و زەویدا هەن زیکری خوای تاکوپاک دەکەن، خوای گەورە بە دەسەڵات و دانایە.. هەرچـی بخوازێـت دەیکـات، بەو شـێوەیەش دەیکـات کە لە دانـایی خـۆی دەوەشێتەوە.

**خاڵی سێیەم: بەڵگەی بەهێزو بنبڕ لەسەر  تاقانەیی خوای گەورە:**

-﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ ۚ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ۖ وَقَالَ شُرَكَاؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُو كُلُّ نَفْسٍ مَّا أَسْلَفَتْ ۚ وَرُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَائِكُم مَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ۚ قُلِ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَائِكُم مَّن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ ۚ قُلِ اللَّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّي إِلَّا أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ يونس: ٢٨ – ٣٦ .

**واتە: ڕۆژی حەشر هەموویـــان کــۆ دەکەیــنەوە، پاشــان بە موشریکەکــان دەڵێین: خۆتان و بتەکانتان لە یەکجێدا بوەستن، ئەوانەی کردبوتانن بە شەریکی خوای گەورە، ئەوانە بە جودا لە ئیماندارا ن رادەگرین.**

**جا ئەوانەی کە بەشەریکیان دانابوون تەبەڕا لە پەرستیارە موشریکەکانیـان دەکەن و رادەگەیـنن کە خـوایە ئـێمە رازینەبـووین بە دیـدو پەرسـتنی ئەوان و نەمانویستوون.**

خوای گەورە خۆی شاهێدەو ئاگای لە حاڵی ئێمەش و ئێوەشەو دەزانێـت کە ئێمە بێئاگابووین لەوەی ئێوە ئێمەتان بە هاوبەشی خوا دانـابوو... ئـا لەو رۆژەدا هەموو کەسێک گیرۆدەی نییەت و رەفتـار (گوفتـارو کـردار)ی دنیـایی خـۆی دەبێت، ئەو رۆژە کە هەر هەمـوو مەخلووقـات گەڕاونەتەوە لای خـوای حەقـی خۆیان.

جـا ئەوانەی بە شـەریکی خـوای گەورە دانرابـوون لە ترسـاندا خـۆ لەوانە دەدزنەوە کە دەیانپەرستن، پێیان بفەرمـوو: کـێ لە ئاسـمان و زەویـدا رۆزی بـۆ دابینکردوون؟ کێ هەستی بیستن و بینینی تێـدا خەلقکـردوون؟ کـێ زینـدوو لە مـردووە دەردەهێنێـت و مـردوو لە زینـدوو دەردەهێنێـت؟ کـێ هەڵسـوڕێنەری گەردوون و ژیانەو کاروباری مەخلووقاتی بەدەستە؟

لە وەڵامی هەموویاندا دەڵێن : خوای گەورە، سا پێیان بفەرموو :دەی بۆچی لە خوای گەورە ناترسن؟ بۆچی باوەڕ بە پەیامەکەی ناهێنن؟ بکەری هەمـوو ئەوانە خوای گەورەیە، پەروەردگاری حەقتـانە، دوای حەق غەیـری نـاهەقی هەیە؟ هەر کەسێک لەحەق بترازێت _کەدینەکەی خوای گەورەیە_ بەدڵنیاییەوە دەکەوێـتە ناهەقیی و گومڕایی و ناڕەواییەوە.

دەی کەوایە بۆچی _لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو بەڵگە بنبڕانەشدا_ هەر خۆ لە موسوڵمانبوون دەبـوێرن و ناتانەوێـت حەق وەرگـرن! بـۆ؟ مـادام ئەوانە بەرەو خواویسـتی نەهـاتن، خـوای پەروەردگـاریش روویـان لەحەق لادەدات، ئەوەش حەقە، بڕیاری خوای پەروەردگـارتە، دەربـارەی لاڕێ و مونحەریفـان، کە مـادام ئەوان حەق قبووڵناکەن، ئیـتر مـۆری بێئیمانیـان لە دڵ دەدرێـت و کـافردەبن، کە کافریشـبوون چارەنووسـیان دۆزەخ دەبێـت ،چـونکە بەڵێنـی تەئکیـدم داوەو سوێندمخواردووە کە دۆزەخ پڕدەکەم لەوانەی باوەڕیاننەهێناوە. پێیـان بفەرمـوو:

ئادەی هیچ کام لە خوا قەستینەکانتان _کە کردوتانن بە هاوبەشی خوایەتی خوای گەورە_ هەیانە ژیانی بەخشیبێت؟ دەستپێکی ژیانی مەخلوقاتی لەدەستدا بووبێت؟!

هەیانە توانیبێتی لە نەبووەوە خەلقبکات و کە مرد سەر لە نوێ زیندوویبکاتەوە؟ ئایا ئەمە بە هیچ یەکێکی غەیری خوای گەورە دەکرێت ؟! نا، نەخێر... ئەوە هەر خوای گەورەیە کە ژیانی لە سەرەتاوە بەخشیووەو دوای مردنیش جارێکی تر زیندوودەکاتەوە.

دەی ئەگەر وایەو خۆشتان ئەمە دەزانن و دەبینن، بۆچی بت دەپەرستن؟ بۆچی هاوبەش بۆ خوای باڵادەست بڕیاردەدەن؟ بۆچی ئەم بوختانە گەورەیە دەکەن؟ پێیان بفەرموو: ئادەی بۆم ڕوونکەنەوە داخۆ شەریکەکانتان (بتەکانتان) خاوەن بەڵگەن کە بسەلمێنن ئێوە لەسەر حەقن؟ دەتوانن هیدایەتتان بدەن؟ بفەرموو: خوای گەورە حەق دەناسێنێت و خەڵکی هیدایەتدەدات بۆی..

چما ئەوی کە ڕێنمایی حەق دەکات _کە خوای گەورەیە_ شایانی ئەوەیە شوێن دینەکەی بکەون، یان ئەو کەسەی کە نەک هەر ناتوانێت ڕێنمایی بەرەوحەق بکات، بەڵکو خۆی ئاڕاستەدەکرێت؟! خۆی نازانێت ڕووی لە کوێیەو چۆن ڕێدەدۆزێتەوە! ئەمە ئێوە چۆن چۆنی حوکم دەردەکەن؟! نابنە شوێنکەوتووی حەقی حەقخواز، کە خوای باڵا دەستە، کەچی دەبنە شوێنکەوتووی بت (و فەلسەفەو زانست) کە خۆی دەبێ ئاڕاستەبکرێت..

زۆرینەیان هەر کوێرانە کەوتوونەتە سەر دیدو دینی باب وباپیرانیان و هەر لەسەر گومان، دینداربوون!! گومانیش زانست نییە، گومان ڕێبازی حەق ناسین نییە، وەحی خوایی ڕێبازی حەق و حەقناسینە، خوای گەورە زانایەو ئاگادارە بەوەی دەیکەن.

-﴿ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٨٤ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ۝٨٥ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۝٨٦ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ۝٨٧ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٨٨ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ۝٨٩ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ۝٩٠ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ۝٩١ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۝٩٢﴾ المؤمنون: ٨٤ – ٩٢ .

واتە: بفەرموو: ئەگەر درک بە شت دەکەن و دەزانن، باشە زەوی و ئەوانەی تێیدان هی کێن؟ جا دەڵێن هی خوای گەورەن، بفەرموو: دەی باشە بۆچی یادی خوای گەورە ناکەن و ناکەونە پەرستنی حەقیانەتی؟! بفەرموو: کێ کردگارو خاوەن و پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانەو خاوەنی عەرشە مەزنەکەیە؟

دەڵێن: هەمووی موڵکی خوای گەورەن! بفەرموو: دەی باشە بۆچی لە خوا ناترسن و دینەکەی وەرناگرن؟ بفەرموو: دەسەڵاتی موڵکایەتیی و حوکمڕانیی هەر هەموو وجود هی کێیە؟! کێیە کە داڵدەدەدات و پێویستی بە هیچ هێزێک نییە داڵدەیبدات و لەخۆی بگرێت؟ ئەگەر ڕاستدەکەن و دەزانن ئەوە کێیە کە ئاوایە؟

دەڵێن: خوای گەورەیە، بفەرموو: دەی دەی سا بۆچی خۆتان چەواشەدەکەن و لە حەق لادەدەن؟!! ئێمە بەدڵنیاییەوە حەقمان بۆ ناردوون و دیدو ڕێبازیمان بۆ ڕوونکردوونەتەوەو ئاشکراو راشکاوانە داوامانلێکردوون کە ئەوە حەقە، سا بیگرنەبەر، بەڵام ئەوان درۆزنن، کە نکووڵی لە حەق دەکەن. خوای گەورە کوڕی نییە. خوایەکی تری وەلدا نییە. ئەگەر خوایەکی تری وەلدابوایە، هەر

خوایەو مەخلووقی بۆ خۆی دروستدەکردو هەر خۆی ئاڕاستەیدەکردو نەیدەهێشت عەبدایەتیی بۆ خواکەی تر بکەن. کە وا بوایە هەردوو خواکەش ناکۆکدەبوون و دەکەونە ململانێی یەکتریی (هەر وەکو کە دەسەڵاتداران و هێزدارانی دنیایی دەکەونە ململانێی ماڵ و دەسەڵات و خاوەنێتیی و ناو، بەرامبەر یەکتریی)..

پاکی و بێخەوشی بۆ خوای گەورە لەو وەسفە ناقۆڵاو نەشیاوانەی کە بۆی دەکەن. خوای گەورە زاناو بەئاگای دیارو نادیارە.. پاک و باڵاو مەزنیی هەر بۆ خوای گەورەیەو دوورە لەو هاوبەشێتییەی بۆی بڕیاردەدەن.

ئەوەندەی کە لە دەقی قورئان هێنامانەوە، بەسە بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر سەلماندن و چەسپاندنی خوایەتی خوای گەورەو تاقانەێتیی ئەو، لە ناوو سیفەتە بێوێنەکانییدا. هەروەها دەربارەی شیاوێتی پەرستنی ئەو بە پاکیی و تاکیی و نەشیاوێتی غەیری ئەوو نالایەقی هیچ جۆرە پەرستنێک.

وا نازانین بابەتەکە لەگەڵ زۆریی ماددەکەشی لەوەندە زیاتری پێویست بێت، تا لێرەدا بهێنرێتەوە.

**بڕگەی چوارەم: تەوحید لە فەرموودەدا:**

تەنها هەندێک فەرمووده لەم بارەوە دەهێنینەوە کە مەبەستمانی پێ دێتەدیی:

-ئەبو هورەیرە - خوالێی ڕازی بێت -دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ( قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ).[1]

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێ: من لە هەموو شەریکایەتییەک بێنیازم و پێویستیم پێی نییە،هەر کەسێک کارێک بکات و هاوبەشێک بۆ من دابنێت تێیدا، خۆی و شەریکەکەی وەلدەکەم.

-هەر ئەبوهورەیرە - خوالێی ڕازی بێت -دەگێڕیتەوە کەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ( قَالَ قَالَ اللَّهُ كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ لَنْ يُعِيدَنِي كَمَا بَدَأَنِي وَلَيْسَ أَوَّلُ الْخَلْقِ بِأَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ إِعَادَتِه. وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا وَأَنَا الْأَحَدُ الصَّمَدُ لَمْ أَلِدْ وَلَمْ أُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لِي كُفْئًا أَحَدٌ).[2]

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێ: مرۆڤ بەدرۆی خستمەوە، کە بۆی نەبوو وابکات، جنێوی پێدام، کە مافی ئەوەی نەبوو.. ئەما بەدرۆخستنەوەکەی بۆم ئەوە بوو: کە وتی خوای گەورە وەکو کە سەرەتا خەلقیکردووم سەرلەنوێ

(١) أخرجه مسلم – رسالة التوحيد – للشيخ اسماعيل بن عبدالغني الدهلوي الشهيد – تعريب: الأستاذ أبوالحسن الندوي – نشر المكتبة اليحيوية سهارنفور – الهند – ١٣٩٤ک. ١٩٧٤ز ل: ٥٠. راستە (موسليم (٢٩٨٥).

(٢) بوخاری ب٦ ل:٢٢٢. راستە: بوخاری (٤٦٩٠).

خەلقمناکاتەوە، لە کاتێکدا کە خەلقکردنی یەکەمینجاریی لە زیندوکردنەوەی ئاسانترە. ئەمما جنێوپێدانی بۆم ئەوەیە کە وتی: خوای گەورە کوڕی هەیە. لە کاتێکدا من یەکم و تاکم و پێویستیم بە هیچ نییە. نە لەدایکبووم و نەلێمەوە لەدایکبووەو نە یەکێکش هەیە هاوشان و هاوشێوەی من بێت.

- عوبادە - خوالێی ڕازی بێت -دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنْ الْعَمَلِ).[(١)]

واتە: هەر کەسێک شاهێدیی بدات کە هیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتی بێت جگە لە خوای گەورەو شاهێدیی بدات: کە (محمد صلی الله علیه وسلم) عەبدو نێرراوی خوای گەورەیەو (عیسا (علیه السلام)) عەبدو نێرراوی خوای گەورەیەو وشەی ئەوە، کە خستوێتیە کیانی مەریەمەوە (علیها السلام)، و شاهێدی بدات کە بەهەشت ڕاستەو دۆزەخ ڕاستە، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە هەر کارێکیشی کردبێت.

-لەریوایەتێکی تریدا یەکێک لە پیاوانی سەنەدەکەی زیادەیەکی هێناوە، کە لە کۆتاییدا دەفەرمووێ: (مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ شَاءَ)[(٢)] واتە خوای گەورە سەرپشکی دەکات کە لە هەر دەرگایەک _لەهەشت دەرگاکەی بەهەشتەوە_ ویستی دەیکاتە ژوورەوە.

- موعازی کوڕی جەبەل - خوالێی ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە: (أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ

---

(١) نوسەری بەڕێز نوسیوێتی: (سەرچاوەی پێشوو (واتە: سەحیحی بوخاری) ب٤ ل: ٢٠١، و صحيح مسلم ب١ ل:٢٢٦_٢٢٧. راستە: بوخاری (٣٢٥٢)، موسلیم (٢٨٤١).

(٢) ئیمامی ئەوزاعییە لە عومەیری کوڕی هانییەوە لە جونادەی کوڕی ئەبوئومەییەوە لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە گێڕاوێتیەوە. هەر لە سەحیحی موسلیم (٢٨٤١)دایە.

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا مُعَاذُ قُلْتُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ ثُمَّ قَالَ مِثْلَهُ ثَلَاثًا هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ قُلْتُ لَا قَالَ حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ثُمَّ سَارَ سَاعَةً فَقَالَ يَا مُعَاذُ قُلْتُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ قَالَ هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ).[١]

واتە: ڕۆژێک لە دوای پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) سواری سوارییەک بووبووم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئایا دەزانیت مافی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە چییە؟

موعاز فەرمووی: خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زاناترن .

فەرمووی: مافی خوای گەورە لەسەر بەندەکانی ئەوەیەکە وا بیپەرستن کە هیچ جۆرە هاوبەشێکی تێدا دانەنێن بۆی

اشان فەرمووی: ئەدی دەزانی مافی بەندەکانی خوای گەورە لەسەر خوای گەورە چییە؟

موعاز فەرمووی: خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زاناترن.

فەرمووی: مافی بەندەکان لەسەر خوای گەورە ئەوەیە: کە ئەگەر ئەوان بەو شێوە پاکە پەرستیان، ئەمیش لە سزای خۆی بەدووریانبگرێت.

- هەر موعاز - خوالێی ڕازی بێت -گێڕایەوە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: (لا تُشْرِكْ باللهِ شيئًا وإنْ قُتِلْتَ وحُرِّقْتَ).[٢]

---

(١) نوسەری بەڕێز نوسیوێتی: (صحيح البخاري ج٦- ص٢١٨، صحيح مسلم ج١ ص٢٣٠ ومابعدها). راستە: بوخاری (٥٩١٢)، موسلیم (٣٠٤٣).

(٢) نوسەری بەڕیز نوسیوێتی: (أخرجه أحمد – التوحيد- الدهلوي ل: ٥٤). راستە: ئیمامی ئەحمەد : المسند (٢١٥٠٣)، طەبەرانی لە: (الاوسط/ ٨١٧٢). شێخی ئەلبانی رحمەاللە لە (صحيح الترغيب والترهيب ٢٦٢/١)دا دەفەرموێ: حسن لغيره.

واتە: هاوبەش بۆ خوا بڕیارنەدەیت گەر بشکوژرێیت و بشسوتێنرێیت.

-ئیبنومەسعود - خوالێی ڕازی بێت -دەگێڕێتەوە: (سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ).(١)

واتە: عەرزی پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) کرد: کە چ گوناحێک لای خوای گەورە زۆر گەورەو دژوارە؟

فەرمووی: ئەوەیە کە هاوبەشی بۆ دابنێییت، لە کاتێکدا کە ئەو خەلقیکردوویت.

-ئەنەس - خوالێی ڕازی بێت -دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الْأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتَنِي لَا تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً).(٢)

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەرێ هۆ نەوەی ئادەم! ئەگەر بە قەدەر زەوی گوناحت کەڵەکە کردبێت و ئاوا بگەیتەوە لای من _ئەگەر هاوبەشت بۆم دانەنابێت_ بەقەدەر زەوییەکە بواری لێخۆشبوونت بۆ دەکەمەوە.

(١) نوسەری بەڕیز نوسیوێتی: (رواه البخاري ج٦ ص٢٢ ، صحيح مسلم ج٢ ل:٨٠). راستە: بوخاری (٤٢٠٧)، موسلیم (١٥٣).

(٢) نوسەری بەڕیز نوسیوێتی: (أخرجه الترمذي –التوحيد- الدهلوي ل:٥٧). راستە: ترمذی (٣٤٦٣) دەشفەرموێ: حسن صحيح. ئەلبانی رحمەاللە لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة/ ١٢٨)و (الروض النضير/٤٣٢)دا دەفەرموێ:سەحیحە.

## بڕگەی پێنجەم: تەوحید و سیستمی کۆمەڵگەی ئیسلامیی:

**خاڵی یەکەم: بۆچی ئیسلام ئەوەندە زۆر جەختی لە تەوحید (خوایەتی) کردۆتەوە؟**

لەوەندە دەقەی کە دەربارەی تەوحید هێنامانەوە دەردەکەوێت کە ئیسلام بایەخێکی زۆری پێداوە ،چونکە یەکەمین بنەمای عەقیدەی ئیسلامییە، کە بە لای ئیسلامەوە ئەوپەڕی گرنگی هەیەو زەرووریە ئاشکراو راشکاوو رۆشن لە ناخی مرۆڤدا بچەسپێت، تا بزانێت حەقیقەتی خوایەتی چییەو پەیوەندی نێوان خوای گەورەو مرۆڤ دەبێ چۆن و لەسەر چی دابمەزرێت؟

چونکە رۆشنبوونی ئەم دیدو تێڕوانینە ژیانبینییە پەیوەندیی جەوهەریی بە سروشتی سیستمی کۆمەڵایەتی ئیسلامەوە هەیە... دیدە ژیانبینییەکەو سیستمە کۆمەڵایەتییەکە لە ئیسلامدا لازم و مەلزومی یەکترین و ئەستەمە لێکدابڕێن.

کات و شوێن و بارودۆخ و حاڵەتی نەوەکان کاریگەرییان بەو سیفەتە لەسەریان نابێت، کە لێکیان جودابکەنەوە. سیستمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا تەکمیلەی دیدە عەقائیدییەکە نییە، نا، نەخێر، سیستمەکە بەرهەمی ژیانبینییە ئیسلامییەکەیە.

سیستمی کۆمەڵایەتی (کە حوکمیش بەشێکە لێی) لقێکە لە لێکدانەوە (تەفسیر)ی گەردوون و ژیان و مرۆڤ و ڕوونکردنەوەی جێ و رێ و ئەرک و رۆڵی مرۆڤ لە ژیانی دنیاییداو لەسەر زەمین، کەئەم مرۆڤە بۆچی بۆتە موفرەدەیەکی گەردوون و ژیان؟[1].

مادام حەقیقەتی تەوحید ـوەکو زانیمان ـ بریتیە لە تاقانەیی خوای گەورە

(١) خصائص التصور الاسلامي ل: ٢٧ـ٤٤.

لەخوایەتییـــدا، هەروەهـــا ئیعتیقـــادکردن و بڕیـــاردان و شـــاهێدییدان و مومارەسەکردنی عەبدێتیی بۆ خوای تاکوپاک.

دەبێ ئەوەش بـزانین کە قورئـان ئەو سـەرچاوە سـەرەکییەیە کە بنەماکـانی عەقیـدەکەی لێـوە وەردەگـرین.. ئەوە قورئـانە کە ئەو پەیوەنـدییە لە نێـوان داخوازییەکـانی عەقیـدەو ویـژدان و ڕێکخسـتنی ژیانـدا دروسـتدەکات.. لەو ژیـانبینییە عەقائیـدییەوەیە کە موسـوڵمان دەزانێـت گەردوون و ژیـان چیـیە؟ دەزانێت هەڵسوڕێنەری بەکارو تاکە کاریگەریی (وجود) کێـیە؟ ئـاوا ئەم هێـزە کاریگەرە، زیندووە، چاودێرە، دەناسێت، کە خوای گەورەیە.

ئینجـا هەمـوو لایەنەکـانی شـاراوەو ئاشـکرای ژیـانی تـاکوکۆی خـۆی و کـۆمەڵگەو دەوڵەتـی لەسـەر ئەو هەسـت بەئەرک کـردنەی عەبـدێتییەکەی دادەڕێژێت.. ئەم دیدە عەقائیدییەی بۆ دەبێتە زەمینەی داڕشتنی فیکـرو هەسـتی ئینیتما، بۆی دەبێتە ڕێسـای ڕەفتـارو ڕەوشـت و قیەمـی کـۆمەڵایەتی و بـزاوت وهەڵوێستی گۆڕانکاریی و دەستوورو سیستمی حوکم.. هەر وەکو کە لە نـاخی تاک تاکەکاندا بوو بە ئاڕاستەی پاڵفتەی دەڕوون و تەقواکاریی خواناسیی..

ئاوا ئەم عەقیدە دەبێتە ئاڕاستەوانی (عەقیدە) و (عیبادەت) و (شەریعەت).. وەکو کە دەبێتە ئاڕاستەوانی (مەنهەج) و (جەماعەت) و (بـانگەوازو بزاڤـی)ی ئوممەتە عەقائیدییەکە.

کاتێک ئەمە ڕۆشن و پاک لە ناخی تاکی مرۆڤ بە گشـتی و موسـوڵماندا بە تایبەتی دەسەلمێت و دەچەسپێت، دەبێتە ڕێڕەوی لوتکەی کـامڵبوونی مـرۆڤ، کە بە عەبدێتییەکەی بۆ خوای تاک وپاک دەبێت.. مانای کورت و پوختی ئەمە ئەوەیە کە تەنها لە ئیسلامدایە کە مرۆڤ _لەو کاتەی ژیانی دنیای دادەڕێژێت_ بۆ قیامەتیشی دەژی.

لەو کاتەی بۆدنیاشی دەژی بۆ خوای گەورەو قیامەتیشی کاردەکـات.. ئـاوا

دەگاتە ئەو لوتکەیەی دین دەیەوێت بێگاتێ: ئاوا هاوکێشەکە رادەگرێت: پارسەنگی کەسایەتی خواناسیی و رەنجدەری بەکاری ژیان و قیامەتخوازیی... ئاوا دەبێتە بریکاری خوای گەورە لەسەر زەمین.

گەیشتنە ئەم ئاستەی پەروەردەبوون زۆری ناوێت، بەڵام هەنگاوی ڕاست و دروستی یەکەمی دەوێت، کە مرۆڤ _وەکو عەبدێکی خواویست_ خواپەرستییەکان ئەنجامدات و _وەکو عەبدێکی سەرڕاست_ بزاوت و هەڵوێستی شەرعییانە بگرێتەبەر[1] .

**خاڵی دووەم: کاریگەریی تەوحید لەسەر تاک و کۆ:**

لەمەوە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە قورئانی پیرۆز کاتێک دیدو تێڕوانینێکی عەقائیدییمان دەربارەی خوایەتیی و عەبدێتیی و گەردوون و ژیان دەداتێ، ئەمە تیۆرێکی روتی مەعریفی نییە، کە لە زەینی مرۆڤدا وا بچەسپێت کە زانیارییەکەو قەناعەتی پێبکات و بەس..

نا ئەمەی بۆ دەکاتە حەقیقەتی عەقائیدیی و ناساندنی رێسای گەردوونیی، بەڵام بۆی دەکاتە زەمینەیەکی فیکریی (عەقائیدیی) کە دواتر دەستوورو ئەحکام و رێسای ئەخلاقیی و کۆمەڵایەتیی وئینسانیی لە ژیانی مرۆڤدا لەسەر بنیات دەنرێت.

زەمینە عەقائیدییەکە دەکاتە وزەپاڵنەری رەنجی رۆژانەی تاک وکۆی ئەو سەردەمەو بەرهەم و زاد و ئەزموونی نەوەکانی داهاتوو.

دیدو تێڕوانینە عەقائیدییەکەی ئیسلام دەبێتە سەرچاوەی وزەو گوڕوتین، بۆ پاڵنەرە دەڕوونیەکانی کارکردن (کە ئیمانیین). رەنجدان و بەرهەمهێنان بۆ ژیانی دنیاو ژیانی رۆژی دوایی.

(١) سەرچاوەی پێشوو ل: ١٣٠_٢٣٥ و دواتریی. هەروەها: ابن تيميه: العبودية ل:٨٢ و دواتریی.

بـۆیە ئەم زەمیـنە عەقائیـدییە، زەمیـنەی دارِشـتنی تـاکی پارسـەنگەو بـۆ کۆمەڵگەش زەمینەی دارِشتنی سیستمی حوکم و ئیدارەو ئاراستەوانییە.. لەبەر ئەمەیە کە دەووترێت: قورئان ئەوە نییە وا تەماشابکرێت کە سـەرچاوە باسـێکی نادیارو گەردوونەو مەبەست لێی دەستخسـتنی زانیـاریی مەعـریفیە دەربـارەی گەردوون و ژیانی دنیاو قیامەت.

واتە: کتێبێکی زانست بێـت بـۆ فێرکردنـی زانسـتیەکانی دیـن و بەس.. نـا، قورئان سەرچاوەی ئەو زانیارییانەی گەردوون و ژیان و نادیار (غەیبیـات)ە، کە مەبەست لە ژیان و وجودی مرۆڤ لەسەر زەمین ڕوون دەکاتەوە.. بەڵام قورئـان هەر ئەوەندە نییە بکرێتە سەرچاوەیەکی دیراساتی نادیـار (میتافیزیقیـا)، بەڵکـو قورئان ـ زۆر ئاشکراو راشکاو و رۆشن ـ ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لایەنی تیۆری عەقیدەکەی (تەوحیـد)، زەمیـنەی لایەنە کردەوەییەکـانی ئەحکـامی (شـەرع و یاساو رێسا)کانە..

پەیوەندی ئەم پێناسـە تیـۆرییەو لایەنە عەمەلیـیەکەی، پەیوەنـدیی لازم و مەلـزومێتییە بـۆ ئەحکامەشـەرعییەکان، کە تـاک وکـۆی کـۆمەڵگەو دەوڵەت ئاراسـتەدەکەن، هەمـوو لەروانـگە عەقائیـدییەکەوە هـاتوون.. لەسـەر ئەو دامەزراوە بەو سیفەتەی حەقیقەتی عەقائیدیی و رێسای وجودن.

ئەحکامەکـانیش بـۆ پراکتیزەکردنـی ئەو دیـدە عەقائیـدییە دارِێژراونـو ئاراستەی کۆمەڵگەو دەوڵەتـیش لە ئیسـلامدا بـۆ سـەلماندن و چەسـپاندنی ئەو حەقیقەتە عەقائیدییانەن..

بۆیە ئەحکامە فیقهییەکان و رێسادەستوورییە شەرعییەکان بـۆ حەقـیقەتە عەقیدەییەکان وەکو خانوویەکن، کە لەسەر بناغەی پـان و پـتەو بینـاکراون، کە لەژێر زەویدان، مەحـکەم خۆیـانگرتووە، کە ئەگەر دیـوارێکیش بڕوخێـت، یـان هەموو خانووەکە، بناغەکان هەر دەمێنن، تـا سـەر لە نـوێ خـانووەکەی لەسـەر دروستبکرێتەوە.. ئەحکامە شـەرعییەکانیش لەسـەر غەیـری ئەو بنەمـاو بنـاغە

عەقائیـدییانەی ئیسـلام دانـامەزرێن.. ئەو ئەحکامـانەی یاسـا _کە لەسـەر ئەو بنەماعەقائیدییانە دانامەزرێن_ لەئیسـلامدا بێـنرخ و مەرفـوزن... لەم روانـگەو هۆکارەوەیە کە موسوڵمان کاتێک بە ئەهلی تەوحید (مووەحید) حسێب دەکرێـت کە ئەحکـامە شـەرعییەکانی وەحـی لە ژیـانی تـاکوکۆی خـۆی و کـۆمەڵگەو دەوڵەتەکەیدا دەسەلمێنێت و دەچەسپێنێت[١].

قورئانی پیرۆز خۆی ئەمە راشکاوانە تەئکیددەکاتەوە، کە هەر کۆشکێک لەسەر عەقیدەی تەوحید دانەمەزرێت، بێ بناغەیەو لە تەونکاریی جاڵجاڵۆکە لاوازترە... دەفەرمووێ ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ۝٤١ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٤٢﴾ العنكبوت: ٤١ – ٤٢.

واتە: نمـوونەی ئەو کەسـانەی کە لەجیـاتی خـوای گەورەو خـوای تـرو

---

[١] د. فاروق دسوقي- مشكلة الحرية في الفكر السلامي الخالص ل:١٢_١٣.

_ لەم روانگەوەیە کە ئێمە بە سەد تەئکیید ئەو بۆچوونەی دکتۆر شەفیق شەحاتە رەفـزدەکەینەوە کە لە دکتۆرانامەکەیـدا (کە بە ناونیشـانی: النظريـة العامـة للالتزامـات في الشريـعة الاسـلامية نوسیوێتی) کە دەڵـێ: (لە دیراسـاتی بابەتییـانەدا لا نـاکرێتەوە بەلای سـەرچاوەکانی شـەریعەتی ئیسلامدا، چونکە قورئانی پیرۆز چەند ئایەتێکی کەمی دەربارەی پابەندبوون (ئیلتیزامات) تێدایە. قورئان بە شێوەیەکی گشتی رێسای ئەخلاقییە..) پاشان دەڵێ: (دەبینرێت کە شەریعەتی ئیسلامی لە بابەتی ئیلتیزاماتدا شێوازە دینییەکەی بزردەکات)..

پاشان بە هەمان شێوە قسە لەسەر سەرچاوەکانی تری شـەریعەتی ئیسـلام دەکـات.. کە دیـارە قسـەکانی نە بەڵگەیـان لەسـەرەو نە زانسـتیانەن و نە وردەکـاریی بەحسـیان پێـوەیە. هەر لێکۆڵینەوەو نوسینێکی کۆمەڵایەتیی کە لەسەر ئیسلام بنوسرێت و ئیعتیمادنەکاتە سەر قورئان و سوننەت، حەتمەن حەقـیقەت عەکـس ناکـاتەوەو نوقسـان دەبێـت. ناشـبێتە ئەوەی کە بۆچـوونی راسـتی ئیسـلامەکە نیشـان بـدات.. بـڕوانە پێشـەکی دکتـۆرانەمەکەی لە چـاپی ١٩٣٦ز ب١ ل: ٦٤_٦٥.

سەرپەرشتیارو ئاراستەوانی تریان گرتووە _ئەگەر بزانن_ وەکو جاڵجاڵۆکەن، کە هەر خەریکی تەنینی ماڵەکەیەتی، ماڵەکەشی لاوازترین ماڵی مەخلووقە، کە (نە گەرماو نە سەرما دەگێڕێتەوەو نەدەبێتە مایەی خۆشاردنەوەو پاراستنیی و بە پوشکەیەکیش هەمووی لوولدەبێت و رەنجەکەی بەفیڕۆدەچێت!) خوای گەورە ئاگای لە هاناو هاواربۆبردنی موشریکانە بۆ بتەکانیان، کە ئەوەندە گێلن دەخوازن غەیری خوا بەهانایانەوەبێت..

خوای گەورە دەسەڵاتداری رەهای موڵکی خۆیەتی.. کە هەموو وجودەو دانایە لە ئیدارەدانی هەموواندا.

ئەمە ئەو ژیانینیی و جیهانبینییە ڕاست و رۆشنەیە وکە (ئیمامی ئەبویوسف) لێی حاڵی بووبوو، کە بە خەلیفە (هارونە رەشید)ی فەرموو: (هەر خانوویەک لەسەر غەیری تەقوا بیناکرابێت، حەتمەن خوای گەورە شتێکی بەسەردا دەهێنێت، کە بەسەر بیناسازەکەیدا دەڕوخێنێت و هەموو ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە کرێکاری بەردەستی وەستاو نەخشەوان و خاوەنەکەی بوون، جەنابیشت نەکەی رەعیەتەکە بفەوتێنیت لە مافیاندا، کە خوای گەورە خستوێتیە بەردەستت.. هەر هێزێکیش کە کردەوەی پێهەڵدەسوڕێت، هەر بەئیزنی خوا دەبێت)[1].

تەوحید لە دیدو تێڕوانینی ئیسلامییدا لە ڕاستیی و ژیانی واقیعییدا رزگارکردنی مرۆڤە.

بەمانایەکی تر، لەدایکبوونەوەی مرۆڤە ،چونکە سەلماندن و چەسپاندنی خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتیی مرۆڤە بۆی.

خوایەتی خوای گەورە ئەوە فەرزدەکات، کە نابێت مرۆڤ یاساو رێسای

[1] أبويوسف: الخراج ل:٣.

ڕێکخستنی ژیانی تاک وکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەتیان لە غەیری خوای گەورەوە وەربگرن، هەر وەکو کە نابێت لە پەرستندا ڕوو لە غەیری خوای گەورە بکەن (و هەر وەکو کە نابێت وا بزانن لەگەڵ خوای گەورەدا یان بەجیا، کاریگەرێکیتر لەسەر خەلقکردن و ڕۆزیدان و مراندن و زیندووکردنەوە هەیە)، ئاوا تەوحید دەسەلمێت، کە دەسەڵاتەکانی (خاوەنێتی کردگارێتی + خوایەتیی و پەرستن + یاساو ڕێسادارشتن) بۆ خوای گەورە دەبێت و بەس...

بڕیاردان لەسەر ئەمە سەلماندن و چەسپاندنی (اشهد ان لا اله الا الله)کەیە، کەس بۆی نییە دەسەڵاتی خوای گەورە لەم سێ بوارەدا: (پەروەردگارێتیی و پەرستن و یاساو ڕێسادانان) بۆ خۆی، یان بۆ یەکێکی تر زەوت بکات، موسوڵمان بۆی نییە لە هیچ بوارێکیاندا پێچەوانەکارانە ڕەفتاربنوێنێت.

کافریش بۆی نییە سنووربەزێنێت و داخڵی سنووری ئەو سێ بوارەی دەسەڵاتی خوایەتیی ببێت.. خوای دەسەڵاتدار حەقی فەرمووە، کە دەفەرمووێ؛ ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾﴾ الشورى: ٢١.

واتە: بەڵام وا دیارە هاوبەشیان هەیە کە بۆ خوای گەورەیان داناون، تا یاساو ڕێساو ئەحکامی دین (بەرنامەی ژیان)یان - پێچەوانە بە فەرمانی خوای گەورە- بۆ دابڕێژن.

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ الحشر: ٧.

واتە: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێتان رادەگەێنێت بیگرنەبەرو ئەوەی بەرهەڵستیتان دەکات لێی، توخنی مەکەون.. ئاوا لەم ڕوانگە عەقائیدییەوەیە، کە دارشتن و جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی شەرع لە

سیستمەکانی حوکم و ئابووریی و یاساجینائی و مەدەنییەکان و ئەحکامەکانی خێزان و ئەحکامی لایەنەکانی تری رێکخستنی ژیانی تاک وکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەت بە (عیبادەت) هەژمار دەکرێت و، دەبێتە سیماو سیفەتی نواندنی (عەبدێتیی)ەکەی مرۆڤ بۆ خوای گەورە..

ئەم رەفتارو بڕیارانە، ئەم بزاوت و هەڵوێستانە، ئەم چالاکیانە، سیماو سیفەتی خواپەرستیی (عیبادەت) و (عەبدێتیی بۆ خوای گەورە) وەرناگرن تا ئەو کاتەی ئەو دوو مەرجەیان تێدا دێتەدیی، کە ئیسلام داوایاندەکات : لەبەرخاتری خوای گەورە ئەنجامدرابن و بەپێی شەرع بووبن، واتە: بەپێی قورئان وسوننەت.

کاتێک رەفتارێک (گوفتارو کردارو بڕیار)ی تاک یان کۆی موسوڵمان بەو دوو مەرجە ئەنجامدەدرێت، دەسەلمێت و دەچەسپێت: کە رەفتارێکە بەپێی (مەنهەج)ی خوای گەورە ئەنجامدراوە... رەفتارێ ،کە خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتیی مرۆڤی تێدا هاتۆتەدیی... رەفتارێکە ئیعتیرافی بە خوایەتی خوای گەورە تێدا کراوە... ئەمەش مەبەستەکەیە لە خەلقکردنی مرۆڤ و ناردنی بۆ سەرزەمین و ناردنی وەحی خوایی بۆی.. ئەگەر وا نەبوو، ئەوە رەفتاری ناشەرعییەو چوونەدەرەوەیە لە دین و مەنهەجی خوای گەورە .

***رەخنەیەک و وەڵامدانەوەی:**

لەم سەردەمەدا دەبینین ئەم دیدو بۆچوونە _کە هەموو رەفتارو بڕیارو هەموو چالاکییەکی بەشەریی و هەموو سیستمێکی حوکمڕانی بە عەقیدەکەوە پەیوەستدەکاتەوە، واتە: دین وسیاسەت پێکەوە دەبینێت و لەو باوەڕەدایە: کە سیاسەت بەشێکە لە ئاراستەی دینەکە_ ئەم دیدو بۆچوونە لەم سەردەمەدا وەکو مامۆستا (محمد ئەسەد) دەڵێ: لای ئەو موسوڵمانانە قبووڵ نییە کە رۆشنبیریی رۆژئاواییان وەرگرتووە (غەرب زەدەکان) کە لەسەر ئەو دیدو بۆچوونە

فەلسەفیە گۆشبوون کە دەڵێ: دین لە سیاسەت جودایەو هەر یەکەیان مەیدان و چالاکی سەربەخۆ دەخوازن و نابێت تێکەڵبکرێن.

ئەمە لە دیدو روانگەی عەقائیدیی ئیسلامەوە _کە لە قورئان و سوننەتەوە هاتووە_ مەحاڵە ،چونکە لە ئیسلامدا شتی وا نییە.

جوێکردنەوەی سیاسەت لە دین نەشیاوە،ئەستەمە کەسێک ئیسلامیی بە ڕاست ناسیبێت و خۆی بە موسوڵمان دابنێت، شتی وا قبووڵبکات. هەر کەسێک ئیسلامیی خوێندبێت _ئەگەرچی بڕێکی کەمیش بووبێت_ لەوە گەیشتووە، کە ئیسلام هەر ئەوەندە نییە کە پەیوەندییەکی رەفتارانەی نێوان خوای گەورەو عەبدەکەی بێت، کە داوای پارسەنگی رەوشتی لێدەکات و بەس.

ئیسلام هەر ئەوەندەنییە، ئیسلام دیدو تێڕوانینێکی عەقائیدییە، کە ئەحکامی ئاڕاستەکردنی رەفتاری تاک وکۆ کۆمەڵگەو دەوڵەتی لێوە هەڵهێنجراوەو موسوڵمان بۆی نییە وەرینەگرێت و نەیچەسپێنێت ،چونکە ئەوە لە داخوازیەکانی موسوڵمانێتیەکەیە،دەبێ موسوڵمان هەر وەکو کە بە عەقیدەکەوە پابەنددەبێت، بە ئەحکامەکانیشەوە دەبێ پابەندبێت.

خوای گەورە ڕاست و دروست و رەوای فەرموە، کە دەفەرمووێ:

-﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ المائدة: ٤٤ .

واتە: هەر کەسێک حوکمڕانیی و داوەریی بەوە نەکات، کە خوای گەورە ناردوێتیە خوارەوە بە تەئکید ئەوانە کافرن.

-﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾ المائدة: ٤٥.

هەر کەسێک حوکمڕانیی و داوەریی بەوە نەکات کە خوای گەورە ناردوێتیە خوارەوە، بە تەئکید ئەوانە ستەمکارو سنووربەزێنن.

-﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾ المائدة: ٤٧ .

هەر کەسێک حوکمڕانیی و داوەریی بەوە نەکات کە خوای گەورە ناردوێتیە خوارەوە، بەڕاستی ئەوانە گوناحکارو مونحەریفن[1].

---

(١) هەندێک لە ئەهلی تەفسیر هەوڵیانداوە حوکمی ئەم ئایەتانە لە ئەهلی کیتابدا گیربدەن، بەڵام ئەم فەرمایشتانەی خوای گەورە ،ئەم لێکدانەوەیە ناگرنەخۆ.

باشترین رەتکردنەوەی ئەمە، بە بۆچوونەکەی سەیدنا حوذەیفە دەبێت -خوا لێی رازی بێت- کە کابرایەک پێیوت: ئەم ئایەتانە تایبەتن بە بەنوئیسرائیلییەکانەوە. (واتە: ئەو بەنوئیسرائیلییەی حوکم و داوەریی بەوە نەکات کە خوای گەورە ناردوێتییە خوارەوە، کافرو زاڵم و فاسقە).

سەیدنا حوذەیفە- خوا لێی رازی بێت- وەڵامیدایەوەو فەرمووی: (نِعْمُ الإِخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيلَ، إِنْ كَانَتْ لَهُمْ كُلُّ مُرَّةٍ , وَلَكُمْ كُلُّ حُلْوَةٍ ، كَلا وَاللَّهِ لَتَسْلُكُنَّ طَرِيقَهُمْ قَدَّ الشِّرَاكِ.............بەڕاستی ئێوە باشترین برای بەنوئیسرائیلییەکانن، هەرچی تاڵ بوو بۆ ئەوان بێت و هەرچی شیرین بوو بۆ خۆتان. نەخێر، بە خوا قەسەم وا نییە، واش دیارە کە هەنگاو بە هەنگاو شوێنپێی ئەوان هەڵدەگرنەوە. ) عبدالرزاق لە تەفسیرەکەیدا (١٩١/١) هێناویەتەیەوە، هەروەها محمەدی کوڕی نەصری مروزیی لە: (السنة/٦٥)و حاکم لە: (المستدرک ٣٤٢/٢) و سیوطی لە: (الدر المنثور ٨٨/٣). حاکم فەرموویەتی: (هذا حدیث صحیح علی شرط الشیخین ولم یخرجاه).

_ مەبدەئی سەرەکی حاکمێتی خوای گەورە _کە قورئان بە زۆر شێوە جەختی لێدەکاتەوە_ ئەوەیە کە تۆ هەر کەسێکت بە حاکمی رەها (دەسەڵاتداری بێسنوور) وەرگرت، ئەوە طاغووتەو لە مەنزیلەی خوای گەورەدا داتناوە. ئەمە پێچەوانەی عەبدێتییکردنە بۆ خوای گەورە.

طاغو ت لە زمانی عەرەبییدا بەوە دەڵێن :کە لە سنووری شەرع دەرچووبێت. بە واتا قورئانییەکە: بریتییە لەوەی: لە سنووری عەبدێتیی دەربچێت و پاڵانتەی مافی خوایەتیی و سەروەریی و دەسەڵاتی بێسنووریی لێبدات و عەبدەکانی خوای گەورە بکات بە بەردەستەو عەبدانی خۆی..

خوای گەورە داوای لە موسوڵمان کردووە کە باوەڕی بە طاغووت نەبێت و شوێنی نەکەوێت و بە کافری دابنێت: (فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) البقرة/٢٥٦.

←

-﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾ المائدة: ٤٩ – ٥٠.

واتە: داوەریـــی نێوانیـــان _بەوەی کە خـــوای گەورە بـــۆی نـــاردوویەتە خوارەوە_ بـکەو شـوێن هەواوهەوەسـی ئەوان مەکەوەو هۆشـت لە خـۆت بێـت راتنەکێشنە سەر دیدو راو حەزو ئارەزووی خۆیان و لە هەندێک بڕگەو ئەحکـام و فەرمـانی خـوای گەورەت دووربـخەنەوە ،چـونکە لەدینداریتیـدا تووشـی کارەسات دێیت.

ئەگەر پشتیان تێکردیت و گوێیان بە فەرمانی خوای گەورەوحوکمی نەدا، لەوە دڵنیابە کە خوای گەورە سـەرەنجامی گوناحکـاریی خۆیـان، هەر لە دنیـادا سزایان دەدات، بەوەی تووشی کێشەیان دەکات.

بشزانە کە زۆرینەی خەڵکی حەزیـان لە گوناحکـاریی و لەدیـن لادانە، چـا ئەوانە حـوکمی جـاهیلییەت دەخـوازن؟ دەیانەوێـت بە بڕیارەکـانی جـاهیلییەت داوەریی بکرێن؟!

جا کێ حوکمی لە ئەحکامی خوای گەورە جـوانترو ڕاسـت و ڕەواتـرە؟ لای کەسانێک کە خاوەن یەقینن و دڵنیان لە وەحی و ئەحکامەکانی، دڵنیان لە رۆژی قیامەت و بەرپرسێتییەکەی.

_ أبوالأعلى المودودي- الحكومة الاسلامية - تعريب: أحمد إدريس – چـاپی المختـار الإسـلامي/ قاهیرە. چاپی یەکەم ١٣٩٧ک ١٩٧٧ز ل:٧٣.

*<u>**بەدوادا چوونێک:**</u>

ئەو پەیوەندییە سروشتییەی وا لە نێوان بنەما عەقائیدییەکان و سروشتی سیستمی کۆمەڵایەتی (حوکم)دا، پێویستە لای موسوڵمان بەڵگەنەویست بێت ،چونکە هەر وەکو چۆن تەسەور ناکرێت کۆشکێکی بەرزی چەندەها نهۆمیی پانوپۆڕ بە بێ بناغەیەکی ساغ و پتەو دابمەزرێت، بەهەمان شێوەش ناشێت تەسەوربکرێت، کە سیستمەکانی حوکم و رێکخستنی ژیانی تاک وکۆی کۆمەڵگەی (موسوڵمان) بە بێ چەسپاندنی مەحکەمیی حەقیقەتە عەقائیدییەکان دادەمەزرێت..

ئەمە مەحاڵە.. ئەم رێسایە کرۆکی عەقائیدە ئیسلامییەکەیە، بنەمای سەرەکیی و سەرەتایی هەرەگرنگی تەوحیدەکەیە، واتە: بناغەی باوەڕهێنانە بە خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی هەموو هەبوو (مەوجود)ێکی تری غەیری خوای گەورە.

ئەمە زۆرەملێ نییە، ئەمە سەدان بەڵگەی قورئانی لەسەرە، کە ئاوا نەبێت نە عەقیدەکە بەساغ و ڕاست و دروستی دادەمەزرێت و نە سیستمەکانی حوکمڕانیی و چەسپاندنی ئەحکامەکانی شەرعیش دێنەدیی... بۆ زیاتر جەختلێکردنەوەی ئەم حەقیقەتە ئەم بەڵگەنەویستانە دەخەینە بەرچاوان:
١-خوای گەورە هیچ نییەت و گوفتارو کردارێک لە موسوڵمان قبووڵناکات ئەگەر لە روانگەی عەقیدەکەوە ئەنجامنەدرابێت:﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ١٠﴾ فاطر: ١٠ .

واتە: ئەو کەسەی کە دەسەڵات و سەرفرازیی دەوێت با بزانێت کە هەموو جورێکی هێزو سەرفرازیی هی خوای گەورەیەو لەوەوە بۆ عەبدە پیاوچاکەکانی

دێــت... وشـــەی پــاک _کە شـــاهێدیی حەقە (لااله الاالــله)_ بــۆ لای ئەو بەرزدەبێتەوە.

هەروەها داخوازییەکانی شایەتمان کە دەهێنرێنەدیــی، خــوای گەورە هەمــوو کردەوەیەکی چاک بە پاداشتێکی چاکتر رووبەڕوودەکاتەوە.

ئەمما ئەوانەی کە پیلانی خراپەکاریی دادەڕێژن (کە لە داروالندوە سەرانی قوڕەش بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا (صلی اللـه علیـه وسـلم) کۆدەبـوونەوە)و نەخشەی خراپەکاریی دادەڕێژن، ئەوانە سزای سەختیان دەبێت و سەرەنجام پلان و نەخشەکانیان هەڵدەوەشێتەوەو، تێیدا ناگەنە ئەنجامی ناڕەوایان.

-﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ ﴾ لقمان: ٢٢ .

واتە: هەر کەسێک سەرڕاستانە ڕووی لە خوای گەورە کردبێت و نیـیەت و ڕەفتـاری بـۆ خـوای گەورە سـاغکردبێتەوە، لە کاتێکـدا کە خوابەیەکناسـەو تەوحیدی جێگیرە، ئەوە بەدڵنیاییەوە لەوانەیە، کە دەسـتیان بە دینـەکەی خـواوە گرتووە، کە جەمسەری ئەوسەری بەدەسـت خـوای تاکوپـاکەوەیە، ئیـتر خەمـی پسان و کەوتن و نەگەیشـتنیان نەبێـت.. ئەنجـامی هەمـوو کاروبـارێکیش هەر دەگەڕێتەوە لای خوای گەورە.

٢-تەوحیـد بنـاغە پـتەوەکەیە کە کـۆمەڵگەی موسـوڵمانی لەسـەر دەوەسـتێت، غەیری ئەو بناغەیە فشەڵ و کەندەڵانەو مایە داڕمانە: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ ﴾ العنكبوت: ٤١ – ٤٢ .

واتە: نمـوونەی ئەو کەسـانەی کە غەیـری خـوای گەورەیـان کـردووە بە سەرپەرشتیارو خەمخۆری خۆیان وەکو جاڵجاڵۆکەن، کە هەر خەریکی تەنینـی ماڵێکە. ماڵی جاڵجاڵۆکەش لە هەموو ماڵیک لاوازتـرە، ئەگەر پەی پـێ بـبەن و بـزانن. خـوای گەورە ئاگـادارە بەوەی کە لە غەیـری خـوای گەورە خـۆی هانـاو هاواری بۆدەبەن، دەزانێت کە لە هـیچ شـتێکدا دادیـان نـادەن.. خـوای گەورە بە دەسەڵات و دانایە.

٣- دیدو رێی تەوحید، ڕێبازی هیدایەتی خواییەو ئەنجامەکەشی سەرفرازییە: ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾﴾ یونس: ٣٥ – ٣٦ .

واتە: پێیان بفەرموو: ئایا لەو خوا قەسـتینانەی _کە کردوتـانن بە هاوبەشـی خــوای گەورە_ تێیانــدا هەیە رێنمایــی کەس بکــات و حەقــی نیشــان بــدات؟ (بێگومان تێیاندا نییە ،چونکە ئەوەیان لە تواناندا نییە).

دەی باشە ئەوی هیدایەت دەدات و رێی حەق دەناسێنێت، شایانترە شـوێنی بکەون، یان ئەوەی هیدایەت نـادات و حەقەکەش ناناسـێت، بگـرە دەبێـت خـۆی هیدایەت بدرێت؟! ئەرێ ئەوە ئێوە چۆن و چ بڕیارێک دەدەن؟!

زۆرینەیــان هەر شــوێن مەزنــدەو خەمڵانــدن کەوتــوون، مەزنــدەکاریی و خەمڵاندنیش حەق ناپێکێت و هیچ شتێکی حەق ناناسێنێت،خوای گەورە ئاگـای لە کاروکردەوەکانیانەو دەزانێت.

٤-ئەم تەوحیدە سیماو سنووری جوێکەرەوەی نێوان حەق و باتڵە: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾﴾ لقمان: ٣٠ و ﴿

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٦٢﴾ الحج: ٦٢ .

**واته: ئەوە لە بەرئەوەیە کە خوای گەورە حەقەو ئەوانەی لەجیاتی ئەو هاناو هاواریان بۆ دەبەن و بە خوایان دادەنێن باتڵن... خوای گەورە باڵا دەستەو مەزنە.**

**سەلماندن و چەسپاندنی ئەم بنەما عەقائیدییانە لە ژیانی تایبەتی، تاکو ژیانی کۆی گشتی کۆمەڵگەو دەوڵەتماندا ئەوەیە، کە عەقیدەکە ئاڕاستەی هەموو رەفتارێکمان بکات و هەموو یاساو رێساو سیستمێکی حوکم و ئیدارەو ئاڕاستەی کۆمەڵگەو دەوڵەتمان، لە شەریعەتی خوای گەورەوە وەرگیرابێت و بەس.**

**ئەو کەسەی دەسەڵاتدارەو ئەوە ناکات، یان داوەرەو بە پێ شەرع داوەریناکات، یان یاساو رێسای تر دەهێنێتە شوێنی شەرع، بە تەئکید لە ئیسلام و ئوممەتەکەی بەدەرە:**﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٤﴾ المائدة: ٤٤ ﴿هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٤٥﴾ المائدة: ٤٥ ﴿هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤٧﴾ المائدة: ٤٧.

**سەلماندنو چەسپاندنی هەموو ئەمە بەوە دەبێت، کە رێساکانی سیستمی سیاسی ئیسلامیی بخرێتەکار، لە دادپەروەریی و شوراو ئازادیی و یەکسانی و... هتد، کە بە داڕشتنی هەموو یاساو رێسایەک دەبێت، کە شەرعی پێ بچەسپێنرێت.**

**ئەوەش بە دامەزراندنی دامودەزگای شەرعیی و داڕشتنی تەعلیماتی شەرعیی و جێبەجێکردنی سەرڕاستانە دێتەدیی... کە لەژێر چاودێریی ئوممەتەکەدا دەبێت و ئوممەت ناهێڵێت ئینحیرافاتی تێدا بکرێت.**

## باسی سێیەم

## مرۆڤ و بریکاریی خوای گەورە لەسەر زەمین

**ڕێڕەو:**

بیرۆکەی بریکاریی مرۆڤ (الخلافە) بۆ خوای پەروەردگار، یەکێکە لە پایەسەرەکییە گرنگەکانی دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی، کە ئیسلامییان لەسەر وەستاوە..

گرنگی ئەم بیرۆکە لەوەدایە: کە پەیوەندی ڕاستەوخۆو تونددوتۆڵی بەو ئامانجە گشتییانەوە هەیە کە ئەم دینە بۆ هێنانەدییان هاتووە... ئەم دینە بۆ ئەوە هاتووە: کە ئوممەتێکی تایبەتی جودا بە خواویستی پێک بهێنێت، کە لە ئوممەتانی تر جوادایە، بەڵام هەر بەشەرییە، ئەرکی ئاڕاستەوانێتیی و ڕێبەرێتیی مرۆڤایەتیی خراوەتە ئەستۆ، بەوەی کە مەنهەجی خوای گەورە لە واقیعی مرۆڤایەتیی یدا دەچەسپێنێت.

سەرەتا دینەکە ئەو کۆمەڵگە مرۆڤایەتییە لە گومڕایی دەردەهێنێت کە دەستی دەیانگاتێ، لە دیدی لێڵ و ڕێی وێڵ و لە داب ونەریتی جاهیلیی و لە دەستورو حوکمی جاهیلیی قوتاریان دەکات.

ئێستاش ڕۆڵی دینەکە هەر ئەمەیە کە مرۆڤایەتیی ئێستا قوتاربکاتەوە لەو هەموو خراپەکارییەی کوفروشیرک و جاهیلییەت بۆی دروستکردووە.. لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتییدا هەر وابووەو هەر واش دەمێنێت، تا ئەو کاتەی ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتیی دەبێتە مەنهەجی ئاڕاستەی تاک وکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەت و شارستانیەت.

پەی بردنی موسوڵمان بەم رۆڵ و ئەرکەی ئەم دینە، بۆی ڕوونکـردۆتەوە کە بریکاریی خوای گەورە لەسـەر زەمینـدا _کە ئەو رزگـارکردنەی مرۆڤـایەتیی و ئاڕاستەکردنەیەتی_ درککردنی بەمەو رەفتارکردن بۆ گەشەو نەشـونمای تـاک و کۆی ئوممەتێکی یەکخوانـاس، کـاریگەرییەکی گەورەی لە داڕشـتنی تـاک و کـــۆی ئەو ئـــوممەتە خواویســـتەدا هەیە، کە هەر لە یەکەم هەنگـــاوی شایەتمانهێنانیەوە هەست بە بەرپرسێتی ئەو بریکـارییە دەکـات و دەزانێـت کە دەبێ بە مەنهەجی خوا ویسـتیی ئیسـلام پەروەردەبێـت، تـا بگـاتە ئەو ئاسـتەی بتوانێت رزگارکردنی مرۆڤایەتیی و رێبەرێتییکردنی بگرێتەئەستۆ.

لەم هەست و هـۆش و پەیپێـبردنەوە، وەدەردەکەوێـت: کە دیـدو تێـڕوانییە عەقائیدییەکەی ئیسلام ،ئامێرو ئالییەتی ئاڕاستەکردنێکی زۆر گەورەو گرنـگ، هەم بۆ ئامادەسازیی تـاک وکـۆی ئـوممەتەکەی تەوحیـد، هەم بـۆ پێکەوەنـانی کۆمەڵگەی تەوحیدیی و دامەزراندنی دەوڵەتی تەوحیدیی، تا ئاوا تـاک وکـوی کـۆمەڵگەو دەوڵەتە (موەحیـد)ە کە، ئەو ئەرکە خـوا ویسـتییە بهێننەدیـی کە رزگارکردن و ئاڕاستەکردنی مرۆڤایەتییە.

ئەمە زەمینەی عەقائیدیی تێگەیشتنی ئەرک و رۆڵی بریکـارییەکەیە.. کە حەقیقەتە عەقائیدییەکان زیاتر ڕوونیدەکەنەوە، تـا وای لێـدێت لە دیـدو زەینـی تاکوکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەتەکە دەبێتە بزاوت و هەڵوێستێکی گەردوونیی.

هەموو هەستدەکەن کە بزاوت و چالاکی بانگەوازی خواویستیی _کە بە پێی ئاڕاستەی قورئان وسوننەتە_ وەکو بـزاوت و چـالاکی ئەسـتێرەکانی گەردوونە، کە بە پێـــی یاساورێســـای گەردوونـــی خۆیـــان دەبـــزوێن، کە خـــوای گەورە دروستیکردوون و هەڵیاندەسوڕێنێت لەسەریی:

خوای گەورە بۆ ئەوەی تاک وکۆی ئەم ئوممەتەو وزەو توانای کـۆمەڵگەو

دەوڵەتە تەوحیدییەکە بۆ ئەو ئامانجە گەورەیە بخاتەگەڕ، کۆمەڵێک حەقیقەتی عەقائیدیی (غەیبـی)یـان بـۆ ڕوونـدەکاتەوە، کە مـاهییەتی مـرۆڤ و مەبەسـت لەبوون و هاتنەسەرزەویی و ئامانجی لێی، بۆ ڕووندەکاتەوە[1].

**بڕگەی یەکەم:**
**هەبوونی مرۆڤ پێش خەلقبوونە بەشەرێتییەکەیەتی:**

قورئان و سوننەت ئەوە ڕوون دەکەنەوە: کە مرۆڤ (وجود)ێکی تری پێش خەلقبوونە بەشەرێتییەکەی هەبوو، پێشئەوەی خوای گەورە ئادەمی باوکی مرۆڤایەتیی (علیه السلام)خەلقبکات و بینێرێتە سەرزەمین، لە (وجود)ێکی تردا هەموو نەوەکانی ئادەمی کۆکردەوە.

دیارە لە چۆنیەتییەک، کە لەم چۆنییەتی خەلقکردنەی ئێستای مرۆڤ جیاوازبوو، کە پێوەی هاتەسەرزەمین... ئاماژە بەمەیە: کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ البقرة: ٢٨ .

واتە: چۆن دەشێت باوەڕ بە خوای گەورە نەهێنن و کافربن، لە کاتێکدا ئێوە مردووبوون و زیندووی کردنەوە، پاشان دەتانمرێنێت و پاشان زیندووتان دەکاتەوەو بۆ لای خوای گەورە خۆی دەگەڕێنەوە؟!

هەر ئەم مانایەشە کە لە ئایەتی یازدەی سوورەتی (غافر)دایە کە دەفەرمووێ: ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾﴾ غافر: ١١ .

---

(١) خصائص التصور الاسلامي ل:٦، هەروەها مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ١٣.

واتە: کافرەکان لە رۆژی دواییدا دەڵێن: خوایە! دووجارت مراندین و دووجارت زیندووکردینەوە.. خوایە! دانمان بەگوناحی خۆماندانا، کە گوناحبارو تاوانبارین، بەڵام ئایا رێگاچارەیەکمان هەیە، کە لەم سزایەی دۆزەخ قوتاربین و بگەڕێینەوە بۆ دنیا تا سەرڕاستانە دینداریی بکەین؟!

ئایەتەکان بەڵگەن لەسەر هەبوونی دوومردن و دووژیان بۆ مرۆڤ... مـردن خۆی لەخۆیـدا (وجـود)ە ،چـونکە چـۆنییەتییەکی هەبـوونی مـرۆڤە لە قۆنـاغی (وجود)ێکدا، کە رۆح لە جەستە مـاددییەکەی جودابـووە... لەم قۆنـاغی وجـودە پێشینەی مرۆڤدا چەندین کارو کارلێککردنی خەلقیـی ڕوویـدا، تـا مـاهییەت و کەینوونەتێکی وای بۆ بسازێت، کە لەگەڵ ژیانی سەرزەمینییدا بگونجێت، ئاوا بوو بەم شێوە مرۆڤەی هەمووومان دەیبینین و هەستیپێدەکەین.

لەم قۆناغەبوونەی پێش خەلقبوونی بەشەرێتیی و ئینسـانییەتییەکەیدا (بـا بڵێین: لە جیهانی گیاندا) خوای گەورە سـێ رەفتـاری وەلـدا نوانـد: نیشـاندانی هەڵگرتنی بەرپرسـێتی راسـپاردە (ئەمـانەت)ە خـواییەکە، شـاهێدیدانی لەسـەر خوایەتی خوای گەورە، و تەعینکردنی بەبریکار لەسەرزەمین .

**خاڵی یەکەم: ئەو راسپاردە (ئەمانەت)ە خواییەی کە بە مرۆڤ درا:**

- خـوای گەورە ئەوە بـاس دەفەرمـووێ: کە ئەمـانەتێکی نیشـان ئاسـمانەکان و زەمین و چیاکاندا، کە یەکێکیان هەڵگرتن و پاراستنی بگرنەئەسـتۆ، بەڵام ئەوان داوای لێبـوردن و بواردنیـان کـرد لێـی. ئیـتر مـرۆڤ گرتیەئەسـتۆ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾﴾ الأحزاب: ٧٢ .

واتە: ئێمە راسپاردەکەمان خستە بەردەست ئاسمانەکان و زەمـین و چیاکـان، بەڵام نەیانوێرا شانی بدەنەبەرو ترسان لە بەرپرسـێتیە گەورەکەی، ئیـتر مـرۆڤ

گرتیەئەستۆی خۆی، بەڕاستی مرۆڤیش ستەمکاری نەفسی خۆیەتی و نەفامە.

تەفسیرەوانان لە واتای (الامانة)ی ئەم ئایەتەدا راجوێبوون، کە ئایا ئەو ئەمانەتە چییە کە ئاسمانەکان و زەمین و چیا پێیانهەڵنەگیراوەو داوایانکردووە نەخرێتە ئەستۆیان؟!

لەوانەیە ئەو ئەنجامە (استنتاج)ەی (دکتۆر فاروق دەسوقی) پێیگەیشتووە، نزیکتربێت لە مەبەستی راسپاردەکە... (دکتۆر فاروق) دوای ئەوەی راو بۆچوونی زانایانی تەفسیری هێناوەتەوەو موناقەشەی کردوون، دەڵێ[1]: ئەو ئەمانەتە فووکردنە خواییە (النفخة الالهية)کەیە، کە خوای گەورە رۆحی بەبەر هەموو مرۆڤێکدا کرد پێی، کە دەفەرمووێ: ﴿ إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ٧١ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٧٢ ﴾ص: ٧١ – ٧٢ .

واتە: خوای پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو: کە من مرۆڤێک لە قوڕ درووست دەکەم، کە شیاوم کردو لە رۆحی خۆم فووم پێداکرد، هەموو بۆی بچنە کڕنووش..

هەروەها سوورەتی **الحجر/٢٨-٣١**: ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٢٨ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٢٩ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ٣٠ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ٣١ ﴾ الحجر: ٢٨ – ٣١ و سوورەتی **السجدة/٧-٩** : ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ٧ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ٨ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ٩ ﴾ السجدة: ٧ – ٩.

(١) د، فاروق دسوقي: مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ١٦_١٧.

ئەم ئایەتانە دەیسەلمێنن :کە هەر تاکە مرۆڤێک و فوویەکی پشکی خۆی لە ڕۆحی خوای گەورە بە بەرداکراوە، مەبەست لەم فووکردنە بەبەر مرۆڤدا: تەنها فووکردنی ڕۆح بەبەرداکردنی مرۆڤی یەکەم سەیدنا ئادەم (علیه السلام)نییە، بەڵکو هەر مرۆڤەو بە جیا فووی ڕۆحێکی بەبەرداکراوە[1].

راسپاردە (ئەمانەت) بەم مانایەیە کە: مرۆڤی لە هەموو مەخلووقاتی تر جیاکردۆتەوەو لەوان ڕێزدارتری کردووە، ئەمەش ڕێزلێگرتنێکە، کە مەخلووقاتی تر تێیدا هاوبەش نین.

بەم فووی ڕۆح پێدا کردنە، مرۆڤ لایەقی ئەوە بوو، کە ببێتە بریکاری خوای گەورە لەسەرزەمین، بۆیە ئازادیشی دراوەتێ و وزەو توانای هەڵسوڕانی تایبەت بە خۆی دراوەتێ، تا ئەو بریکارێتییە بچەسپێنێت و بگاتە ئەو لوتکەیەی سەرفرازیی، کە ئەویش تایبەتەو هەموو مەخلووقێک نایگاتێ...

(ئەمانەت)ەکە -بەم مانایە کە زمانەوانییە- شتێکی بەنرخی خواییەو

(١) بۆ تەفسیلاتی تر بڕوانە: (مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ٣٧)و دواتریی. هەروەها:

_ ئیبنوحەجەر کۆمەڵێک راو بۆچوونی ئەهلی تەفسیری دەربارەی مانای (الأمانة)هێناوەتەوە: ئیبنوعەبباس -خوا لێیان رازی بێت- دەیفەرموو: هەموو ئەو فەرمانانەن کە خراونەتە ئەستۆی موکەللەف، کە دەبێ بیانکات، هەروەها ئەو بەرهەڵستیانەی کە نابێت بیانکات..

ئیبنوتتین دەفەرموێ: ئەمانەتەکە هەموو ئەو شتانەن :کە لە عەبددا پەنهان دەکرێن و غەیری خوای گەورە نایانزانن.

هەروەها وتراوە: کە بریتییە لە: ملکەچیی و گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خوای گەورە، یان وتراوە: ئەرکە شەرعییەکانن، هەروەها وتراوە: ئەو پەیمانەیە کە خوای گەورە لە عەبدەکانی خۆی وەرگرتووە.

خاوەنی کتێبی (التحرير) دەفەرموێ: ئەمانەتەکە خودی ئیمانەکەیە، کە ئەگەر بە تەواویی لە دڵدا جێگیربوو، ئیتر ئەرکە راسپاردەکان جێبەجێدەکات و توخنی بەرهەڵستییەکان ناکەوێت.

_ فتح الباري ب١٦ ل: ١٧_٣٩.

مــوڵکی ئەوە، کە بە ئەمــانەت لای مرۆڤــی دانــاوە، کە ئەرکــی داواکــراو (تەکلیف)ی دەکەوێتە سەرو، لە کۆتاییدا مرۆڤەکە دەکەوێـتە ژێـر لێپرسـینەوە (موحاسەبەکردن)ەوە، کە ئایا لە فەوتان پاراستت؟

ئایا بە پاکیی وسەلامەتیی پاراستت و نەتهێشت پیس و بۆگەن، یـان سـیس ببێت؟

خۆ دەتزانی کە ئەم ئەمانەتەت لا دەبێـت و لێـت وەردەگیـرێتەوەو، حەتمەن دەشگەڕێتەوە لای خاوەن ڕۆحەکە؟![1]

---

(١) مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ١٧_٣٩.

_ بگەڕێرەوە سەر مەقالەی (هارۆڵد ب سـميث): (مـذهب الإنسـان في الإنسـان وأثـر المذاهب السياسـية الإجتماعيـة والنظريـة السياسـية) کە لەگەڵ کۆمەڵێـک بـاس و لێکـۆڵینەوەی تـردایە، لەوانەی پێشکەش بە کـۆنگرەی کلتـوری ئیسلامی(برینسـتۆن) کـران کە زانکـۆی (برینسـتۆن و کۆنگرێس) لە ساڵی (١٩٥٣) دابە ناونیشانی: (الثقافة الإسلامية والحياة المعـاصرة) ڕێکیانخسـت/ کۆکردنەوەو پێداچوونەوەی: محمـد خلف الله. چاپی دووەم ساڵی ١٩٦٢ – مكتبة النهضة المصرية ل: ١٢١.

_ سـمێث دەڵـێ: (مـرۆڤ لە لایەکیـیەوە زەمینیـیە، مەخلـوقێکە وەکـو گیانلەبەرەکـانی تـر لە پێکهـاتەی زەمـین خەلقکـراوەو وەکـو ئەوانەو سـەربەخۆ نیـیە. بەڵام لە لایەکـی تـرییەوە: لەبەر ئەوەی لە ڕۆحی خوای گەورە فووی پێداکراوە، لە مەخلووقەکانی تر _کە سەربەخۆنین_ چاکترەو پەیوەندییەکی تایبەتیی بە خوای گەورەوە دەبێت..

مرۆڤ گیانلەبەرێکە دەتوانێت ئیختیاراتی ژیرییانە هەڵبژێرێت و حوکم لەسەر شتەکان بدات و سەربەستانە بڕیاربدات و ئەو ڕەفتارو ڕەوشتەی پێی پەسەندە ئەویان بگرێتەبەر..) .

قورئانیش ئەم حەقیقەتە ڕۆحیـیە روونـدەکاتەوە، بەوەی کە دەیسـەلمێنێت و دەیچەسـپێنێت کە خوای گەورە مرۆڤەکەی خەلقکردووە، تا بیکاتە بریکاری خۆی لەسەر زەمین هێنایە سـەرزەمین و دەسەڵاتێکی وای پێ بەخشی کە توانی گیانلەبەرانی تر بۆ خزمەتی خۆی ڕام بهێنێت..

**خاڵی دووەم: شاهێدیدانەکەی یەکەمجاری مرۆڤ لەسەر خوایەتی خوای گەورە:**

-خوای گەورە دەربارەی ئەم شاهێدیدانەی کە لە (جیهانی گیان)دا بووە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾﴾ الأعراف: ١٧٢ – ١٧٤ .

واتە: ئەوەت لەیادبێت، کە پەروەردگارت نەوەبەنەوەی ئادەمی کۆکردەوەو داوای شاهێدیدانی لێکردن، کە مەگەر من خوایی پەروەردگارتان نیم؟

هەموو وتیان: بەدیی، هەموومان شاهێدیی دەدەین، دەی سا لە ڕۆژی قیامەتدا نەڵێن: ئێمە ئاگامان لەمە نەبووە، یان بڵێن: جا ئێمە چی بکەین، کە بابوباپیرانمان هاوبەشیان بۆ خوا داناوەو لەسەری ڕۆیشتوون؟

خۆ ئێمەش هەر نەوەی ئەوانین و دەبوو لەسەر دابونەریتی ئەوان بڕۆین! چما ئێمە بە تاوانی ئەوان دەگریت و ئێمە لەبەر ئەوە دەفەوتێنیت ،کە نەوەی ئەو چەوت و گوناحکارانەین؟ (بەڵام لە وەڵامیاندا دەفەرمووێ: نا لەبەر ئەوە نییە ،چونکە ئەوانیش و ئێوەش پەیامی خواییتان بۆ هات و ئازادبوون دین وەرگرن، یان ڕەفزی بکەن، بەڵام ئێوەش هەر ڕەفزتان کردو شایانی هەمان سزای شیرکی بابوباپیرانتانن) ئاوا ئێمە بەڵگەو نیشانەکانی وەحی و گەردوون و ژیان بۆ هەموویان ڕوون دەکەینەوە تا بەرەو خوای گەورە بگەڕێنەوەو ئێستا لە دنیایاندا واز لە شیرک و کوفر بهێنن.

تەفسیرەوانان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە مەبەست لەم شاهێدیدان و شاهێدیی لێوەرگرتنە: تەوحیدە.

واتە :شاهیدیدانیانە _کە زانین و بڕیاردانە_ لەسەر ئەوەی کە هیچ خوایەک نییە شایانی خوایەتی بێت، جگە لە خوای گەورە.

-ئەبوهورەیرە - خوالێی ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (كُلُّ مَوْلُـود يُولَـدُ عَـلَى الْفِطْـرَةِ ، فَـأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِـهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يمُجِّسَانِهِ كَمَثَلِ الْبَهِيمَةِ تُنْتَجُ الْبَهِيمَةَ ، هَلْ تَرَى فِيهَا جَدْعَاءَ).[1]

واتە: هەموو کۆرپەیەک کە لەدایک دەبێت، لەسەر سروشتی ئیمانداریی خوابەیەکناسیی لەدایک دەبێت، ئیتر دایک وباوکی دەیکەنە جولەکەو دیان و مەجووسیی، هەر وەکو کە مەڕومالات (بەرخۆلە، یان کاریلە، یان گوێرەکە)یەکی دەبێت. ئایا بە گوێ بڕاوی لەدایک دەبێت؟!

-لەریوایەتێکی تردا دەفەرمووێ: (مَا مِنْ مَوْلُودٍ يُولَدُ إِلَّا وَهُوَ عَلَى الْمِلَّةِ).[2]

واتە: هەموو کۆرپەیەک لەسەر دینی ئەم ئوممەتە خواناسە لەدایک دەبێت.

کەوابوو: ئەو شاهێدیدانەی ڕۆژی کۆبوونەوەی ڕۆحی نەوەکان، ئەم ئیمانە سروشتیە (فطرة)یەی بەمرۆڤداوە، دوای زانین و دڵنیابوون و باوەڕهێنان بەهەردوو پرۆسەی: (راسپاردە: الامانە) و شاهێدیدانەکە _کە دووپرۆسەی خەلق بوونن_ ماهییەتی مرۆڤ ڕوون دەبێتەوە: کە مرۆڤ چییەو تایبەتمەندێتییەکەی چییە؟

ئەمانەتەکە تایبەتمەندێتییەکەی مرۆڤی ناساند بەوەی، کە مرۆڤ لە نێوان مەخلووقاتدا مەخلووقێکی تایبەتە.. قورئان ئەم ماهییەتە (چییێتی)یە ناودەنێت:

---

(١) نووسەری بەڕێز نوسیوێتی: (رواه مسلم ، والبخاري في صحيحه. طبعة الشعب ج٢ ص١٧_١٨).
راستە: بوخاری (١٣٠٢)، موسلیم (٢٦٥٨).

(٢) موسلیم (٤٨١١).

(فطرة)، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ الروم: ٣٠ .

واتە: ڕابەو ڕوو لە خوای پەروەردگارت بکە، لەسەر دینی پاکی حەقخوازیی بە، خۆت و ئەوانەی شوێنکەوتوتن بۆخوا لێ ببڕێن و دینداریێتیی سەرڕاستانە بکەن، لەسەر ئەو دینە سروشتییە (فطرە)یەی، کە خوای گەورە خەڵکی لەسەر خەلقکردووە، (کە لەدایکبوونیاندا هەموو خواناسن)، نابێت بەهیچ کلۆجێک گۆڕانکاریی بەسەر دینەکەیدا بهێنن ،چونکە دینی ڕاست و دروست و ڕەوا،هەر ئەوەیە، بەڵام زۆرینەی خەڵک پەی بەمەنابەن و نازانن[1].

**بڕگەی دووەم: پرۆسەی بریکاریی (خیلافەت).**

دووپرۆسەی: (ئەمانەت) و (فطرە) وەکو کە ئاماژەمان پێدان، دەبنە ئەو دوو کۆڵەکەی کە حەقیقەتە گەردوونیە گەورەکەی ئەم (وجود)ەیان لەسەردا دەمەزرێت، کە هەڵوێستی هەموو مرۆڤێکی بەرامبەر خوایەتی خوای گەورە پێ دیاریدەکرێت.. مەبەستمان: (حەقیقەتی خیلافەت)ە، واتە: ماهییەتی ئەو بریکارێتییەی کە مرۆڤی بۆ خەلقکراوەو بۆی نێرراوەتە سەرزەمین.

ئەم بریکارێتییە وەکو ئاڵقەی پەیوەستی نێوان وجودە غەیبیەکەی یەکەمجاری وجودی مرۆڤە، لەگەڵ ئەم وجودە دیتراوەی ئێستای دنیایدا، کە هەردووکیان پێکەوە پەیوەست دەکاتەوە _لە ڕاستییدا ئەگەر جائیزو شیاو بێت بڵێین_ ئەوەیە: کە وجودی ئێستای مرۆڤ، ڕەگ وڕیشاڵی بە زەماندا رۆچووە، تا دەگاتەوە رۆژی ئەزەلی یەکەمجاری رۆحەکەی.

(١) مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ١٧_١٨.

ئەوەی ئەم دوو وجودەی پێکەوە گرێداوە: بریکـارێتیەکەیە، کە ئەرکێکـی خواییەو مرۆڤەکەی بۆ خەلقبووە.

خوای گەورە دەربارەی ئەم خەلقبوونە جەستەییەی مرۆڤ دەفەرمووێ؛ ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝٣٠ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ۝٣١ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٣٢ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ۝٣٣﴾ البقرة: ٣٠ – ٣٣ .

واتە: یـادت بێـت کە خـوای پەروەردگـارت بە فریشـتەکانی فەرمـوو: مـن دەمەوێ بریکارێـک لەسـەرزەمیندا دابنـێم، فریشـتەکان فەرموویـان: خـوایە! کەسێکی لێ دادەنێیت ،کە دەکەوێتەوە گوناحکاریی و خوێنڕێژیی؟! لە کاتێکدا ئێمە سوپاس و ستایشت دەکەین و بە پیرۆزو مەزنت دادەنێین!

خوای گەورە فەرمووی: ئـاخر ئەوەی کە مـن دەیـزانم، ئێـوە نـایزانن، پاشـان خـوای گەورە نـاوی هەمـوو شـێتکی بە ئـادەم داو فێریکـرد، پاشـان نیشـان فریشتەکانیدا، فەرمووی: دەی ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن ناوی ئەو شـتە نـاونراوانەم پێ بڵێن؟

هەموو فەرموویان : پـاک و بێخەوشـیی بـۆ تـۆ خـوایە، ئـێمە جـۆرو رادەو برێکی زانیاریهان غەیری ئەوە نییە، کە خۆت فێرتکردووین، جەنابت خۆت زاناو دانایت.

ئینجا خوای گەورە بە سەیدنا ئادەمی فەرموو: ئادەی ئـادەم ! نـاوی هەمـوو

ناونراوانیان پێ بڵێ، کاتێک کە ناوی هەموویانی پێڕاگەیاندن، زانیان، کە مرۆڤی بۆ ئەرکێکیتر خەلقکردووەو ئامادەیدەکات بۆ دیتنی رۆڵ و بەجێهێنانی ئەرکێکیتری غەیری رۆڵ و ئەرکی ئەوان.

خوای گەورە پێی فەرموون: ئەدی پێم نەوتن ،کە من نادیاری ئاسمانەکان و زەمین زیاتر دەزانم و ،دەشزانم ئێوە چی دەردەبڕن و چی پەنهان دەکەن؟

**خاڵی یەکەم: پێناسەی بریکاریی (الخلافە):**

١-لەزمانەوانییدا:

-إسْتَخْلَفَ فُلاناً مِنْ فُلان : جَعَلَهُ مَكَانَهُ: واتە ئەوی خستە جێی ئەم.

-خَلَّفَ فُلانٌ فُلانَاً:إذا كانَ خَلِيفَتَهُ خَلَّفَهُ فِي قَومِهِ خِلافَةً : فڵان کەسی لە جێی خۆی بەسەر قەومەکەدا دانا۔ تا بریکاری بێت.

-خَلَّفْتُهُ: جِئْتُ بَعْدَهُ: دوای ئەو هاتم.

-إسْتَخْلَفْتُهُ: جَعَلْتُهُ خَلِيفَتِي : کردم بە بریکاری دوای خۆم، إسْتَخْلَفَهُ: جَعَلَهُ خَلِيفَةُ: کردی بە بریکار.

-الخَليفَة: الذي يَسْتَخْلِفُ مِمَّنْ قَبْلَهُ والجَمعُ: خَلائف : واتە: ئەو کەسەیە کە دەچێتە جێی کەسی پێشترو کۆیەکەشی (خلائف)ە.

خَليفَة: هەم بە مانای بکەرە (فاعل)و (وەکو من دەبمە خەلیفەی دوای تۆ) هەم بە مانای کراو (مفعول)ەو واتە کراوە بە خەلیفە[1].

---

(١) ابن منظور: لسان العرب/ پیتی خاء ب١ ل:٨٨٣.

_ احمد بن علي المقري: المصباح المنير_ چاپخانەی الخيرية لە قاهیره. ب١ ل: ٩٠. لێرەوە ئەوە روون دەبێتەوە کە شێخ علی عبدالرزاق کەوتۆتە هەڵەیەکی زەق و ناقۆڵاوە کە دەڵێ: الخلافة چاوگی
←

٢-لەزاراوەی شەرعدا:

- خَلَّـفَ فُـلانُ فُلانَـاً، يَخْلُـفُهُ: جَـاءَ بَعْـدَهُ: دوای ئەو هـات، وەکـو خـوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ الأعراف: ١٦٩.

واتە: نەوەیەکیتریان بە دوادا هات، کە بوونە میراتگریی کتێبە پیرۆزەکە.

_ ﴿۞فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ٥٩﴾ مريم: ٥٩ .

واتە: نەوەیەکیتریـــان بە دوادا هـــات، کە نوێژەکانیـــان فەوتانـــدو شـــوێن هەواوهەوەس کەوتن، ئەوانە حەتمەن گومڕا دەبن و دەچنە دۆزەخەوە.

-خَلَّفَ فُلانُ فُلانَاً: قَامَ بِالامرِ بَعْدَهُ: دوای ئەو بەکاروبارەکانی ئەوی گرتەدەست.

خوای گەورە دەربارەی بەرپرسێتی سەیدنا (هارون) دوای سـەیدنا (موسـا) - علـــيهما الســــلام- دەفەرمـــووێ: ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓ﴾ الأعـراف: ١٥٠. وە لەفـــــــــزی ﴿ٱخۡلُفۡنِي﴾ الأعـراف: ١٤٢ و ﴿يَخۡلُفُونَ﴾ الزخرف: ٦٠ ،کە ســەیدنا (موســا - عليــە الســـلام )گەڕایەوە لای قەومەکەی، زۆر زۆر تووڕەبوو !( چونکە بینی گوێرەکە دەپەرستن!) فەرمووی: بە ڕاستی ئێوە بوون بە خەڵکێکی خراپ بۆ ئەوانەی لەدوای ئێمە دێن.

- الخَليفَـة: مَـنْ يَخْلُـفُ غيـرَهُ وَيَقُـومُ مَقَـامَهُ: ئەو کەسـەیەکە جێـی یەکێکیـتر

---

تَخَلَّفَ فُلانُ فُلاناً إذَا تَأَخَّرَ مِنْهُ..الخ. چونکە چاوگی تَخَلَّفَ: التَّخَلُّفُ ە. ئەمما الخِلافَـة چـاوگی خَلَـفَ يە.

ئەمەش ئەو بۆچوونەی (محمـد ضياء الدين الريس) بەهێزدەكـات كە لە كتێبەكەيـدا: (الإسـلام وأصول الحكم، المنسوبُ الى علي عبدالرزاق) دەڵێ: ئەو كتێبە ديـارە كە بێگـانەيەک نوسـيوێتی، كە لە سادەترين ڕێسای زمانی عەرەبی نەگەیشتووە.. بڕوانە كتێبی: الإسلام والخِلافـة في العصر-الحديث ، نقدُ كتاب الإسلام وأصول الحكم) لە بڵاوكراوەكانی العصر الحديث. بيروت چاپی يەكەم ١٣٩٣ک/ ١٩٧٣ز ل: ١٨٥_١٨٦.

دەگرێتەوەو کاروباری ئەو دەگرێتەدەست، کۆیەکەی:(خَلائِف) و (خُلَفَاء)ە.

خـوای گەورە دەفەرمـووێ:﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ البقرة: ٣٠.[١]

**خاڵی دووەم: بریکاریی مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزدا:**

(ئیمامی طەبەریی) لە (ئیبنوئیسحاق)ەوە دەگێڕێتەوە: کە تەفسیری ئایەتی: (إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَـةً) واتە: مـن لە سـەرزەمیندا خەڵکێـک نیشـتەجێ دەکەم، کە لەوێ بژین و ئـاوەدانی بـکەنەوە، کە لە ئێـوە نـین، (لە فریشـتەکان) ،چونکە پێش خەلقکردنی مرۆڤ، جنۆکە لەسەر زەمیندا هەر هەبوون.

هەروەهـا لە لێکـدانەوەی ئـایەتەکەدا، هەنـدێکیتر فەرموویـانە: مەبەسـت ئەوەیە :کە لە سەیدنا ئادەمەوە (علیه السلام) وە بە نەوەی مرۆڤـایەتیی بە دوای یەکدا دێن..

شـێخ حەسـەنی بەسریـی – رحمەالـلە- دەفەرمـووێ: ((واتە خەڵکـی هەر سەدەیەک لە دوای خەڵکی سەدەی رابوردوو لەدایک دەبن و بەدوایاندادێن)).

ریوایەتێک لە ئیبنومەسعودو ئیبنوعەبباسەوە هاتووە: کە دەفەرموون: خـوای گەورە بریکارێــک بــۆ خــۆی لەســەر زەوی دادەنێــت، کە حــوکمی خــوایی بچەسپێنێت و بە دینی ئەو داوەریی نێوان خەڵکی بکات.

---

(١) لە ئایەتی ٢٦ی سوورەتی صادیشدا هەر بەو لەفزە هاتووەو لە ئایەتی ١٦٥ی الانعام و یونس/٧٣و فاطر/٣٩و بە لەفزی (خلائف) و لەفـزی (خلفـاء) لە ئـایەتی ٦٩و ٧٤ی سـوورەتی النحـل/ ٦٢ و بە لەفزی (الاستخلاف عن الله في الأرض) واتە: بریکاریی خوای گەورە لەسەر زەمیندا لە سوورەتی النور/٥٥ و الانعام/١٣٣و هود/٥٧و الأعراف/١٢٩و الحدیـد/٧دا هـاتووە. بگەڕێـرەوە سـەر: مجمـع اللغة العربية: معجم ألفاظ القرآن الكريم چاپی الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر لە قاهیرە چاپی دووەم ١٣٩٠ک/ ١٩٧٠ز ب١ ل: ٣٦٥ و دواتریی.

(طەبەری)یش ئەوەی بۆ ئیزافە دەکات: ((لە روانگەی ئەم ریوایەتەی ئەم دوو یاوەرەوە مانای ئایەتەکە وای لێدێت: کە من دەمەوێت بریکارێک بۆ خۆم لەسەر زەمین دابنێم، تا لە جیاتی من داوەریی نێوان ئەو خەڵکە بکات، کە خەلقیان دەکەم.

ئەو خەلیفە بریکارەش: سەیدنا ئادەم (علیه السلام)بوو، پاشان ئەو کەسانەی بوونە جێنشینی سەیدنا ئادەم لە: خواناسیی و خواپەرستیی وحاکمێتییدا، کە داوەرییان لەناو خەڵکییدا دامەزراند))[١].

-قورطبی –رحمەالله- لە تەفسیری هەمان ئایەتدا دەفەرمووێ: (جاعل) لێرەدا بە مانای (خالق)ە.

ئەمەش هەر ئەوەیە، کە (طەبەریی) لە (ئەبوزورەیق)یەوە هێناوێتی، کە (خلیفه) بە مانای بکەری (یخلف)ە، واتە: دێتەشوێنی ئەو کەسەی پێشتر لەوێ بوو ،چونکە پێش مرۆڤ فریشتە لەسەر زەمین بوون.

دەووترێت: کە پێش ئەوانیش غەیری فریشتەی لێبووە.. ئینجا دەفەرمووێ: مەبەست لە کەسی ریوایەتەکەی (ئیبنومەسعود)و (ئیبنوعەبباس) و تەفسیرەوانانی تر، سەیدنا ئادەمە -علیه السلام-، ئەو یەکەمین خەلیفەی خوای گەورەیە، بەو سیفەتەی کە فەرمان و ئەحکامەکانی خوای گەورە دەچەسپێنێت ،چونکە جەنابی (علیه السلام)یەکەمین نێرراوی خوای گەورەشە، هەر وەکو لە ریوایەتەکەی ئەبوزەڕدا - خوالێی ڕازی بێت - هاتووە :کە دەفەرمووێ: (قلت یارسول الله أنبیا کان مرسلا؟.... قال: نعم).[٢]

(١) ابوجعفر محمد بن جرير الطبري: تفسير الطبري: جامع البيان من تأويل القرآن تویژینەوەی مامۆستا محمود محمد شاکر، پێداچوونەوەو ساغکردنەوەی فەرموودەکانی لە لایەن شێخ احمد محمد شاکرەوە. چاپی دارالمعارف/ مصر ب١ ل:٤٥٠ و دواتریی.

(٢) ابوعبدالله محمد بن احمد الأنصاري القرطبي: الجامع لأحكام القرآن چاپخانەی دارالکتب المصرية ←

واتە: عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئادەم پێغەمبەری نێرراوی خوای گەورە بوو؟ (واتە پەیامێکی دینی پێبوو؟) فەرمووی : بەڵێ.

-ئیبنوکەثیر -رحمەالله -لە تەفسیری هەمان ئایەتدا دەفەرمووێ: خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو :کە من خەڵکێک لەسەر زەمین خەلق دەکەم، کە نەوە بەدوای نەوەیاندا بێن، سەدە لە دوای سەدە .. هەر وەکو دەفەرمووێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ الأنعام: ١٦٥ .

واتە: ئەوە خوای گەورەیە، کە نەوە بە دوای نەوەتان دا هێناونی.

دیارە، کە (ئیبنوکەثیر) پێچەوانەی (قورطبی)یەو خەلیفە بە لایەوە هەر سەیدنا ئادەم نییە، بەڵکو نەوەکانی مرۆڤایەتییە، کە لە سەیدنا ئادەم کەوتوونەتەوە[1].

بەڵام سەرجەمی ئایەتەکانی باسی (خیلافەت) لەگەڵ ئایەتی (ئەمانەت)ەکەدا یەکدەگرنەوەو ،ئایەتەکانی تەسخیر (دەستەبەرکردن)یشیان دێتەلاو وێناکە زیاتر رۆشن دەکەن.

وەکو ،کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾ الجاثية: ١٣ .

واتە: خوای گەورە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەر هەمووی بۆ ئێوە دەستەبەرکردووە.. ئەمە لوتفی خۆیەتی بۆتان.

سەرجەمی ئایەتەکان بریکارێتیی مرۆڤ ڕوون دەکەنەوە بۆ خوای گەورە

---

لە قاهیرە ب١ ل: ٣٦٣ و دواتریی.

[1] الحافظ عمادالدين أبوالفداء إسماعيل بن كثير القرشي الدمشقي: تفسير القرآن العظيم . دارالأندلس للطباعة والنشر بيروت ب١ ل:١٢٠ و دواتریی.

کە بۆ ئەوە هێنراوەتە سەر زەمین تـا دەسـەڵاتی بەسـەردابگرێت و دینـی خـوای گەورەی تێدا بچەسپێنێت.

جا ئیتر لە دوای فریشتەو جنۆکە هاتبێتە سەر زەوی، یان هەر خۆیـان نەوە لە دوای نەوەو قەوم لە دوای قەوم و دەوڵەت لە دوای دەوڵەت (بەحـــاکمێتیی و مەحکوومێتیی) هاتبن.

(خـیلافەت: بریکـاریی) وەکـو دواتـر (ان شـاء الـله ) ڕوونیـدەکەینەوە دووجۆرە : بریکارییەکی گشتی: کە بۆ هەموو مرۆڤێکە، تا ڕەنجی بخاتەگەڕ بۆ ئاوەدانکردنەوەی سـەرزەمین. جـۆری دووەم بریکـاریی تـایبەتە: کە بـریتییە لە دامەزرانـدنی دەوڵەت و دەسـەڵات بـۆ ڕێبەرێتـی کـۆمەڵگەی مرۆڤـایەتیی، هەروەها بۆ ئیدارەدانی کۆمەڵگەکەو ڕێکخستنی دەسەڵات و ڕێبەرێتیەکە.

هەمـوو ئەوەش پەیوەنـدی سـەرەتاو کۆتـای بە ویسـت و ئیـرادەی خـوای گەورەوە هەیە، کە ویستوێتی کاربەدەستێتی و سەرپەشتیارێتی ئەم سەرزەمینە بداتە دەست ئەم مرۆڤەی ئاوا ڕێزی لێناوەو دەستی واڵا و ئیرادەی ئـازادکردووە، تا بریکارێتییە خواییەکە بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوا جێبەجێبکات، بە ناسـین و ناسـاندنی خـوای گەورەو پەرسـتن و ڕاپەڕانـدنی ئەحکـامی دیـنەکەی و بە دەرهێنـان و بەکارهێنـانی خێروبێـری زەمـین، بە یـارمەتی خـوای گەورە بـۆ ئاسوودەکردنی دانیشتوانی سەرزەمین[١].

---

(١) سید قطب: في ظلال القرآن چاپی دارإحیاء الکتب العربیـة (عیسـی البـابي الحلبـي وشرکـاءە) لە قاهیرە. چاپی دووەم ب١ ل:٦٥.

## بڕگەی سێیەم: چۆنیەتی سەلماندن وچەسپاندنی بریکاریی (خیلافەت):

سنووری بریکاریی: بریکاریی (الاستخلاف) کە بریتیە لە جێگرتنەوەی بکەری پێشتر، بەڵام بریکارێتیی خوای گەورە زۆر لەوە گشتگیرترە ،چونکە خوای گەورە ئەرکی مرۆڤی بەو بریکارییە زۆر لە جێگرتنەوە زیاترو گشتگیرتر کردووە. دەفەرمووێ: ﴿هُوَأَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا﴾ هود: ٦١ واتە: خوای گەورە ئێوە لەسەر زەمیندا خەلقکردووەو پێیگەیاندن، تا بکەونە ئاوەدان (عمران)کردنی. استعمركم: الاستعمار: واتە دەسەڵات و توانای ئاوەدانکردنەوەو ئاڕاستەکردن.. بۆیە خوای گەورە دەربارەی ئەو دەسەڵات و توانایە دەفەرمووێ: (وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ قَلِيلاً مَّا تَشْكُرُونَ)الاعراف/١٠ واتە: ئێمە دەسەڵات و توانا (تەمكین)مان لەسەر زەمیندا پێداون و ئاسانکاریی ڕۆزی پەیداکردنمان بۆ کردوون، تا خۆ بژێنن و سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکەن... هەروەها دەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ٤١﴾ الحج: ٤١.

واتە: ئەوانەی کە لەسەر زەمیندا زاڵمانکردن و دەسەڵاتمان پێبەخشین نوێژەکان پیادەدەکەن و زەکاتدەدەن و فەرمان بەچاکە دەکەن و بەرهەڵستی لە خراپە دەکەن... هەروەها ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١٣﴾ الجاثية: ١٣ خوای گەورە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی بۆ هەموو ئێوە دەستەبەرکردووە.. ئەمە لوتفی خۆیەتی بۆتان.

**خاڵی یەکەم: حیکمەت لە بریکاریی:**

ئەگەر ئەمە پێناسەی بریکارییەکەیە، ئەدی حیکمەت لەمە چییە کە خوای گەورە مەخلووقێک _کە مرۆڤە_ بۆ ئەوە خەلقدەکات و دەینێرێتە سەرزەوی، تا لەبری ئەو ئاوەدانیبکەنەوە؟ ئەم مرۆڤە دەبێ چ مەرجێکی تێدابێتەدیی، تا شیاو شایستەی ئەو ئەرک و ڕۆڵ و کارە شەرەفمەندانە بگرێتەئەستۆ؟ ئایا ئامانج و مەبەستی کۆتایی لەم بریکارێتییە چییە؟.

خوای گەورە لە سەرەتاوە ئەوەی ڕوونکردۆتەوە: کە حیکمەتی ئەم بریکارییە تاقیکردنەوەی هەموو شێتێکی مرۆڤە: هزرو ژیریی و ئەقڵ پێشکانی بەکارەکەی و ئامادەیی و ڕەنجدان بۆ جێبەجێکردن و سەبرگرتن لەسەر کۆسپەکانی ڕێ و پشوودرێژیی لەگەڵ سەرڕاستێتی خواویستیی و ئومێدی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ ١٦٥ ﴾ الأنعام: ١٦٥ .

واتە: ئەوە خوای گەورەیە کردوونی بە بریکاری خۆی لەسەر زەمین و ئاست و پلەی هەندێکتانی بەسەر هەندێکیترتاندا بەرزکردۆتەوە (بە ناوو ئاست و پلەوپایەو ماڵ و سامان و ژیریی و زیرەکی وجوانیی و ... هتد)، تا بەوەی پێی بەخشیوون تاقیتان بکاتەوەو بەڵگەتان لەسەر تۆماربکات، کە کێتان بە پێی وەحیی خوایی ڕەفتاریکردووەو کێتان بە پێی هەواوهەوەسی خۆی؟

خوای گەورە سزای زۆرخێرایەو زوو دەیگەیێنێتە یاخییبوان و گوناحکاران. هەر وەکو کە لێخۆشبوو و بەبەزەییە.

- هەروەهـــا ﴿ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ١٤﴾ يونس: ١٤ .

واتە: پاشان کردمانن بە بریکارانی سـەرزەمین، کە نەوە لە دوای نەوە بـێن و بڕواننە نەوەکانی پێش خۆتان، کە چ ڕەفتارێکیان کردووە، تـا بەڵگەتـان لەسـەر بچەسپێت، کە ئایا نێرراوانی خوای گەورەتان بە ڕاسـت زانیـی و شـوێن وەحـی کەوتن؟ یان دژیان وەستانەوە یاخیبوون؟.

-قـورطبی –رحمەالـلە- لە تەفسـیری ئەم ئـایەتەدا دەفەرمـووێ: واتە: دوای چەندین سەدەو نەوە کە هاتن و نەمان، ئێوەمان کرد بە دانیشتووی سەرزەمین، تا ئێوەش ڕەفتاربنوێنن و شایانی پاداشت و سزا ببن.. خوای گەورە دەیەوێت _وەکو تاقیکردنەوەتان_ ڕەفتارتان لەگەڵدا بکات تا دادپەروەریی خۆی نیشاندان[1].

-ئیبنـو کەثیـر -رحمەالـلە- دەربـارەی هەمـان ئـایەت دەفەرمـووێ: خـوای پەروەردگـــار هەواڵیـــداوەو ڕوونیکـــردۆتەوە: کە چـــی بەســـەر ئەو نەوانەی مرۆڤایەتییدا هات، کە پێغەمبەرانـی خوایـان (علـیهم السـلام) بەدرۆخسـتبۆوە، ئەگەرچی بەڵگەو نیشانەی زۆریان دەربارەی حەقیانەتی پەیامی خوایی خۆیـان نیشـاندابوون و بەهانەیـان بڕیبـوون، کە دەبـوو بـاوەڕبهێنن (بەڵام یـاخیبوون و خوای گەورە سزایدان).

وا ئێستاش پێغەمبەری خۆی (صلی الله علیه وسـلم) بـۆ ئێـوە نـاردووە، تـا ببینێت کـێ و تـا چ ڕادەیەک گـوێڕایەڵیی دەکـات و شـوێن سـیرەو سـوننەتی دەکەوێت[2].

لە (سەحیحی موسلیم)دا ریوایەتی(ابونضرة) لە ئەبوسەعیدەوە هاتووە: کە

(١) تفسیر القرطبي ب٨ ل:٣١٨.

(٢) تفسیر ابن كثیر ب٣ ل:٤٨٨.

دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ، وَإِنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا، فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ، فَاتَّقُوا الدُّنْيَا، وَاتَّقُوا النِّسَاءَ، فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كانت في النِّساء) .

واتە: دنیا جوان و شیرین و رازاوەیە، خوای گەورەش ئێوەی تێدا نیشتەجێکردووەو کردوونی بە بریکار، تا ببینێت چۆن رەفتاری تێدا دەکەن،خۆ لە فیتنەی دنیاویستیی لابدەن و (باوەش بە دنیادا مەکەن) و خۆ لە فیتنەی ئافرەت بپارێزن ،چونکە یەکەمین فیتنە (ی دین کزبوون) کە کەوتە ناو بەنوئیسرائیلەوە، بەهۆی ئافرەتەوەبوو.

**خاڵی دووەم: مەرجەکانی شایستەبوونی بریکاریی:**

خوای پەروەردگار کە ئەم مرۆڤەی بە ئەرکی بریکارێتیی خۆی لەسەر زەمین تەکلیفکرد، لە دادپەروەیی بێسنووری خۆیەوەبوو کە هەر دەبوو ئامادەی ئەو ئەرک و رۆڵە قورس و کاریگەرەشی بکات و، توانا و یارمەتی و ئاسانکاریی خۆیی بخاتە بەردەست، تا بتوانێت ئەرکەکە جێبەجێبکات و بەرپرسێتی _لە بێتوانایی و نەشیاوێتییدا_ نەکەوێتە سەر:

<u>١-پێکهاتەی مرۆڤ و شیاوێتی بریکاریی:</u> خوای گەورە هەر لە سەرەتاوە خەلقکردنەکەی مرۆڤی بە شێوازێک کرد، کە لە لایەکەوە وەکو مەخلووقەکانیتر بێت.

بۆیە پەیکەری جەستەی لە هەموو ئەو توخمانە پێکهێنا، کە لەسەر زەمیندا هەبوون و هەن، لە توخمی وجودو کانزاو کەرەستەکان.. بەڵام خۆ هەر ئەم لایەنەی شیاوینەدەکرد ،چونکە لەم لایەنەوە هەر وەکو مەخلووقاتیتری سەر زەمینە..

بەڕای ئێمە لەو کەرەستانەی زەمین خەلقیکرد تا هەماهەنگ بێت و وەکو

مەخلووقاتەکانیتر بێت، نامۆو غەریبە نەکەوێت، دوای ئەمە خـوای کردگـار لە ڕۆحی خۆی فوویکرد بە بەرداو بەو ڕێزلێنانە تایبەتە یەکسـەر لە مەخلووقـاتیتر جیا بۆوەو سیفەتی تایبەتمەندیی خۆیی گرت..

ئیتر کیانێکی بـۆ دروسـتبوو، کە لە پێکهـاتە تـوخمییە جەسـتەییەکانیتری گرنگتر دەرچوو، کۆمەڵێک پێکهاتەیتری هەماهەنگ و پێکەوە گونجاوو سازاو، تا وەکو ئەوە دەرکەوت: کە گەردوونێکی گچکەیە: (جەستەو ڕۆح و دەروون و هزرو ... هتد) کۆمەڵێک سیفەتی شایستەبوون لە مرۆڤدا کۆبۆووە، تـا شـیاوی ئەوەی بکات ببێتە سەروەرو دەسەڵاتداری سەر زەمین.

بە پێکهـاتەی خەلقبـوونی جەسـتەو ڕۆح و هـزرو دەڕوونیـی بەشـەرێتیی گەیشتە ئاستی (احسن تقویم)،ئاوا ڕۆحی باڵادەستی تێـدا زەرع بـوو، ئـاوا بـوو بەئاڕاستەوان و ڕێبەر، بوو بەهەڵسوڕێنەرو ڕێکخەرو پارێزەری دین و ژین، بوو بەمـایەی سـازدانی چـالاکی هـزرو دڵ دەڕوون و جەسـتە، ئـاوا بەو ڕۆحە بـووە سەرکردەو فەرماندەو ڕێبەری کیانی مرۆڤێتـی تـا مـرۆڤیش بە پەیـامی خـوایی ببێـتە سـەرکردەو فەرمانــدەو ڕێـبەی مرۆڤـایەتیی ... تـا بریکـارێتییەکەی بەجوانترین شێوە بهێنێتەدیی و سـەرفرازو ڕووسـورانە بگەڕێـتەوە لای خـوای خاوەنی، کە خاوەنی ئەمانەت و پەیامەکەشە[1].

<u>٢-تواناکانی مرۆڤ و بریکاریی:</u>

نەدەکرا مرۆڤ بەو ئەرکە قورسەی بریکاریی هەستێت و ئەو بەرپرسـێتیە گەورەو گـرنگە جێبەجێبکـات، ئەگەر کۆمەڵێـک وزەو توانـای مەعنەویـی و فیکریی و دەروونیی ڕەسەنی زاتیی خۆی تێدا خەلقنەکرایا.

هەر دەشبوو ڕەسەن و زاتیی بن، تا لە کیانی مرۆڤ خۆیەوە شـەحن ببـنەوەو ببنە وزەو پاڵنەری گوڕو تینی خۆی بۆخۆی.

---

[1] د. فاروق دسوقي: مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل:٤٠_٤١.

گــرنگترین توانــاش: ئــازادییە بەشــەرییەکەیەتی ،کە لە ســێ توخمــدا دەردەکەوێت:

**أ_ توانـای مـرۆڤ لە هەڵبژردنـدا: تەوەری سـەرەکی ئەمەش ویسـتێکی ئینسـانی ئازادە... دواتر دێینەوە سەرئەوە.**

**ب _ توانــای بەشــەری: کە لە حەقیقەتـی بریکـارییەکەوە دێـت و لەسـەردوو کۆڵەکەوەستاوە:**

١-کۆڵەکەیەکیان لە دەرەوەی نەفسـی مـرۆڤە: کە بـریتیە لەوەی: کە خـوای گەورە مەخلووقــاتیتری بــۆ مــرۆڤ دەســتەبەرکردووە، هەموویــانی خســتۆتە ژێردەســەڵاتی ئەمەوە، بەشــێوەیەک کە هەر مەخلــووقێکی لەســەر یاســاو رێسـایەک دانـاوە، کە وەکـو خـولگە لەسـەری دەڕوات، بەڵام ئاسـان بەدەسـت مرۆڤەوە دێت و سازدانی مرۆڤ قبوڵدەکات.

٢-کۆڵەکەی دووەم لە ناخی مرۆڤی خۆیدایە: کە بریتیە لە توانای کارکردن.

ئەمانە لەگەڵ ویست و فەرمانی خوای گەورەدا پێچەوانەنین ،چونکە خـوای گەورە یاسای هۆکارو ئەنجام (العلة والمعلول: السبب والمسبب)ی خەلقکـردووەو مرۆڤ لەسەری دەڕوات، مرۆڤەکە خەلقینەکردووە، بەڵکو رێساکە وەردەگرێـت (وەکو ئاگر دەسـوتێنێت، ئـاگرەکە هۆکـارە، پێشـەکییەو سـوتاندنەکە بەرهەمە، ئەنجامە، خەلقکردنی سروشتی ئاگر کاری خوای گەورە بووەو مـرۆڤ سـوود لە رێساکە وەردەگرێت)، سەرەنجام رێکخستنی کاروبارەکانی مرۆڤ دێتەدیی.

٣-زانست و زانین:

تــوانین بە تەنهــا بەس نیــیە ،چــونکە تــوانین کــۆکردنەوەو رێکخســتنی هۆکارەکانە، بۆیە زانینیش مەرجێکیتری سەرکەوتنی کارە.

زانینی رێسای هۆکارو ئەنجام کە بزانیت کاتێک ئەم هۆکـارانە بە تەواویـی دەگریتەبەر، ئەو ئەنجامەت دەستدەکەوێت.

توانین گرنگەو ڕوکنی دەستپێکە، زانست روکنـی گرنگـی بەردەوام بـوونە، زانینی خێروچاکە یان بەدیی و خراپەی کـارەکەش پـاڵنەرە. (دەتوانیـت بـدزیت، دەشزانیت چۆن، بەڵام پێت حەرامە نایکەیت).

قورئانی پیرۆز دووسەرچاوە بۆ زانین دیاریی دەکات :

یەکەمیان وەحیـیە: کە قورئـانەو دەخوێنـدرێتەوە، رۆڵـی مـرۆڤ فێربـوون و تێگەیشتن و بەڕاستزانین و جێبەجێکردنێتی.

دووەمیان گەردوونە: دیارو هەستپێکراوەکەیە،رۆڵی مـرۆڤ تێیـدا ئەوەیە بە دوای حەقیقەتی رێساکانییدا بڕوات و کەشفیانبکات ،چونکە زانینی حەقیقەتی ئەسڵییان لە مەودای توانای تێگەیشتنی مرۆڤـدان و بە تەنهـا خـۆی دەیانگـاتێ ،چونکە رێساکانی گەردوون نەگۆڕن.

بۆیە بە سەرنجدان و لێکـۆڵینەوەو بەدواداچـوون _ئەزمـوون بە ئەزمـوون_ دەگەێنێـــتە ئەو ئەنجــامە کە رێســـاکانی گەردوون بــدۆزێتەوە. بە ژیریـــی و ئامێرەکانیتری هەست و درک پێکردن بزانێت چۆن دەیانخاتە خزمەتی پڕۆژەکانی خۆی، کە لایەنێکی بریکارییەکەیەتی[1].

### خاڵی سێیەم: مەبەست یان ئامانجی بریکاریی:

وتمان: کە بریکارێتیی مرۆڤ بۆ خوای گەورە لەسەر زەمین، پەیوەندی زۆر توندوتۆڵی بەو ئامانجە گشتیانەوە هەیە، کە ئەم دینە بۆ هێنانەدییان هـاتووە، کە بریتیە لە بڕیاری تاک وتەنهایی خوای گەورەو سەلماندن و چەسپاندنی خوایەتی ئەوو بەندێتی مرۆڤ بۆی.

---

(١) بۆ شارەزایی زیاتر بگەڕێرەوە سـەر سـەرچاوەی پێشـوو ل:١٠٠ و دواتریـی. هەروەهـا: خصـائص التصور الإسلامي سەید قوطب ل: ٥٤ و دواتریی. هەروەها: سید قطب: تفسـير سـورة الشـوری ل: ٢١ و دواتریی.

واتە: ناسین و پەرستنیی و چەسپاندنی ئەحکـامی دینـەکەی لە کـۆمەڵگەی مرۆڤایەتییدا.

قورطوبی –رحمەالله- گەیشتۆتە ئەم مەبەستە کە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا شەرحی دەکات: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾ الجاثية: ١٣ .

واتە: خوای گەورە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمـووی بـۆ هەموو ئێوە دەستەبەرکردووە.. ئەمە لـوتفی خـۆیەتی بۆتـان، دەفەرمـووێ: (ئەم شتانە هەمووی دەستەبەرکراوە بۆ مرۆڤ تا بەهانەی نەمێنت، تا ببێـت بە بەڵـگە لەسـەریی، تـا عەبـدێتی خـۆی بـۆ خـوای گەورە بنوێنێـت ،چـونکە بـۆ ئەو عبوودییەتەی خۆی خەلقیکردووە )[1].

بێگومان عەبدێتیکردن بۆ خـوای گەورە بەوە دەبێـت کە موسـوڵمان لەسـەر مەنهەجـی خـوای گەورە پەروەردە ببێـت و لە ژیـانی تـاک وکـۆی کـۆمەڵگەو دەوڵەتییدا ئەحکامی شەریعەتەکەی ئەو بچەسـپێنێت:﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗاۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٨ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٩﴾ البقرة: ٣٨ – ٣٩ .

واتە: وتمان: هەموتان (ئادەم وحەواو ئیبلیس) بڕۆنە خوارەوە بۆ سـەرزەمین، دواتر پەیـامی منتـان بـۆ دێـت، کە هیـدایەتتانی تێـدایە، هەر کەسـێک شـوێن هیدایەتی من بکەوێت (بە وەرگرتنی دینـی خـواو دینـداریی پێـی وچەسـپاندنی ئەحکامەکـانی) ئەوە بـا خەفەت لە رابـوردووی و خەمـی داهـاتووی قیـامەتی نەخوات ،چونکە پاداشتی مسۆگەرە.

---

(١) تفسير القرطبي ب١ ل: ٢٥٣.

ئەمما ئەو کەسانەی دیدو ڕێی غەیری وەحی خوایی دەگرنەبەرو بەڵگەکانی وەحی بەدرۆدەخەنەوە، بەتەئکید ئەوانە ئەهلی دۆزەخن و بە نەمریی تێیدا دەمێننەوە.

ئەم مەبەستانە _کە لە ڕاستییدا یەک مەبەستەو بریتیە لە: پەرستنی ڕاست و دروستی خوای تاکوپاک_ هەر بەوەندە نایانەدیی کە هەست و هۆشێکی ئیماندارانە بێت و لە ناخی خەڵکییدا بچەسپێت، یان هەر وشەی سەرزاربێت و بوترێت. بەڵکو پێویستە لە ڕەفتار (گوفتارو کردار)ێکی واقیعی بەشەرییدا دەربکەوێت، بە شێوەیەکی بەردەوام، کە هەر هەموو ژیانی خەڵکی بگرێتەوە. ئا ئەمەشە ڕۆڵ و ئەرکی بریکارێتییەکەی مرۆڤ.

خوای پەروەردگار هانماندەدات: تا ئەم ڕۆڵەی بیناسازیی بگرینەبەر، دەفەرمووێ لە پێناویدا ڕەنج بدەن و تێبکۆشن: ﴿ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ التوبة: ١٠٥ .

واتە: بفەرموو: هەوڵبدەن کاربکەن خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) و بڕواداران کارەکانتان دەبینن و چاوەڕوانی بەرهەمتان لێدەکەن، دواتریش دەگەڕێنەوە لای خوای گەورە، کە ئاگاداری هەموو نادیارو دیارەکانە، جا لێپرسینەوەتان وەلدادەکات لەسەر هەر ڕەفتارو نیەتێک کە لە دنیادا هەتانبووە..

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٢.

واتە: چما وادەزانن هەروا ئاسان دەچنە بەهەشت؟! پێش ئەوەی خوای گەورە

بە بەڵگە لە سەرتانی بسەلمێنێت :کە کێتان جیهادی لە پێناوی ڕەزامەنـدی ئەودا کردووەو دیـنەکەی سەرخسـتووە؟ یـان پـێش ئەوە بەئـارام و پشـوودرێژەکانتان هەڵاوێرێت؟!.

خوای گەورە بەڵێنی ڕێنمایی کردن و ڕێنیشاندانی بە موجاهیدەکان داوە، کە لە پێناوی ئەودا جیهـاددەکەن،دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٦٩﴾ العنكبوت: ٦٩ .

واتە: ئەو کەسانەی کە لەبەر خاتری ئێمەو بۆ پاراستنی دینی ئێمە جیهادیان بەرپاکرد، هیدایەتیان دەدەین و زیاتر لەسەر دینداریێتی ڕاست و پـاک ڕێنماییـان دەکەینو خوای گەورەش بە تەئکید وەل چاکە کاراندایە.

بێگومان ئەم ڕەنج و جیهادو سەبرگرتن و پشوودرێژییە، هەمووی بۆ ئەوەیە کە ژیانی تاکوکۆی کۆمەڵگە و دەسەڵات بە پێی مەنهەجی خوایی دابڕێژرێت، تا تاک وکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەت موسوڵمانانە بژین و عەبدێتیان بۆ خـوای گەورە تێدا بێتەدیی..

ئەمەش بەوە دەبێت کە دوای پەروەردەبوونی تاکی خواناس و بۆخـوالێبڕاو، ئـوممەتێکی خوانـاس و بۆخـوالێبڕاو بێـت و جیهـادەکە رابگەیێنێـت، تـا بەربەستەکانی ڕێی بانگەوازی خوایی لابدات و رایانبدات و ئەو خراپەکاریـانە نەهێڵێت کە بە هۆی دوورکەتنەوە لە مەنهەجی خوایی و لەخواباخیبوونی مرۆڤ تەشەنەیان کردووەو فەسادیان ناوەتەوە..

ئەمانە هەموو ڕەنجدانن لە پێناوی سەلماندن و چەسـپاندنی بریکـارێتیەکەی مـرۆڤ بـۆ خـوای گەورە لەســەر زەمینـدا، کە هەمـوو مرۆڤێـک دەگـرێتەوە، بێجیاوازی ئینتما غەیرەدینییەکانی.

*مرۆڤ یان بریکاری خوای گەورەیە یان بریکاری غەیری ئەوە:

مرۆڤ یان ئەوەیە دەبێتە بریکاری خوای گەورە، یان دەبێتە بریکـاری غەیـری ئەو ،چونکە دەبینـین ئـایەتەکە دەفەرمـووێ: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ البقرة: ٣٠.

راشکاوانە دەفەرمووێ: مـن دەمەوێـت بریکارێـک لەسـەرزەمین بـۆ خـۆم دابنێم.

کەوابـوو: خـوای گەورە ئەم مـرۆڤەی کە خەلقکـرد، بـۆ بریکـارێتیی خـۆیی خەلقکردووە، ئەمما کە بیەوێت لە خـوای خـاوەنی یـاخی ببێـت، حەتمەن دەبێـتە بریکاری شـەیتان و خراپەکـاران و دیـدو رێ و فەرمـانی ئەوان لە بەدکـاریی و فەسادو خوێنرێژییدا جێبەجێدەکات.

بـۆیە فریشـتەکان فەرموویـان: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾ البقرة: ٣٠. چـونکە دەیـانزانی ئەوی بە پێـی فەرمـانی خـوای گەورە ناکـات، دیـدو مومارەسەی ئەئاوا دەبێت .

ئەمەش بـوو بە بەڵگەنەویسـت ،چـونکە دەرکەوت: کە مـرۆڤ لەسـەر دووڕیانێکـدایە: یـان ئەوەتـا دیـدو رێبـازی خواویسـتی دەگـرێتەبەرو بە پێـی مەنهەجـی خـوای گەورە رەفتاردەکـات و بریکـارێتیی ئەو دەچەسـپێنێت کە لە (تەوحیـد و عیبـادەت)دا دەردەکەوێـت، لە چەسـپاندنی شـەریعەتی خـوادا دەردەکەوێت، ئەگەر ئاوای کـرد، ئەوە خـۆ دەخـاتە کۆتـا لـوتکەی رێـزو لەنـاو مەخلووقاتیتردا یەکەمین دەبێت و بەڕاستی دەبێتە بریکاری خوای تاک وپاک.

ئەمەش کۆتا ئاست و پلەی کامڵێتیی و راقیبوونە، کە مرۆڤ بیگاتێ.. یـان ئەم دیدو رێیە دەگرێتەبەرو بەو ئەنجام و پاداشتە دەگات، یـان یاخیـدەبێت و بە پێـی حەزو ئـارەزووی نەفسـی خـۆی دەکـات و دەکەوێـتە خراپەکـاریی و خوێنرێژیی، دوای ئەوەی کە دەکەوێتە شیرک و کوفرو ئینحیرافەوە ،چونکە ئەو

کاتە کە لە ڕێی خوای گەورە لا دەدات، دەچێتە سەر دیدو ڕێ و مومارەسەی شەیتانیی و غەیری خوای گەورە دەکاتە سەییدو سەروەرو ملکەچیی و گوێڕایەڵیی بۆ غەیری خوای گەورە دەردەبڕێت و (عبودییەت) بۆ غەیری خوای گەورە دەنوێنێت.

بەمەش ئاست و پلەی دێتەخوارێ بۆ ئاژەڵ و خراپتر، بۆ ئاستی (اسفل سافلین)،چونکە بەویستی ئازادی خۆی یاخیبووەو ئەو ئاست و پلە ڕێزەی -کە خوای گەورە بۆی دانابوو- وازیلێدەهێنێت و نایەوێت ببێت بەبریکاری خوای گەورە.

کەوابوو: یان ئەوەیە دینی خوای گەورە دەگرینەبەرو دینداریێتیی پێدەکەین و ئەحکامەکانی شەرع جێبەجێدەکەین و سەرڕاستانە ئاوا دەبینە بریکاری خوای گەورە لەسەر زەمین.

ئەو کەسەی ئەمەشی پێ گرنگەو سوورە لەسەر بەدەستهێنانی، باکی بەکۆسپی ڕێ نییەو چاوی لە هێزی دوژمنان ناترسێت، کە دەبینێت بەرەی ئیماندارانی کەم و لاوازن و شەیتانیزمەکان زۆرو بەهێزن، ناکەوێتە دوودڵیی و ڕاڕاییەوە.

کەندو کۆسپی ڕێ نە لە بانگەوازی خواویستی دەیوەستنێت و نە لە جیهاد ساردی دەکاتەوە.

ئەمە چاوی هەر لەو لوتکە ڕێزەی بریکارێتیی خوای تاک وپاکە.. ئەمما ئەو کەسەی بە کەندەڵان و شیوو چاڵی گوناحکاریی و زەلکاوی فەساد ڕازییەو کەوتۆتەبەر شەپۆڵی شیرک و حەزی مونحەریف و وهەواوهەوەس وەکو ئەوەیە: کە ئایەتەکە وێنای دەکات: وەکو کەسێکە کە لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوەو باڵندەی گۆشتخۆر ڕایانفڕاندبێت! یان ڕەشەبای توندو بەهێز ڕاپێچی کردبێت و فڕێیدابێتە شوێنێکی چەپەک و دوورەوە.. نابینیت چۆن خوای گەورە

نموونەی هەردوو بریکارەکەمان بۆ وێنادەکات: ﴿ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦۗ وَأُحِلَّتۡ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ٣٠ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ٣١﴾ الحج: ٣٠ – ٣١.

واتە: ئەوە لەبەر ئەوەیە: کە هەر کەسێک سنووری شەرع بپارێزێت و نەکەوێتە ئەو شتانەوە، کە خوای گەورە حەرامیکردوون، ئەوە لە خێرخوازییدایەو پاداشتی لای خوای گەورەی مسۆگەرە.

خواردنی گۆشتی مەڕو ماڵاتەکانتان ـدوای سەربڕینی شەرعیی ـ بۆتان حەڵاڵەو ئەوانەش کە لێتان حەرامە بۆتان ڕوونکراوەتەوە (لە ئایەتی ٣ی المائدەدا) دەی سا خۆتان لە پیسی بت دوورەپەرێزبگرن و توخنی شاهێدیدانی درۆ مەکەون.

موسوڵمانی ساغ و ڕاست و حەقخوازبن و هاوبەش بۆ خوای گەورە دامەنێن، ئەو کەسەی هاوبەش بۆ خوای گەورە دادەنێت، بێهێزو لاوازو بێپشتە، وەکو ئەوەیە لە ئاسمانەوە کەوتبێتەخوارەوەو باڵندە ڕایانفڕاندبێت و ڕەشەبای بەهێز راپێچی کردبێت، بردبێتی بۆشوێنێکی چۆڵەوانیی ودوور[1].

---

(١) مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ٢٠٩و دواتریی.. طەبەریی- رحمەاللە -لە لێکدانەوەی ئایەتەکەی خیلافەت (إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ) و پرسیارکردنی فریشتەکان دەربارەی ئەو خەلیفە بریکارە کە خەمیانە خراپەکاریی بنێتەوەو بکەوێتە خوێنڕێژیی: (أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ) طەبەریی دەفەرموێ: کە خوای گەورە فەرمووی: من بریکارێک بۆ خۆم لەسەر زەمیندا خەلقدەکەم، کە لە جیاتی من حوکم بکات، لە جیاتی من داوەریی نێوان خەڵکی بکات. ئەو خەلیفەیەش ئادەمە، هەروەها ئەو کەسانەن کە دەبنە جێگریی ئادەم لە ←

**بڕگەی چوارەم:**

**بریکاریی مرۆڤ و سیستمی حوکمڕانی لە ئیسلامدا:**

زانیمان کە مەبەستی سەرەکی بریکاریی مرۆڤ لەسەر زەمین سەلماندن و چەسپاندنی تاقانەیی خوایەتی خوای گەورەو بڕیاردانی عەبدێتی مرۆڤە بۆی، زانیشمان کە ئەمە یەکەمین و گرنگترین بنەمای دیدو تێڕوانینی عەقائیدی ئیسلامییە. بە مانایەکیتر: بریکاریی بریتییە لە ئەرکێکی گەردوونی کە خوای گەورە خستوێتیە ئەستۆی مرۆڤ، تا لە سەرزەمیندا لە ڕێی چەسپاندنی خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی مرۆڤەوە، بیهێنێتەدیی.

ئەم ئەرکە گرنگ و قورسە بە بێ نەخشەسازیی و ڕێکخستنی وزەو تواناکان ناکرێت، بە بێ داڕشتنی لایەنەکانی ژیانی تاک وکۆی مرۆڤ لەسەر بەرنامەی خوایی نایاتەدیی.

ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمین و دەرهێنانی خێروبیری زەوی و بەکارهێنانی بۆ خۆشگوزەرانی خەڵکی، بە بێ هەبوونی دەوڵەت و کۆمەڵگەی دامەزراو نابێت. لەبەر ئەم حەتمییەت و زەرورەتانەیە کە ئیسلام دەفەرمووێ، هەستی بەرپرسێتی بریکارییەکە زەمینەی فیکرییتان بێت، تا هەموو سیستمەکانی

---

دەربڕینی ملکەچیی و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانی خوای گەورەو حوکمکردن و داوەرییکردنی دادپەروەرانەی نێوان خەڵکی. ئەمما خراپەکارییەکەو خوێنڕشتنەکە ئەوە ڕەفتاری ئەو کەسانە دەبێت کە وەحی خوایی وەرناگرن و پێوەی پابەندنابن، ئەو کەسانە وا دەکەن کە نابنەجێنشین و بریکاری ئادەم لە ملکەچیی و گوێڕایەڵییەکەیدا بۆ خوای گەورە..

واتە: خوای گەورە خراپەکاریی و خوێنڕشتنەکەی ئیزافەکرد بۆ وەچەو نەوە لادەرەکانی خەلیفەکەی (کە سەیدنا ئادەمە علیە السلام). ئاوا خەلیفە بریکارەکەی خۆی بێبەرییکرد لەو خراپەکاریی و خوێنڕشتنە.

_ تفسیر الطبري ب١ ل:٤٥٢_٤٥٣.

کۆمەڵایەتی ئیدارەو ئاراستەتانی لەسەر دابمەزرێنن.

قورئان ئاوا ئاراستەدەکات، کە حەقیقەتە عەقائیدییەکان _لەوانە حەقیقەتی بریکارییەکە_ بناغەی هەموو چوست چالاکیەکتان بێت، بۆ پەروەردەکردنی تاک و ئاراستەکردنی کۆو دارشتنی دیدو ڕێی حوکمڕانیی و سیستەمەکانی ئیدارەی دەوڵەت و ئاراستەی کۆمەڵگەکەتان.،چونکە حەقیقەتی بریکارییەکە سەرچاوەی چەندەها ڕێسای وایە.

ئێمەش لێرەدا هەندێک لەو ڕێسایانە دەخەینە بەرچاو، کە لە حەقیقەتی بریکارییەکەوە وەرگیراون، ئەوانەن کە پەیوەندییان بە باس و بابەتەکەی بەردەستمانەوە هەیە:

**خاڵی یەکەم: جۆرەکانی بریکاریی:**

شەرع بریکاریی مرۆڤی کردووە بە دووجۆرەوە: بریکاریی گشتی و بریکاریی تایبەتی.

**<u>-بریکاریی گشتی</u>**: بریکارێتیی هەموو مرۆڤێکە لەسەر زەمین بەو سیفەتەیان کە دەسەڵاتدارن و توانای ئاوەدانکردنەوەیان هەیەو دەتوانن وزەو توانایان بۆ ئەو مەبەستە بخەنەگەڕ.

ئەم جۆرەی بریکاریی لە سەیدنا ئادەمەوە (علیە السلام)،تا کۆتا مرۆڤ دەگرێتەوە.

**<u>-بریکاریی تایبەتی</u>**: بریکارییە لە حوکمکردن و داوەرییدا، ئەمیش دووجۆرە: بریکاریی دەوڵەتیی و بریکاریی تاک، هەردوو جۆری ئەم بریکارییە تایبەتییە هەر لە فەزڵ و لوتفی خوای گەورەیە، کە بەتایبەت دەیبەخشێت بەو بەندانەی کە خۆی هەڵیاندەبژێرێت بۆی. جا تاک تاک بن یان کۆی ئوممەتیی بن و خوای گەورە ئەو نیعمەتەی پێبەخشیبن، کە دەسەڵات و تەمکینی بە جۆرێک لە

زۆرجۆرەکانی تەمکین پێ بەخشیوون، وەکو بۆ بەنوئیسرائیلییەکانی بەردەستی فیرعەون،دەربارەیـــــان دەفەرمـــــووێ:﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ٥﴾ القصص: ٥ .

واتە: دەمانەوێـت فەڕو ڕێـزو نیعمەتـی خۆمـان بەو کەسـانە ببەخشـین کە لەسەرزەویدا (لەمیسر) موسـتەزعەفکرابوون، دەیـانکەین بە پێشـەواو ڕێـبەرو دەیانکەینە میراتگرانی دەسەڵات و حوکم. هەروەها دەفەرمـووێ: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ٢٤﴾ السجدة: ٢٤.

واتە: چونکە دڵنیایی تەواو (ئیمان ویەقـین)یـان بە بەڵگەکـانی وەحـی ئـێمە هەبـوو پێـوەی پابەنـدبوون و سـەبریان لەسـەر ناسـۆرەکانی ڕێ گـرت و هەر دیندارانە مانەوە، ئێمەش کردماننە پێشەواو ڕێبەرو ئاڕاستەوانی خەڵکی.

## دووجۆرەکەی بریکاریی تایبەت:

<u>١-بریکاریی دەوڵەتانە:</u> بەوە دەبێت کە دەوڵەتەکەی بەردەستی بپارێزێت، سەربەخۆیی و سەروەرێتیی خاک و ئاوو ئاسمان و بەرژەوەندییەکانی، هەروەها پاراستنی تاکەکانی کۆمەڵگەو دابینکردنی نان و ئەمانیان و شەونخونیکێشان لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندیی تاک و کۆیاندا، پاشان هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی دینەکەی خواو باڵابردنی شەریعەتەکەی..

ئەمەش هەر بە جیهـاد دەبێـت، بە قوتـارکردنی گەلان دەبێـت، لە دەسـت و دەسـەڵاتی پێشـەوایانی گـومڕایی و تاغوتـانی حـوکم.. خـوای گەورە بەڵێنـی بەو ئیمانـدارانە داوە، کە لە ڕەنجـی سـەلماندن و چەسـپاندنی ئەم بریکارییەدان سەریانبخات و بیانگەیێنێتە هێزو دەسەڵات (تەمکین).

وەک دەفەرمووێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ

لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٥٥﴾ النور: ٥٥ .

واتە: خوای گەورە بەڵێنی بەو کەسانەتان داوە کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە (پابەندبوون بە (عەقیدە) و (عیبادەت) و (شەریعەت)ەوە) کە دەیانکاتە بریکاریی تایبەت لەسەر زەمیندا، هەر وەکو ئیماندارانی پێش ئەوانی کردبووە بریکاری تایبەت، (وەکو: سەیدنا داودو سولەیمان (علیهم السلام)) و دینەکەشیان بۆ دەگەێنێتە تەمکین (هێزو دەسەڵات و سەروەریی) ،چونکە دینی خۆیەتی و، رازیبوو ئەوان پێوەی پابەندبن و رەنجی لە پێناودا بدەن، بەڵێنیشە خوای گەورە ئەو ترس و بیم و دڵەڕاوکێیەی لە ڕێی ئەم دینەدا تووشیان دێت، هەموویان بۆ بکاتە ئەمان و ئاسوودەیی، جگە لە پاداشتی قیامەتیان، بەو مەرجەی تەنها من بپەرستن و بە هیچ کلۆجێک لە هیچ شتێکداو بە هیچ رادەو بڕێک هاوبەشم بۆ دانەنێن[١].

---

(١) عبدالقادر عودة: المال والحكم في الإسلام ل:١٤_١٥.

_ تێبینی ئەوە دەکەین: کە یاسای خوایی لە هێنان و جێنشینکردنی ئوممەتان بۆ یەکتریی وایە کە: ئوممەتێک _کە شایستەو شیاوی بریکارێتییەکە بێت_ ئەرکی بریکاریی بە جوانیی جێبەجێکردبێت، دەیگەێنێتە تەمکین، هێزو دەسەڵاتی باڵای دەخاتە بەردەست.

بەڵام کاتێک ئەم شیاوێتییەی تێدا نامێنێت و لە سەلماندن و چەسپاندنی خیلافەتەکەدا سستیی دەنوێنێت، ئەو پلەو ئاستی رێزە خواییەکەی لەدەستدەدات، ئیتر رێبەرو سەرکردەو ئاڕاستەوان نامێنێت، دەبێتە شوێنکەوتەی ئوممەت و سەرکردایەتیتر. زەقترین نموونە بۆ ئەوە دەوڵەتی ئیسلامییە کە لە سەرەتای دەرکەوتنیدا بوو بە ڕیبەرو سەرکردەو ئاڕاستەوانی مرۆڤایەتیی و پێشەوایەتیی گەلانی سەر زەمینی گرتەدەست، بەڵام لە چەرخەکانی دوایی و ئەمڕۆییدا ئەوەندە زەلیلکەوتووە بۆتە شوێنکەوتەی هەموو
←

**٢-بریکاریی تاک:** بەوە دەبێت کە خوای گەورە هەندێک تاک دەگەێنێتە تەمکین (هێزو دەسەڵات)، یان جۆریتری تەمکین، مادام شایستەبووبن.

ئایەتەکانی بریکاریی (خیلافەت) لە قورئاندا جەخت لەوە دەکەنەوە کە بەبێ هەبوونی حکومەتێکی رێکخراوی دەزگایی ناتوانن بریکاریی تاک و بریکاریی دەوڵەتیانەیان بهێنێتەدیی.

ئەم حکومەتەش رەهاو بێسنوورنییە، بەڵکو کۆمەڵێک بنەماو رێسای سەرەکی ئیدارەو سیاسەت هەن، کە دەبێت لەو حکومەتەدا هەبن و هەر یەکەشیان سنووری پارێزراوبێت.. ئەو بنەماو رێسایانەش بە دڵنیاییەوە هەر لە دیدو تێڕوانینی بریکارییەکەوە وەرگیراون.

ئەمەش تەفسیلاتێکی دەوێت کە لەم خاڵانەدا دەیخەینەبەرچاو:

**خاڵی دووەم: بریکاریی (خیلافەت) بە بێ حکومەت نایاتەدیی:**

مادام بریکارێتیی مرۆڤ لەسەر زەمیندا بریتییە لە: سەلماندن و چەسپاندنی فەرمانەکانی خوای گەورە، کە دەبێت جێبەجێبکرێن و بەرهەڵستییەکانی کە نابێت توخنیان بکەونەوە، مرۆڤیش بە پێی سروشتی خۆی هەموویان هەموو کاتێک بە تەنها پابەندییەکی توندو تۆڵیان بەو فەرمان و بەرهەڵستیانەوە نابێت، بۆیە پێویستبوو هەموویان کۆمەڵکارانە بژین، تا یارمەتی یەکتریی بدەن لەسەر دین و دینداریی و گەیاندنی بانگەوازو پایەدارکردنی دینی خواو چەسپاندنی

---

هێزێکی دەرەکی! شیاوێتی رێبەرێتیی نەماوە، چونکە شایستەو شیاوی بریکاریی خوای گەورەی نەماوەو لە دیدو رێی خواوویستی لایداوەو وازی لە بانگەوازو شەریعەتەکەی خوای گەورە هێناوە. ئەمەش رێسایەکە خوای گەورە بۆ کەس نایگۆڕێت. ئەوی شایستەی بریکاریی نامێنێت دەبێت زەلیلانە ببێتە شوێنکەوتەی خەڵکیتر: (سُنَّةَ اللَّـهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّـهِ تَبْدِيلًا) الأحزاب/٦٢.

ئەحکامەکانی شەریعەتەکەی.

بۆیە هەر دەبوو کۆمەڵکارانە هاوکاریی یەکتریی بکەن و پەیوەندیی ئیمان و بانگەوازو کۆمەڵکارییان توندو تۆڵ بێت، تا وزەیان یەکخەن و دەسەڵاتێکی بەهێز پێکەوەبنێن، تا بەهێزیان بێتە ژێر سایەیی و لاوازیان پشتی پێببەستێت و بێخەم بێت.

بۆیە دەقەکانی بەردەستیان و واقیعی حاڵیان دامەزراندنی حکومەتێک دەخوازێت، کە کێشەکانی ناوخۆو راجوێیی و ناکۆکییان یەکلابکاتەوەو دادپەروەرییان لە نێواندا بچەسپێنێت.

ئەهلی تەفسیر لە لێکدانەوەی ئایەتەکانی خیلافەتدا، ئاماژەیان بەم حەقیقەتە کردووەو ریوایەتەکانی ئیبنومەسعودو ئیبنوعەبباسیان -خوا لێیان رازی بێت- لەسەر هێناوەتەوە.

طەبەریی لە ئیبنومەسعودەوە ئەو تێگەیشتنەی نەقڵکردووەو ریوایەتەکەی ئیبنوعەبباسیش ئاشکراو راشکاوانە دەفەرمووێ: (هو خلافَةٌ عن الله في الحُكْم بينَ خَلْقِهِ... وهو آدمُ ومَن قامَ مَقَامَهُ في طاعةِ اللهِ والحُكْمِ بالعَدلِ بينَ خَلْقِه).(١)

واتە: بریکارییە لەجیاتی خوای گەورەو حوکمکردنی خەڵکی و داوەرییکردنی نێوانیانە.. ئەوە سەیدنا ئادەم (علیە السلام)بوو، هەروەها هەر کەسێکی کە، کە لە جێی ئەو بێت لە ملکەچیی و گوێڕایەڵیی خوای گەورەو لە چەسپاندنی دادپەروەریی لەنێوان خەڵکییدا.

-ئیمامی قورطبی - رحمەاللە- هەر چەندە خەلیفایەتیە بریکارییەکەی تایبەت کردبوو بە سەیدنا ئادەمەوە (علیە السلام)بەو سیفەتەی، کە بریکاری خوای گەورەیە لە ڕاپەڕاندنی فەرمانەکانی و جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی لەسەر

(١) تفسير الطبري ل: ١٦٣ و دواتريى.

خەڵکی ،چونکە جەنابی (علیه السلام)یەکەمین نێرراوی خوای گەورە بــوو، ئەم بۆچوونە، پێچەوانەی بۆچوونی ئیبنوکەثیرە -رحمەالله -کە دەفەرمووێ: (وا دیارە کە خوای گەورە مەبەستی خودی سەیدنا ئادەم نەبووبێت).

ئەمە لە تەفسیری ئایەتەکەی خیلافەتدا وا دەفەرمووێ: ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ البقرة: ٣٠..

( قورطبی) ئەوەشی زیاتر ڕوونکردۆتەوە،کە مەبەست لێی: دانانی خەلیفەی حاکمە... دەفەرمووێ: (ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر تەعینکردنــی خەلــیفەو ئــیمام، کە پێشــەوای گەورەی کــۆمەڵگەو دەوڵەتە) ،کە گــوێڕایەڵیی و ملکەچیــی بــۆ دەرببڕرێت و ڕاو بۆچوونی هەموان یەکدەخات..

ئەمە داوای دانانی خەلیفەیەک دەکات، کە شەرعی خوا ڕابپەڕێنێت، لە ناو ئوممەتیشــدا راجــوێیی لەســەر فەرزێتــی دانــانی خەلــیفەی وا نیــیە، هەمــوو پێشەوایانی شەرعو جگە لە (عاصم) لەسەر ئەوە یەکدەنگن[1].

ئەمانە هەمووی بە واتای: بریکاریی تایبەتە، کە مەسەلەکانی سەروەرێتیی و دەسەڵاتی باڵاو حوکمڕانی خەلیفەیە، کە بۆسەلماندنی خوایەتی خــوای گەورەو چەســپاندنی عەبــدێتی مــرۆڤ بــۆی و جێبەجێکردنــی رێســاو بنەماکــانی دادپەروەریی لە ناو خەڵکیدان.

ئەم مانــــایە کە دەربــــارەی جێبەجێکردنــــی ئەحکامەکــــانی ئیســــلامە، بەڵگەنەویســتە، ئەمە نکــوڵی لەوە ناکــات، کە بریکــاریی (ئیســتیخلاف)ە،کە بەواتایەکی تریشی گشتییەو هەمــوو مــرۆڤ و مرۆڤــایەتیی دەگرێتەوە،چــونکە وەکو وتمان: خیلافەت دوو جۆرە: گشتیی و تایبەتیی.

---

(١) تفسير القرطبي ب١ ل:٢٦٤.

***ئیسلام ناچاری وەرگرتنی چۆنیەتیی و شێوازێکی حوکمڕانیی نەکردووین:**

**ئایەتەکـان کە ئەوەمـان لەسـەر فەرزدەکەن کە خەلـیفەیەک دابنێـین، تـا ئیدارەی دەوڵەت و ئاڕاسـتەی کـۆمەڵگەکە بگرێتەدەسـت و، شـەرعهان لەنـاودا بچەسپێنێت.**

**داوای جـۆرێکی تـایبەتی سیسـتمی حـوکمڕانی لێنەکـردووین، قورئـان سەرۆکایەتی دەوڵەت و کۆمەڵگە موسوڵمانەکەی بە چەنـدین زاراوە نـاوبردووە، وەکو: خەلیفە، کە بۆ سەیدنا داود (علیه السلام)دەفەرمووێ:** ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ﴾ ص: ٢٦ .

**واتە: ئەرێ داود ! ئـێمە جەنـابتهان بەخەلیفەدانـاوە، دەی ساداوەریی نێـوان خەڵکی بەحەق بکە.**

**سەیدنا ئیبراهیمی بە ناوی (ئیمام) ناوبردووە:** ﴿۞ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة: ١٢٤ .

**واتە: لەیادت بێت، کە خوای گەورە سەیدنا ئیبراهیمـی (علـیه السـلام)تاقی کـردنەوە (بە جۆرەهـا شـێوە تـا بسـەلمێت کە شـایانی ئەو پەیـمان و ئاسـتەی پێشەوایەتییەیە)، لە هەموو تاقیکردنەوەکانییدا سەرکەوتووبوو.**

**خوای گەورە پێی فەرمـوو: دەتـکەمە پێشـەوای خەڵکـی، فەرمـووی: ئەدی کوڕو نەوەکانم ناکەیت؟**

**فەرمووی: ئەم بەڵێنە ستەمکاران ناگرێتەوە، هەر کەسێک ستەمکاربێت _بـا لە نەوەو وەچەی جەنابیشت بێت_ ئەو بریکاریی و تەمکـین و پێشـەوایەتییەی نادرێتێ.**

**بۆ (طالوت)یش (علیه السلام)دەفەرمووێ: مەلیک؛**﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ

﴿قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا﴾ البقرة: ٢٤٧ .

واتە: خوای گەورە (تـالوت)ی بە مەلیکێتـی بـۆ هەڵبـژاردوون و کردوییێتـی بەسـەرکردەو رێبەرتـان.. دیـارە ئەم دەقـانەش مەبەسـتیان رێبەرێتـی گشـتی و سەرۆکایەتیە.

کە سیستمی حوکمی ئیسلامیی زاراوەی خەلیفەو خیلافەتی بەکارهێنـاوە، خۆ بە رێکەوت و هەوانـتە نەهاتۆتەکـایەوە، هـۆیەکەی ئەوەیە :کە لە لایەکەوە زاراوەیەکی قورئانی دەسەڵات و حوکمڕانییە، لە لایەکـی تـری واقیعەکەشـەوە، نەدەکـرا بەسـەرۆکی دەوڵەتە ئیسـلامیی، یەکەمینجـار بوترایـا :(ئیمپراتـۆر، مەلیـک، فیـرعەون، قەیسـەرو کیسرـا..) ،کە هەموویـان لەسـەر جۆرێـک لە سیستمی ویراسی خانەوادەیی دەڕۆیشتن و، رەعیـیەت هەقـی بەسـەر رەفتـاری شـەڕاب و زینـاو سـتەمکارییانەوە نەبـوو، ئەمـانە هیچیـان شایسـتەو شـیاوی هەڵگری پەیام نەبوون..

بەڵام سەرۆکی دەوڵەت و کۆمەڵگە موسوڵمانەکە، پێش هەمـوو شـتێک لە لایەن خەڵکەکەوە هەڵبژێررا تا ببێتە راپەڕێنەری شەرع و جێنشینی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

ئەمەش ئەو واقیعەبوو کە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (صلی اللـه علیـــه وســـلم) تووشـــی هـــاتن، کە دەیـــانزانی دەقە شـــەرعییەکان دانـــانی دەسەڵاتدارێکی باڵایان لەسەر فەرزدەکات.

بۆیە بە سەیدنا ئەبوبەکریان - خوالێی ڕازی بێت –وت: (خلـیفە رسـول اللـه (صـلی اللـه علیـه وسـلم)) ،چـونکە وای لـێ چـاوەڕوان دەکـرا، کە جێگـری پێغەمبەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) دەبێـت لە راپەڕانـدنی شـەرعدا، کە خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی مرۆڤ و چەسپاندنی دادپەروەریی شەریعەتە..

خودی زاراوەی (خەلیفە)ش، دیـارە وەکـو ئاماژەمـان پێـدا دەگەڕێـتەوە بـۆ

**جێنشینیی و بەدواداهاتن.. هیچ کەس لە یاوەران کێشەی لەسەر ناوی (خەلیفە) بۆ سەیدنا ئەبوبەکر بۆ دروستنەبوو ،چـونکە دەقە شـەرعییەکانیش رۆشـنبوون، کە جەختیان لەو زاراوەو مانایانەی کردبۆوە... لەمەوەبـوو کاربەدەسـتی بـاڵای دەوڵەت و ئوممەتیان ناونا: خەلیفەو دواتریش سیستمی حوکم زیاتر خۆیگرت و بوو بە سیستمی خیلافەت، یان (ئیمام)و (ئیمامەت)[1].**

---

(١) عبدالقادر عودة: المال والحكم في الإسلام ل: ١٥و دواتریی، هەروەها ل: ٧٥ و دواتریی.

_ کە دەبینین( عبدالكريم الخطيب) دەڵێ: (خیلافەت) زاراوەیەکی شەریعەت نییە، (خەلـیفە)ش کە ئەم نازناوە هەڵدەگرێت، هیچ ئیمتیازێکی زیاتری بەمە دەستناکەوێت، بەڵکو هەر وەکـو پـێش بوونی بە خەلیفەیە.. هەر یەکێکە لە شوێنکەوتووەکانی شەرع.

کاتێک کە هەڵیانبژاردووەو خسـتوویانەتە ئەو پـلەو پۆسـتە، مانـای وا نیـیە کە ئەو مەنـزیلە نوێیەی دەستکەوتی نوێی بۆ خۆی داوەتێ، نـا، چـونکە هەمـوو خەڵکـی لەژێـر سـایەی شـەرع و بەرامبەر شەرع وەکویەکن).

بەشی یەکەمی قسەکانی، هیچ ئیشکالێلی تێدا نییەو وایە، خەلیفە هەر وەکو یەکێکی تـری ژێـر سـایەی شـەریعەتەکەیەو بـۆی نیـیە یاسـا دابڕێژێـت، بەڵام ئەوەی کە دەڵـێ: خـیلافەت زاراوەیەکی شەریعەت نییە، پێی رازی نین، چونکە وا نییە. هەمـوو ئەو بەڵگـانەی لە دەقەکـانی سەرەوەدا هێنامانەوە ئەوە دەسەلمێنن:کە خیلافەت زاراوەی خودی شەریعەتی ئیسلامەو رەسەنەو لە هیچ لایەنێـک وەرنەگیـراوە. ئەگەرچـی دەقێکـیش نیـیە ناچارمـان بکـات کە هەر دەبێت ئەو بەکاربهێنین. چونکە ناو بە قەدەر نـاوەرۆکەکە گرنگیـی نیـیە. کتێـبەکەی عبـدالكريم الخطيـب: الخلافة والإمامة ل: ٢٤٢.

_ (ئەرنۆڵــد)ی رۆژهەڵاتناســیش لەوەدا بە هەڵەدا چــووە کە پێــی وایە: زاراوەی خەلــیفەو ئایەتەکـانی خـیلافەت لە قورئانـدا ئەوە دەگەیێـنن:کە خەلـیفە وەکیلـی خـوایە لەسـەر زەمـین، مەبەستیش لەمە زیادکردنی پیرۆزیی پلەو ئاستی خۆی و دەسـەڵات و سیاسـەتەکانێتی). بـڕوانە: .(T.W.Arnold: The Caliphate, P.22)

ئەمەش وا نییە، چونکە وەکالەتی خوایی بە بوون بە خەلـیفە نایاتەدەسـت. واتـای ئایەتەکـان رۆشنن کە مەبەست لێیان ئەوەیە: کە خەلیفەو حـاکمی دەسـەڵاتداری بـاڵای موسـوڵمانان _بەڵـێ بریکاری خوای گەورەن لەسەر زەمیندا_ بەڵام کاتێک دەبنە وەکیلی خـوای گەورە لەسـەرزەمیندا کە بە دینەکەیەوە پابەندبن و سووربن لەسەر جێبەجێکردنی شەریعەتەکەی.

**خاڵی سێیەم: هێنانەدیی خیلافەت، سەلماندنی مرۆڤێتی مرۆڤە:**

خیلافەت لە ناوەرۆكیدا دوو لقە: لقێكی خوایی و لقێكی ئینسانی.

خـیلافەت بە مانـای لقەخـواییەكەی واتە: مـرۆڤ بە پێـی ویسـتی خـوایی خەلقبووەو بە سیماو سیفاتێک، كە ئەگەر بە پێی مەنهەجی خـوایی رەفتـاریكرد دەبێتە سەروەری مەخلووقاتەكان و ئاست و پلەی لە هەموان باڵاتردەبێت، ئەگەر بە پێی مەنهەجی خوای گەورە رەفتـاری نەكـرد لە ئاسـتی ئاژەڵـدا دەبێـت، یـان ئاستی خوارتر لەوان.

جا ئەو كەسەی كە دەیەوێت لە مەخلووقاتیتر جیاوازو باڵاتر بێـت پێویسـتە خـوایەتی خـوای گەورە قبووڵكـات و عەبـدێتی خـۆیی بـۆ بنوێنێـت، بەوەی فەرمانەكانی خوای گەورە جێبەجێبكات..

ئیبلیس كە بەر لەعنەتی خوای گەورە كەوت و دەركرا، لەبەر ئەوەی نەبـوو كە باوەڕی بە خوایەتی خوای گەورە نەبووبێت، بەڵكو سیفەتی عەبـدێتییەكەی خۆیی رەتكـردەوە، بەوەی كە فەرمـانی خـوای گەورەی لە سـوجدەبردنەكەدا بـۆ سەیدنا ئادەم (علیە السلام)جێبەجێنەكرد.

واتە: ڕازی نەبوو بریكـارێتیەكەی خـوای گەورە بە سـەیدنا ئـادەم و مـرۆڤ بدرێت، ڕازی بـوون بە فەرمـانی خـوای گەورەو راپەڕانـدنی بریكـارێتییەكەی خوای گەورە لەسەر زەمین شایانی پلەو ئاستی پیاوچاكییە.

- بە مانـای لقەئینسـانییەكەی واتە: سـەلماندنی خواویسـتییانەی مـرۆڤ، بەو سـیفەتەی كە بریكـارێتیەكەی بـۆ خـوای گەورە سـەلماندنی مرۆڤێتیەكەیەتـی ،چونكە ئایەتەكە: ﴿إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ شاهێدە، بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی بریكارێتییەكە جودابوونەوەیە لە مەخلووقاتیترو سەركەوتنە بە پلەو ئاستەكانی

مرۆڤێتییدا، تا خواویستێتی وایدەسوڵحێنێت دەیگەیێنێتە لوتکەی کامڵبوونی دنیاییەکەی..

خوای گەورە فەرمووێ:﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ نەک (جاعل الانسان خليفة) ،چونکە بریکارێتیی ئەوە نییە کە مرۆڤ بێت، بەسە... نا، ئەوی کە بریکارێتیەکە سەرڕاستانە جێبەجێدەکات، دەبێتە مرۆڤ..

واتە: مرۆڤێتی هەر بەشەرێتی نییە، بەڵکو بریکارێتیەکەیە کە بە هەوڵدان و پەروەردەبوونی خواویستانە دێتەدیی، بەوە دێتەدیی کە ئەرکی بریکارێتیەکە ئەدابکات، رۆڵی بریکاریی ببینێت.

ئەمە کرۆک و تەوەری بریکارێتییکەیە، ئەمەش ئازادیی و سەربەخۆیی مرۆڤ دەخوازێت، تا بتوانێت بریکارێتییەکە مومارەسەبکات، کە دەبێ بە مەنهەجی خوای گەورە بێت..

بۆیە نابێت هیچ شتێک لە رێزو قەدری مرۆڤایەتییەکەی مرۆڤ گەورەتربێت، کە بریکارێتییەکەیەتی.. نابێت لەبەرخاتری ئەوەی مانگێکی دەستکرد دروستدەکات یان بەرهەمی ماددیی زیاترکردووە سیفەتی مرۆڤێتیەکەی _کە بریکارێتییەکەیەتی_ لێ بسەندرێتەوە ،چونکە مرۆڤ سەییدی مانگەدەستکردەکەو سەییدی بەرهەمی ماددیشە[1].

---

(١) مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ٢٠٧ و دواتریی، هەروەها: خصائص التصور الإسلامي ل: ٨٩_٩٠.

**خاڵی چوارەم: سەربەخۆیی مرۆڤ:**

پێشتر باسمان لە مەرجەکانی شایستەبوونی مرۆڤ کرد، بۆ بەدێهێنانی ئەرکی بریکاریی خوای گەورە لەسەرزەمین، چ لە لایەنی خەلقکردنی جەستەیی و رۆحیەوە بێت، چ لە لایەنی هزرو ژیریی و لایەنی فیکریی و مەعنەوییەوە بێت، کە تەوەری هەموویان سەربەخۆیی و ئازادیی مرۆڤە، بە هەرسێ بوارەکەیەوە: توانای مرۆڤ لە هەڵبژاردندا، توانای مرۆڤ لە کارکردندا، زەرورەتی هەبوونی زانست و زانیاریی دەربارەی چۆنیەتی ئەنجامدانی کار..

لەبەر ئەوەی بواری ئەم باسەمان ناشێت زۆر بەرفراوان ببێت، بۆیە لێرەدا زیاتر باسی سەربەخۆیی ویست و ئازادیی ئیرادە چڕدەکەینەوە، بەو سیفەتەی کە بناغەی ئازادییەکانیترێتی.

کاتێک خوای گەورە ویستی مرۆڤ وا ئامادەبکات، کە شیاوو شایستەی بریکارێتیی ئەو بێت لەسەرزەمین، راسپاردە (ئەمانەت)ە کەی خۆیی پێسپارد، کە فووی رۆح پێداکردنیبوو لە رۆحی خۆی..

ئەم رۆح بەبەرداکردنە، هەندێک سیفەتی خوای پەروەردگاری بەم مەخلووقە رێزلێگراوە بەخشی.. ئاوا لە مەخلوقاتیتر جودابۆوەو بوو بەتوخمێکی زیندووی ئازادو سەربەخۆو سەرپشک و بەتواناو بکەرو زاناو شارەزا...

ئەم سیفەتانە هەرچەندە کەم وکورت و سنووردارن و لایەقی مەخلوقێتی مرۆڤن، بە سیفەتی رەهاو بێسنوورو بێوێنەیی خوای پەروەردگار بەراووردناکرێن و هیچ یەکێک لە سیفەتەکان لە هیچ رادەو برِو شێوازو چۆنیەتیەکیاندا لێکناچن ،چونکە سیفاتی خوای گەورە لایەق بە خۆیین، کە زاتی بێوێنەو تاکانەیەو سیفاتی مرۆڤ لایەق بە مرۆڤێتیەکەی خۆیەتی، کە

سـنووردارو دیـاریکراوی ڕادەو بـڕو کـات و شـوێن و مـاهییەتە، بەڵام ئەو سیفەتانەی خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشـین، سـیفاتی جیاوازکـاری ئەون و بـۆ شایستەبوونێتی، بۆ ئەو مەکانەت و ئاست و پلە گەردوونیەی بریکاریی خـوای گەورە، کە لە نێـوان ئەم هەمـوو مەخلووقـاتەدا تەنهـا ئەم هەڵبژێـرراوە بـۆ ئەو لایەقبوون و شیاوو شایستەبوونە..

ئەو فووی ڕۆح پێداکردنە خواییەی بناغەو زەمینـەی نادیـاری ئـازادییەکەی مرۆڤایەتییە... میراتی خواییە (ئەگەر دەستەواژەکە لێرەدا شیاو بێت)، کە خوای گەورە بە مرۆڤیدا، تا ڕۆڵی بریکارێتییەکی شـیاوانە لەسـەر زەمینـدا ببینێـت و ئەرکەکانی سەرشانی ڕاست و ڕەوا جێبەجێبکات..

بۆیە بەڕاستی، کە وتـراوە: ئەگەر بریکـاریی خـوای گەورە لەسـەر زەمینـدا بریتی بێت لە کامڵبوونی مرۆڤایەتیی مرۆڤ لە ژیانی دنیاییدا، کە داوایلێکراوە لەسـەر زەمینـدابیگاتێ، واتە: داوای لێکـراوە ببێـتە نمـوونەی پێشـەوایەت و ئیقتیداپێکردنی تاک وکۆ و توخمی مرۆڤ لە کـۆمەڵگەو دەوڵەتـدا، ئـازادیی و سەربەستییەکەی هۆکاری هێنانەدیی هەموو ئەوانەیە[1].

لەبەر ئەوەی ئـازادیی و سەربەسـتی مـرۆڤ، هۆکـاری هێنـانەدیی بریکارێتییەکەی خوای گەورەیە لەسـەرزەمین و هۆکـاری پاراسـتنی راسـپاردە خواییەکەیەو، پاڵنەرو هاندەرو گوڕو تینی پاڵفتەبوونی مرۆڤ و ساڵح بوونێتی، تا پاکوپاڵفتەو سەرڕاست بگەڕێتەوە لای خوای گەورە، ئەمە کە ئامانجی باڵای مرۆڤە بە بێ ئازادیی و سەربەستی نایاتەدیی.

بۆیە ئازادیی و سـەربەخۆیی مـرۆڤ بەشـێکە لە ئەمـانەتە خـواییەکەی کە پێیبەخشراوە، بەشێکە لە ڕۆحـی وجـودو ڕێـزی بریکـارێتیەکەی، بـۆیە ناشـێت ئازادیی لە وجودی مرۆڤ دارنرێت...

---

(١) مشكلة الحرية في الفكر الإسلامي الخالص ل: ٤١.

له ئیسلامییشدا هۆکـار له مەبەسـت جودانـاکرێتەوەو هەردووکیـان لازم و مەلزومی یەکترین و یەکتریی تەواودەکەن... کەوابوو ئازادیی مـرۆڤ بەشـێکه له ڕۆحی، له بریکـارێتیەکەی و هەر دەبێـت بـۆی دەسـتەبەر بکرێـت.. چـونکه هۆکاری سەرکەوتن و کاملبوونێتی.

ئێستا ئەم حاڵەته بە چەند لقه باسێکی کورت و پوخت زیاتر شی دەکەینەوە:

<u>١-ئازادیی، هۆکارە نەک ئامانج:</u>

له دیـدو تێڕوانینـی ئیسـلامەوە ئـازادیی مـرۆڤ هۆکـارە، نەک ئامـانج.. ئامـانجەکه هێنـانەدیی بریکـارێتیی خـوای گەورەیە لەسـەرزەمین، کە مـرۆڤ بەهەمـوو توانـایەوە هەوڵـدەدات بگـاته ئاسـته باڵاکـانی کـاملبوونی خـۆی و شایستەیی بریکارێتیەکەی.

بە مانـایەکیتر، سـەلماندنی تەواویـی خـوایەتی خـوای گەورەو چەسـپاندنی تەواوی عەبدێتیی خۆی بۆی، تاکه ڕێبازو شێوازو چۆنیەتی پاراسـتنی ئـازادیی مـرۆڤ قبـوڵکردنی عەبـدێتیکردنێتی بـۆ خـوای تاکوپـاک، بە شـێوەیەکی سەرپشکانەو سەربەستانه، تا سەربەستانه بچێته ریـزی مەخلوقاتەکـانی تـرو هەردوو فەرمانی خوای گەورە وەربگرێت و بیچەسـپێنێت : فەرمـانی قەدەریـی گەردوونی و فەرمانی قەدەریی شەرع..

ئەوەش بەوە دەبێـت کە مـرۆڤ فەرمانەکـانی خـوای گەورە _کە ئـازادە له وەرگرتنییـــدا_ وا وەربگرێـــت کە فەرمـــانی گەردوونـــین و پێویســـته جێبەجێبکرێن،ئاوا سەرپشکانه دەبێته عەبدی ملکەچ و گوێڕایەڵی خوای تاک و پاک و له عەبدێتی بۆ غەیری خوای گەورە دەردەچێت.

لەم ڕێگایەشەوە بریکارێتیەکه دەسەلمێنێت و دەچەسپێنێت و دەگـاته ئاسـتی باڵای کاملێتیی بەشەریی له ژیانییدا.. سەلماندن و چەسپاندنی ئەم عەبدێتییه بۆ خـوای گەورە، تـاکه ڕێـی دابینکردنـی ئـازادیی و سەربەسـتیی و سـەربەرزیی

مرۆڤە، کە ناهێڵێت وای لێبێت ببێتە عەبدی غەیری خوای گەورەو سەری بۆ غەیری خوای خاوەن فووە رۆحەکەی دانانەوێنێت..

ئا ئەم هەست و ئینتیای (عبوودییەت)ەیە بۆ خوای گەورە کە رێزی هەموو مرۆڤەکان دەپارێزێت، هەرچەند پلەو پایەی ژیانی دنیاشیان جیاواز بێت لە یەکتریی.

ئائەم (عبوودییەت)ەیە بۆ خوای گەورە، کە دەسەڵاتدارو بێدەسەڵات، دەوڵەمەندو هەژار، گەورەو بچووکی پیاوو ئافرەت لە (عبوودییەت) بۆ غەیری خوای گەورە قوتاردەکات.

هەر ئەمەشە ناهێڵێت مرۆڤی ئیماندارو شایستەی بریکاریی لوتبەرزو هەراڵ و مەغروردەربچێت (چونکە رێبازی پێغەمبەران (علیهم السلام) دەگرێتەبەر، نەک رێبازی فیرعەون نەمرودو ئەبوجەهل)، ئەم هەستی ئینتیای (عەبدێتی بۆ خوای گەورە)یە، کە بە تەقواکاریی پارسەنگ رایاندەگرێت و ناهێڵێت حەزی مونحەریف لاسەنگیان بکات، یان مۆنجی فەساد رایاندات،چونکە خواویستانە پەروەردەبوون و خواویستانە بزوتن.

نە خۆیان سنووری خۆیان بەزاندووەو نە هێشتوویانە عەبدێکی وەکو خۆیان، خۆیان لێبکات بە خواو بە کەیفی خۆی، بە دیدیی خۆی، بە پێی بەرژەوەندیی و (زانین)ی خۆی دەستورو یاسایان بۆ دابڕێژێت، بە هەواوهەوەسی خۆی داوەرییانبکات (و خۆی بکاتە سەرچاوەی دیدو تێڕوانینی ژیانبینیی و جیهانبینیی و سەرچاوەی دروشمی پەرستن و قیەمی کۆمەڵایەتیی و رێسای رەوشت و بەرنامەو رێبازی بزاوت و هەڵوێست و یاساو رێسای دەوڵەت و بنەمای ئاراستەی کۆمەڵگە)[1].

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێرەوە سەر سەرچاوەی پێشوو ل: ٣٨ و ٢٠٧ و دواتریی، هەروەها: خصائص التصور الإسلامي ل: ١٥٤ و دواتریی.

گومانی تێدا نییە، کە پێناسەی ئازادیی بەم سیفەتەی کە هۆکارە نەک ئامانج و پێوەپابەندبوونی زامنی حەقیقی سەلماندن و چەسپاندنی بنەماو ڕێسا ڕەوشتییەکان و قیەمە کۆمەڵایەتییەکەیەو پارێزگارو پارێزەریانە..

ئەمە بە پێچەوانەی دیدو تێڕوانینی مەدرەسە فەلسەفییەکانەوەیە، کە ئازادییان پێ ئامانجەو دەڵێن: دەبێ ئەمە مەبەستی سەرەکی بەگەڕخستنی وزەو تینی تاک وکۆی کۆمەڵگەکان بێت... لەم ڕوانگە لاسەنگەوەیە، کە هەموو قیەم و ڕێسایەکی ئەخلاقیی و بەهایەکی پیرۆزی کۆمەڵگەکان کراون بە قوربانی ئەو ئازادییەی کە لە ڕاستیدا (لە لایەنی بەرەڵایی جنسی و دڕندایەتی ململانێی سیاسیی و ئابوورییدا) دابەزینە بۆ ئاستی ئاژەڵێتی.

**٢-ئازادیی مافێکی ڕەسەنی مرۆڤە:**

موسوڵمان لە دیدو تێڕوانینی ئیسلامەکەیەوە وا دەبینێت، کە ئازادیی مرۆڤ مافێکی سەرەکی ڕەسەنی خۆیەتی، کەس بۆی نییە نازو منەتی بەسەردا بکات، کە گوایە: ئەو بۆی دەستەبەرکردووە،چونکە ئازادیی مرۆڤ بەشێکە لە میهرو سۆزو لوتفی خوای گەورە کە بە مرۆڤی بەخشیووە، تا وجودی شیاوی خۆیی پێ بسەلمێنێت و ئەرکەکانی بریکارێتییەکەی لەسەر زەمییندا بهێنێتەدیی.

بۆیە هیچ کەسێک، هیچ هێزێک، هیچ دەسەڵاتێک _هەر چەند دەسەڵاتداربێت_ بۆی نییە ئەم ئازادییە بەرفراوانە لە خەڵکی بگرێتەوە، چجای ئەوەی لێیان بسەنێت و نەهێڵێت ئازادبن، لە خۆپەروەردەکردن و خۆشایستەکردنیاندا بۆ بینینی ڕۆڵی بریکارییەکە، بەو شێوە پەسەندەی کە خوای کردگارو بەخشەری ئازادییەکەیان دیاریکردووە..

ئەم زەوتکردنەی ئازادیی مرۆڤ، زەوتکردنی ئەو ڕاسپاردەخواییەیە، کە خوای گەورە لای مرۆڤ داینـاوەو فەرمـوویەتی: بیپارێزە، تا ئەو کاتەی لێت وەردەگرمەوە.. جێگیربوونی ئەم حەقیقەتە عەقائیدیی و ڕێسا گەردوونییە لە

ناخی موسوڵماندا زامنی نەهێشتنی گیانی دیکتاتۆرێتیی و فیرعەونێتییە...

ئەمەیە کە ناهێڵێت یەکێک خۆی لەو خەڵکە بکاتە خاوەن و حاکم و ئاراستەوان و بە پێچەوانەی شەریعەتی خوای گەورە حوکمی خەڵکەکە بکات، ئەمە خۆی لە خەڵکەکە کردۆتە خواو پێویستە بەرهەڵستیی بکرێت.

پێویستە لابدرێت و رابدرێت، هەر چەند ئەرکێکی زەحمەت و بەژان و خوێناویش بێت.. هەر چەند تین و ژانی چەوساندنەوەشی بێتەسەر، هەر دەبێت ئەم ململانێیە تەواوبکات.

تەواوکردنیشی تەنهاو تەنها بە لابردن و رادانی ئەو (تاغوت)ە دەبێت، کە خۆی لە خەڵکی کردۆتە خواو، بۆچوونی خۆی کردۆتە شەرع و ئازادیی و دادپەروەریی لە خەڵکەکە زەوتکردووە.

ئائەم دیدە روون و تێروانینە واقیعییە، ئائەم پێناسەو شیکارو توێژینەوەیە، لەگەڵ بنەماو رێسا عەقائیدییەکانی ئیسلامدا یەکدەگرێتەوە، نەک ئەو گەرەلاوژێ و تێکەڵاوێتییەی لە پێناسە فەلسەفییە جیاوازەکان و دیدو تێروانینە فیکرییە ئاڵۆزەکانەوە دەبینین و دەبیستین، کە گوایە ئازادیی تاک زەمینەی سیستمی حوکمی دادو رەواییە..

ئەوەی کە لە بەندی یەکەمدا شەرحمانکرد،[١] کە گوایە: ئازادیی مافێکی سەرەتایی سروشتییەو تاک پێش دروستبوونی کۆمەڵگەو دەوڵەت هەیبووەو لە هەندێکیان تەنازولیکردووە بۆ دەسەڵاتداری باڵای کۆمەڵگەکەی، وەکو گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی نێوان خۆیان و دەسەڵاتدارەکە.

---

(١) مەبەستی نووسەری بەرێز (الفصل الأول)ە لە (الباب الأول)ی کتێبەکە کە سێ باب و شەش فەصڵە، ئەمەی بەردەست _ باسی ئیستیخلافەکە_ فەسڵی دووەمی (الباب الأول)ە کە ٩٨ لاپەرەیە لە کۆی ٥٨٠ لاپەرەی عەرەبیەکەی..

ئەمە کە لە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتیی و پەیماننامەکانی مـافی مرۆڤـدا دەردەکەوێت، کە غەیری پابەندبوونی ئەدەبی زیاتر هیچیتری پێوەنەبـوو.. تەنهـا ئەوانە پێوەپابەنـدبوون کە لە کـات و شـوێنی بەرژەوەنـدی خۆیانـدا بۆیـان بەسوودبوو... ئەمە جگە لەوەی کە هەتا ئێستاش بواری موناقەشـەو ڕەدوبەدەلە کە مافەکان چین و سنووریان چیـەو پاراسـتنیان چـۆن دەبێـت و چـۆن لەسـەر سەلماندن و چەسپاندنیان بێتەدەخولات ڕێکەوین!!.

پێناسەو شیکاری ئیسلامیی بۆ ئازادیی مـرۆڤ، بەشـێکە لە خـودی بنەمـا عەقائیدییەکەی ئیسلام، کە موسوڵمانی لەسەرە. ئازادیی _لە دیـدی موسـوڵمانی ئیسلامناسەوە_ بەشێکە لە پێکهاتەی دیدو تێڕوانینەکەی بۆ (وجود).

بۆیە باوەڕپێهێنان بە لایەوە فەرزەو پاراستنیشی هەر فەرزە،چونکە بەشێکە لە بریکارییەکەی... ئازادیی مرۆڤ لە دیدی موسوڵماندا ئەو بناغەی بریکارییەیە کە سیستمی کۆمەڵایەتیی و سیاسەت و حوکم و ئابووریی و سیسـتمەکانیتری لەسەر دادەمەزرێنێت.

<u>٣-ئازادیی وڕێکخستنی کۆمەڵگە:</u>

کە ئازادیی مـافێکی ڕەسـەنی مـرۆڤ بێـت و هۆکـاری سـەرەکی هێنـانەدیی بریکارێتیەکەی بێت لەسەرزەمین و لەجیاتی خوای گەورە حـوکم و داروەریـی نێوان خەڵکی بکات.

کەوابـوو: دەبێـت سەربەسـتی مرۆڤەکـانیش ئـازادو کراوەبێـت، تـا لە هەڵبژاردنی کاروباری ژیانی خۆیاندا سەرپشک بن، ڕاو بۆچوونی سـەربەخۆیان هەبێـت، لە هەمـوو شـتێکی گەورەو گچـکەی ژیانیانـدا، مـادام سـنووریان نەبەزاندووەو دەستدرێژییان نەکردۆتە سەر کەس و مافی کەسێکیتریان پێشـێل نەکردووە.

ئەمە سەلماندن و چەسپاندنی مرۆڤێتیەکەی مرۆڤە.. مادام ئـازادیی ڕێگـای

چەسپاندنی بریکارێتیەکەیە، بریکارێتیەکەش چەسپاندنی مرۆڤێتیەکەی مرۆڤە.

کەوابوو: ئازادیی هۆکاری سەلماندن و چەسپاندنی مرۆڤێتی مرۆڤە.. لەبەر ئەم کاریگەرێتیەی ئازادییەیە کە دەقە قورئانییەکان ڕێسای نەگۆڕیان بۆ ئازادیی مرۆڤ دیاریکردووە، کە جێگیرو دابینەو ڕێ بە دەست تێوەردانی نادات... هەر لە سەرەتاوە قورئان بواری باوەڕهێنان و باوەڕنەهێنانی بۆ مرۆڤ کردۆتەوەو سەربەستیکردووە لەوەی باوەڕبەخوای گەورەو پەیامەکەی دەهێنێت یان نا، موسوڵمان دەبێت یان نا؟ کەیفی خۆیەتی.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ الكهف: ٢٩ .

واتە: حەق لە خوای پەروەردگارتانەوەیەو بۆتان هاتووە، جا کێ حەزدەکات موسوڵمان ببێت با باوەڕی پێبهێنێت و کێش دەیەوێت لەسەر دیدو ڕێی کوفر بێت، با بمێنێتەوە..

ئەمە ئازادیی و سەربەستییە، تەنانەت لە باوەڕهێنان بە خودی خوای گەورەی کردگاری گەردوون و ژیان و مرۆڤیش... ئاوا ڕۆشن و ئاشکراو ڕاشکاو بە دەقی قورئانی خوایی، تا کەس ئەو مافە بە خۆی نەدات یەکێکیتر ناچاری باوەڕهێنان بکات..

تەنانەت بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی (صلی اللە علیە وسلم) دەفەرمووێ: کە بۆت نییە خەڵکی ناچاری باوەڕهێنان بکەیت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾﴾ يونس: ٩٩ .

واتە: ئەگەر خوای پەروەردگارت بیویستایە، هەر هەموو دانیشتوانی سەرزەمین، هەر هەموویان باوەڕیان دەهێناو موسوڵمان دەبوون، جا کە ئەو وای

نەکردووە، جەنابت دەتەوێت خەڵکی ناچاربکەیت، تا موسوڵمان بـبن؟ بـۆت نیـیە (جا کە خواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەس ناچـارنەکەن لەسـەر باوەڕهێنان، ئیتر چۆن کەسـێک، هێزێـک، دەسـەڵاتدارێک، ئەو (مـاف)ە دەداتە خۆی کە بە زۆر خەڵکی موسوڵمان بکات؟! (١)

لە ڕاستییدا ئازادیی لە ئیسـلامدا هەر مـوڵکی تاکەکـان نەبـووە، مـوڵکی گشـتی کـۆمەڵگەکەش بـووە، لە هەڵبـژاردن و لە داڕشـتنی سیسـتمەکانی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و ئەوانیتریشدا.. ئەوە ئێرە جێباسی ئەم خاڵە نییە، دەنا بە تەفسیل باسی ئەوەمان دەکرد، کە هەر وەکو، کە کەس بـۆی نیـیە دیـنەکە بە زۆر بدات بەسەر کەسێکداو ناچاریی بکات تا موسوڵمان ببێت، کەسـیش بـۆی نییە سیستمێک بەسەر کۆمەڵگەدا فەرزبکات.

باسی ئەم خاڵە لە جێی خۆیدا دێت( ان شاء الله)، بەڵام لێرەدا ئاماژەیەک بەم خاڵە جەوهەرییە دەدەین.

٤-ئازادیی و سیستمی سیاسیی لە ئیسلامدا:

مادام ئازادیی بنەما سەرەکییەکەی تاکی مرۆڤ و زەمینەی سیسـتمەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵگەو دەوڵەتە، ئازادیی کۆمەڵگە بۆ هەڵبژاردن، یان داڕشـتن و چەسپاندنی سیستمی حوکم، یان سیستمەکانیتر، فەرزە.

---

(١) ئەو گومانەی کە بە جیهادەوە لکێنراوە کە گوایە: (جیهاد بۆ ئەوەیە کە بە زەبری شمشـێر خەڵکـی موسوڵمان بکرێت)، پـووچەڵەو ڕەوانـدنەوەی حەقە. ئیسـلام جیهـادی بـۆ ئەوە بەرپـانەکردووە، تـا تاکەکان ناچاری موسوڵمانێتی بکات، نا، نەخێر.

جیهاد لە ئیسلامدا بۆ لادان و ڕادانی ئەو حکومەت و حاکمە دەسەڵاتدارانەیە، کە خەڵکەکەیان ناچارکردووە دیدو ڕێی کوفر بگرنەبەرو تا بەزۆر گومڕابین، ئیسلام دەیەوێـت ئەم هێـزانە لادات و ڕادات کە بوونەتە بەربەستی ڕێی گەیشـتنی بـانگەوازە خـواییەکە بەو خەڵـکە. کە ئـازادبوون و بانگەوازەکەیان کەوتە بەردەست ئیتر خۆیان ئازادو سەرپشکن کە ئیسلامەکە وەردەگرن یـان نـا.. بڕوانە: مشكلة الفكر الإسلامي الخالص ل: ٢١٢ و دواتریی.

ئـازادی کـۆمەڵگەکە لە بـواری ڕێکخسـتنی کـۆمەڵگەو دەوڵەتەدا وەکـو ئازادی تاکەکە وایە، لە هەڵبژاردنی (ئیمان) یان (کوفر)دا... تاکەکان کە (ئازادیی بیـرو بـاوەڕ)یـان هەیە، کـۆمەڵگەکەش -کە سـەرجەمی تاکەکـانێتی_ ئـازادیی هەڵبژاردنی هەیە.. هەڵبژاردنی هەموو سیستمەکانی ڕێکخستنی کـۆمەڵگەکەی، سیسـتمی سیاسـیی، کـۆمەڵایەتیی، ئـابووریی، داوەریـی.. هتـد.. گرنگـی ئەم ئازادییەی کۆمەڵگە لەم ڕێسا گشتیە ئیسلامییانەدا دەردەکەوێت:

١-تاکەکانی کۆمەڵگە مافی هەڵبژاردنی دەسـەڵاتداری حـوکمڕانی خۆیانیـان هەیە.. ئەم هەڵبژاردنە تـاکە ڕێگـای دانـانی کاربەدەسـتانی دەوڵەتە کە ئیسـلام بڕیاری لەسەرداوە. (ڕێگای تر نییە، وەکو ویراسیی و تەعینات و... هتد).

٢-دەسـەڵاتداران دەبـێ بە دوو ڕێسـای سـەرەکی حـوکمڕانی شـەرعییەوە پابەندبن:

ا- ڕاوێژکاریی (شورا): کە دەبێت لە هەموو ئەو کاروبارانەدا بێت، کە دەقـی لەسـەر نیـیە.. ئەمە فەرزە ،چـونکە خـوای گەورە دەفەرمـووێ (وَشَـاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ)ال عمران/١٥٩ واتە: لە کاروباردا ڕاوێژیان پێبکە.

ب- دادپەروەریی لە حوکمداندا: ئەمیش فەرزە.

خوای گەورە پێغەمبەرە مەعسومەکانی (علیهم السلام) ئاڕاستەی ئەمە کردووە،بە سەیدنا داود (علیه السلام)دەفەرمووێ: ﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ص: ٢٦.

واتە: ئەی داود! ئێمە جەنابتمان بۆیە کردۆتە بریکار (خەلیفە)ی تایبەت لەسەر زەمیندا، تا بە حەقیانەت حوکمی خەڵکی بکەیت، شوێن هەواوهەوەسی خۆت نەکەویت ،چونکە لە ڕێبازی خوای گەورەت لادەدات و گومڕا دەبیت.

بۆ پێغەمبەری سەروەریشمان (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێداوە، کە

دادپەروەرانە حوکمی خەڵکەکەی بکات، دەفەرمووێ: ﴿وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ۖ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ۖ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ۖ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾ الشورى: ١٥.

واتە: لەسەر دین و دینداریت بەردەوام بەو بە شەرعی خواوە ـوەکو فەرمانت پێدراوەـ پابەندبەو شوێن هەواوهەواسی ئەوان نەکەویت (ئەهلی کیتاب چ جای موشریکان!) بفەرموو: من باوەڕم بەوە هێناوە ،کە خوای گەورە ناردوێتیە خوارەوە، لە پەیامەکانی پێشوو و قورئانەکەی خۆشم، فەرمانیشم پێدراوە، کە دادپەروەرانە حوکمڕانی خەڵکی و داوەریی نێوانتان بکەم...

ئیبنوکەثیر – رحمەاللە- لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ: ((راسپاردەی خوای گەورەیە بۆ هەموو کاربەدەستان کە داوەریی نێوان خەڵکی دادپەروەرانەبکەن، کە لە شەریعەتی خوادایەو بەس، نابێت شەرعی خوای گەورە وەلەکەن و بچنە سەر شتێکیتر ،چونکە بە تەئکید گومڕادەبن، لە ڕێبازی خوای گەورە دەردەچن))[1].

هەروەها پێی دەفەرمووێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾ النساء: ١٠٥ .

واتە: ئێمە ئەو کتێبەمان بۆ ناردوویتەتە خوارەوە تا ـبەو شێوەیەی کە خوای گەورە ئاڕاستەت دەکاتـ حوکمی نێوان خەڵکەکەی پێبکەیت.

٣-تاک وکۆی کۆمەڵگە مافی موراقەبەکردنی دەزگاو دەسەڵاتدارانیان هەیەو، بۆیان هەیە موحاسەبەیان بکەن و ڕێ لە سنووربەزاندنیان بگرن و نەهێڵن مافی خەڵکی پێشێلبکەن..

(١) تفسیر ابن كثير والبغوي چاپخانەی المنار. چاپی یەکەم ١٣٤٧ک ب٧ ل: ١٩٧.

ئەم مافەی چـاودێریی و موحاسـەبەکردنەی تـاکوکۆی کـۆمەڵگە لە مـافە بریکـارییە گشـتییەکەوە هـاتووەو گرێبەسـتی (بەیعەتـدان)ەکە جەختـی لێکـردۆتەوە، بـۆتە گرێبەسـتی نێـوان خەلـیفەو ئـوممەت، کە هەر دوولایـان یەکتریـی ناچـاری چەسـپاندنی شـەرع دەکەن و هەر دوولا دەبێـت بە پێـی ڕێساکانی شەرع ڕەفتاربکەن.

**بڕگەی پێنجەم:**
**سزای شەرع دەربارەی بەزاندنی سنووری بریکاریی:**

که خوای گەورە مرۆڤی کردۆتە بریکاری خۆی لەسەر زەمین و مەخلووقاتەکانی خستۆتە ژێر دەست و دەسەڵاتدارێتی پێداوە، تا لە موڵکی خوای گەورەدا حاکم بێت، ئەوە دوای ئەوەیە کە خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی خۆی دەسەلمێنێت و شەریعەتی خوای گەورە دەچەسپێنێت و فەرمانەکانی جێبەجێدەکات و لە بەرهەڵستیەکانی دووردەکەوێتەوە.

ئاوا دەبێتە بریکاری خوای گەورەو لەجیاتی ئەو دەبێتە حاکم و داوەر، ئەگەر وا نەبوو، هەر کارێک بیکات باتڵە.

وا نەبوونی یەعنی لاسەنگی خستۆتە رەفتارێکی دیدە عەقائیدییەکەوە: واتە یان پێچەوانەی تەسلیم بوونی بە (خوایەتی خوای گەورە) رەفتاریکردووە، یان پێچەوانەی (عەبدێتی مرۆڤ بۆ خوای گەورە)، یان (شەریعەتەکەی ئەوی لاداوە)، بەوەی گۆڕیوێتی و دیدو تێڕوانینی بەشەریی خستۆتە جێی..

ئەمانە بەتەئکید باتڵن و مەرجەکانی بریکاریی خوایی هەڵدەوەشێننەوە .. موشریکەکان داوای گۆڕینیان لە هەندێک لەم رێسا ئوسوڵییانەدا دەکردو خوای گەورەش بە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموو: هەموو دیدو بزاوت و هەڵوێستێکیان رەفزبکە، کە پێچەوانەی ئەم رێسا ئوسوڵیانەی دینەکەت دەبێتەوە. پێی دەفەرموو: ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ الزمر: ٦٤ – ٦٥ .

واتە: پێیان بفەرموو: هەی نەفامینە! فەرمانم پێدەکەن تا غەیری خوای گەورە بپەرستم؟!! بە دڵنیاییەوە لەو وەحیەدا کە بۆ جەنابت و بۆ ئەوانەی پێش جەنابت هاتووە، جەخت لەوە کراوەتەوە کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوای تاکو پاک دابنێیت هەموو کارو کردەوەکانت پووچەڵدەبنەوە.

- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴿٩﴾﴾ محمد: ٩ .

واتە: چونکە _کە ئەوان ئەوەیان بوغزاند کە خوای گەورە ناردویەتی خوارەوەو پشتیان تێکردو دژی وەستانەوە_ خوای گەورەش هەموو کارو کردەوەکانی پووچەڵکردنەوە.

-﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ الأعراف: ١٤٧.

واتە: ئەو کەسانەی کە بەڵگەکانی خوایەتیمانیان بەدرۆخستەوە (کە لە وەحیی و گەردوونـدا بوون) و باوەڕیان بە دیدارمان لە قیامەتدا نەبوو و بەدرۆیان خستەوە، هەموو کاروکردەوە چاکەکانی دنیایان (وەکو یارمەتیدانی هەژاران و سیلەی روحم و ... هتد) پووچەڵ بۆوە.

پووچەڵبوونەوەی کاروکردەوە، واتە: فەوتان و بەفیڕۆچوون و نرخ بۆدانەنان وحساب بۆنەکردنی، وەکو ئەوەی کە هەر نەبووبێت، ئەمە کە لە زاراوەی یاساناساندا پێیدەڵێن: (البطلان والمطلق)، کە بریتیە لە حوکمدان بەسەر رەفتارێکدا کە ئەوەندە چەوت و هەڵەیە هیچ شتێکی لێ ڕاستناکرێتەوە.

ئەم پووچەڵبوونەوەی کارو کردەوەیە هەر کوفرو شیرکی کافران ناگرێتەوە، یان ئیلحادو باوەڕنەهێنان، یان باوەڕهێنان بە هەندێک روکن و بابەت و رەتکردنەوەی هەندێکیتریان، بەڵکو ئەو موسوڵمانانەش دەگرێتەوە کە لە فەرمانی خوای گەورەو فەرمانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم یاخی

دەبن (کە هەر کوفرە) ،چونکە خوای گەورە بە موسوڵمانان دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ٣٣﴾ محمد: ٣٣ .

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتانهێناوە! ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورەو ملکەچی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بن و کاروکردەوەکانتان پووچەڵ مەکەنەوە.

-پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليه أمرُنا هذا فهو رَدٌّ).[١]

واتە: هەر کەسێک داهێنانێکی لەم دینەماندا دروستکرد، رەتدەکرێتەوە و لێی قبووڵناکرێت.

لەم ڕوانگەوەیە، کە هەموو رەفتارێک بەدەر لە بازنەی شەرع بە باتڵ هەژماردەکرێت، جا لە مولحیدێکەوە بووبێت، یان لە کافرو موشریکێکەوە، یان لە موسوڵمانێکەوە بووبێت..

رەفتاری ناشەرعیی کەس بەخۆیەوە پابەندناکات، نە رەفتاری مامەڵەی باتڵ و نە بڕیاری یاسایی باتڵ.. موسوڵمان ناچارنابێت پێوەی پابەندبێت.. لەم روانگە عەقائیدییەوەیە کە هەر یاساو رێساو دەستوورێک، هەر بڕیارو تەعلیماتێکی حکومی، سیاسیی بێت یان ئابووریی، یان ئیداریی، یان داوەریی، یان رۆشنبیریی، یان هەر لایەنێکیتری ژیانی تاکوکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەتی پێ

(١) نووسەری بەڕێز نوسیوێتی: (رواه مسلم، وفي رواية: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد). بڕوانە: شرح الأربعين النووية چاپی الشمرلي لە قاهیرە چاپی حەوتەم ل: ٢٣.

ئاڕاستەبکرێت، باتڵەو موسوڵمان بۆی نییە جێبەجێیبکات، جـا لە دارولئیسـلامدا بێت یان لە دارولکوفردا[1].

(١) المال والحكم في الاسلام ل: ٢٤_٢٥.

## باسی چوارەم

## پەیوەندیی حاکمی موسوڵمان بە خوای گەورەوە

**ڕێڕەو:**

بە درێژایی مێژوو سەدەیەک نەبینراوە ،کە هەندێک دەسەڵاتداری تێدا دەرنەکەوتبێت، لەوانەی کە لافوگەزافی ئەوەیان لێدەدەن کە پەیوەندییان بەخوای خەڵکەکەوە هەیە، ئیتر خەڵکەکە لەسەر هەر دین و مەزهەبێک بووبن.. ئەم لاف لێدانەش مەودای هەبوو!

هەبوو دەیووت: زۆر لە خوا نزیکم و کوڕی ئەوم! هەندێکیش کەمێک دوورتر، دەیووت: خواکەمان دەسەڵاتی حوکمڕانی بە خۆم و بە خانەوادەکەم داوە..

هەندێکیشیان لە هەموو بوارەکاندا هەر دەیوت خۆم خوام! ئەوە زۆر هەڵەیە کە هەندێک کەس وا بزانێت ئەم جۆرە لافوگەزاف لێدانە لەسەر دەمانێکی کۆندابوون، لە زەمانی ئیمپراتۆریەتە گەورەکاندا بوون، یان پێشتر وەکو فیرعەون و نەمردوو، یان حاکمەکانی ئیمپراتوریتی: (فارس و هیندستان و چین) و ئێستا نەماون! نا، ئێستاش هەر وایەو لەم سەدەی بیستەمیشدا هەیە لاف و گەزافی وا لێدەدات[1].

(١) دکتۆر ئەمیر بەقطور دوای ئەوەی پاڵانتەکەی ئەسکەندەری گەورە (٢٢٣/٣٥٦ پێش زایین)ی هێناوەتەوە کە لە سەردەمانی کۆندا لافوگەزافی خوایەتیی بۆ خۆی لێدەدا، ئەوەی باسکردووە کە ناپلیۆن بۆناپارتیش خەریکبوو ڕەویەی ئەسکەندەر بگرێتەبەرو دەیوویست لافوگەزافی خوایەتیی بۆ خۆی لێبدات، بەڵگەشی بەو باسانە لە ئینجیل دەهێنایەوە کە بە ناوی (بنەماکانی ئیمان)ەوە کرابوونە بەرنامەی دەرسی خوێندنی ڕەسمی وڵات و دەبوو هەموو قوتابییەک لەبەریان بکات، ←

گەیشتنە حەقیقەتی ئەم پڕوپاگەندانە لەم باسەی ئێمەدا گرنگە ،چونکە کاتێک دەسەڵاتدارێک خەرمانەیەکی پیرۆزی خوایی بە دەوری سەری خۆیدا دەکێشێت و بە جۆرێک لە جۆرەکان لافوگەزافی (خوایەتی) یان (لە خواوە بۆی براوەتەوە) لێدەدات و گەلەکەشی بە ڕاستی دەزانن، ئەوە مانای وایە کەدەم و دەستی خەڵکەکە بەستراوەو چاویان بەستراوەو گوێیان ئاخنراوەو بۆیان نییە نە موراقەبەی کاربەدەستانی دەوڵەتەکەیان بکەن و نە موحاسەبەشیان بکەن.

ئەمەش یەعنی: نەبوونی هیچ دەزگایەکی چاودێریی گەل بۆیان.. پێچەوانەی ئەمەش بێگومان ڕاستە.

واتە: ئەگەر حاکمی دەوڵەتێک ئەو لافوگەزافەی لێنەدا مانای وایە مافی گەلەکەی داوەو بواری بۆ کردوونەتەوە، کە ئاسان موراقەبەی کاربەدەستانی وڵاتیان بکەن و موحاسەبەشیان بکەن ،چونکە ئەو کاتە کەس لەوە ناترسێت یان خەمی ئەوەی لەبەر نابێت کە خوا بڕەنجێنێت و خۆی بخاتە بەر غەزەبی ،چونکە حاکمی دەوڵەتی بە هەڵە زانیووە!.

ئێمە لەم باسەماندا ساغکردنەوەی ئەوەمان پێ زەروویيە ،چونکە گرنگ و

---

کە لە ژێر ناونیشانی (ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر ئیمپراتۆر)دابوو کە دەیووت: (فەرزی سەرشانمانە کە ڕێز لە ئیپمراتۆر بگرین و ملکەچیی بۆ دەرببڕین، پێویستە دوعای بۆ بکەین چونکە خەلیفەی خوایە لەسەر زەمین، خوای گەورە لەسەر شێوەی خۆی خەلقیکردووەو لەسەر عەرش جێگیریی کردووە). بڕوانە باسەکە کە بە ناوی (جنون العظمة: شێتی مەزنێتیی)یەوە لە گۆڤاری (المجلة الجديدة)دا ژمارە یەنایر/ کانوونی دووەمی ١٩٣٦ ل: ٨١_٩٣ بڵاوکرایەوە. ئێمەش لە د. عبدالحميد متولي وەرمانگرت لە کتێبی (الحريات العامة) ل: ٨٥ و دواتریی..

- د. ثروت بدوي شتێکی تری وا لە گەلیۆمی دووەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانیاوە نەقڵدەکات کە پێش جەنگی جیهانی دووەم دەیوویست بۆی ئەنجامبدەن.

ئەم بیرۆکەیە لە سەرو رەفتارو تەعلیماتی هێتلەرو جەنەراڵ فرانکۆشدا دەردەکەوت. ئەگەرچی لافوگەزاف لێدانەکەیان نەگەیشتە ئەو ئاستە باڵایەی ئێمە لێرەدا باسی لێوە دەکەین. بڕوانە: النظم السياسية ب١ ل:٩٤ و پەڕاوێزەکەی.

کاریگەرە بە دووی ئەو هۆیانەدا بچینەوە کە ئەم دیدو تێڕوانیانەیان لەگەلاندا خەلقکردووە، بۆ ئەوەی دوای ئەوە بسەلمێت: کە ئەوەی لە دیدی فەلسەفی و روانگەی فیکری سیاسیی بەشەردا دروستکراوە هیچ پەیوەندییەکی بە فیکرو سیستمی ئیسلامییەوە نییە..

ئەوە دیدو تێڕوانینی فیکری سیاسیی رۆژئاوایە، کە باوەڕی بە حوکمی پیاوانی دینی (ثیوکراسیی) هەبوو، کە ئەوانەی بە ناوی خواوە حوکمی نارەوای بەشەریەتی خۆیانیان دەکرد، لە دوورو نزیک پەیوەندی بە دیدو روانگەی عەقائیدیی و فیکری سیاسیی ئیسلامەوە نییە.

باس لەمە دەکەین و دواتر دێینەسەر باسی سیستمی خیلافەت لە فیکری ئیسلامییداو وەڵامی ئەو گومانانە دەدەینەوە کە خراونەتە پاڵ دیدو رێی خیلافەت..

پاشان تیۆری مامۆستا (ئەبولئەعلای مەودودی) دەهێنینەوە دەربارەی (حاکمێتی) خوای گەورەو سیستمی حوکمڕانی ئیسلامیی ،چونکە گرنگی خۆی هەیە.. پاشان دێینەسەر ئەوەی کە ئایا جائیزە بە حاکمی موسوڵمان بووترێت: (خلیفةالله) ...

لە دواییشدا دێینەوە سەر باسی بەشەریەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەر وەکو کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە. هەروەها لە سییرەی کردەوەی جەنابیشیدا (صلی الله علیه وسلم)، تا گومانی (الحق الالهی) لە جەنابیشی دوور بزانرێت، چجای لە خەلیفەی موسوڵمانان،هەموو ئەمانەش لە شەش بڕگەدا (إن شاء الله)نیشان دەدەین.

**بڕگەی یەکەم:**
**هۆکانی دروستبوونی تیۆری سیاسیی بەشەریی و دژواریێتیی تێکەڵکردنی لەگەڵ فیکری ئیسلامییدا:**

بێگومـــان زۆریـــنەی تێـــۆرییە سیاســـیەکان دەرچەی دیـــدو تێـــڕوانینە فیکرییەکانن، کە سیستی سیاسییان لەسەر داددەمەزرێت.

دیـدو تێـڕوانینە سیاسـیە باوەکـانی کـۆمەڵگەیەکی دیـاریکراو، بێگومـان کاریگەرییـان لەسـەر جـۆری سیسـتمە سیاسـیەکانی دەوڵەتەکەیـان هەیە، لە پاراستن و پێشبردنییدا..

لەم زەمینەوەیە کە جاری وا هەیە سیستمێکی سیاسی نوێ دێتە ئاراوە، یـان سیستمەکەی کە حوکمی پێدەکرێت گۆڕانکـاریی قبووڵـدەکات و واقیعییـانەتر پێشـــڕەوودەکات، بە گـــۆڕینی هەنـــدێک بنەمـــاو ڕێســـای، یـــان ئەو بـــزاوت و هەڵوێستەی کە بۆتە چۆنیەتی چەسپاندنی بنەما فیکرییەکان..

ئەمە ئەوە ڕووندەکاتەوە: کە پەیوەندییەکی سـەرەکی تونـد هەیە لە نێـوان فیکرە سیاسیەکەی لە کات و شوێنێکدا دەرکەوتووە، لەگەڵ واقیع و بارودۆخی سیاسی نەوەی ئەو کات و شوێنە...

ئیـــدی کە تیـــۆرە سیاســـییەکان دێنەئـــاراوە، وادێـــن کە بـــۆ هێنـــانەدیی پێداویسـتییەکانی ئەو نەوە نـوێیەی کـۆمەڵگەکەی ئەو کـات و شـوێنەبن، جـا هەیانە لایەنگـری دەسـەڵاتە حـوکمڕانە دەکـات، بە چەنـد مەرجێـک، یـان دوای داواکاریی چەند گۆڕانکارییەک دەبێت، تا هەموو کۆمەڵگەکە پێی رازی بـن و ملکەچـی فەرمانەکـانی بـن، یـان لایەنگرنـابن، بەڵکـو رەخنەگـرانە بەرامـبەری دەوەستنەوە، بە ئومێدی گۆڕانکاریی ریشەیی و گشتگیریی تێیدا.

تیۆری سیاسی بە شێوەیەکی گشتی ئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو بـارودۆخە

سیاسیەیە کە کۆمەڵگەکەی پێدا دەڕوات، بۆیە ئاسەواری بارودۆخەکە بە دیدو ڕاو هەڵوێستی خاوەن تیۆرە سیاسیەکانەوە دیارە.. کاریگەریی تیۆرە سیاسیەکانی ناو کۆمەڵگەکە لەوەدایە کە دەبێتە هۆکاری سەرەکی ڕا دروستبوون و رەسەنکردنەوەی بزاوتی هۆشیاریی سیاسیی و بەرچاورۆشنکردنی زیاتر، بۆیە دەبنە پاڵنەری پێشکەوتنی گەلان[1].

*دژواریی تێکەڵاوکردنی تیۆری سیاسیی فیکری بەشەریی بە فیکری ئیسلامیی:

لە سەرەتادا وتمان: کە فیکری ئیسلامیی سیستمێکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆی تایبەتی هەیە کە لە زۆر لایەنەوە لە سیستمە کۆمەڵایەتییەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا ناچێت و جیاوازە لێیان ..

وتیشمان: کە ئەم سیستمە کۆمەڵایەتییەی ئیسلام بە زاراوەی خۆی نەبێت ناناسرێت و ناناسێنرێت، لادان لەم مەرجە، نامۆیی دروستدەکات. پێناسەکەی تێکەڵ وپێکەڵ دەکات و نازانرێت کە هەڵوێستی شەرع دەربارەی هەندێک بزاوت و هەڵوێست چۆنە.

ناکرێت لە روانگەو پێناسەی فیکرێکی بەشەرییەوە بڕوانیتە سیستمی ئیسلامیی ،چونکە ئەو کێشانەت لێ ئاڵۆزدەبێت کە ئەمرۆ دیدو ڕێ فیکرییە سیاسییەکان و سیستمە کۆمەڵایەتییەکان پێیانەوە خەریکن.

جەختمان لەمە کردەوە ،چونکە زانیمان هەڵەی بەکارهێنانی زاراوەو پێناسەی غەریبە چەندی کاریگەریی خراپ لە چەمکە ئیسلامییەکاندا لەبەرچاوی خەڵکی دروستکردووە، بۆیە بێزارنین لە دووپاتکردنەوەو جەختکردنەوەکەمان.

ئێستاش و کاتیتریش،چونکە هەڵەو چەوت و دژوارە لە روانگەی پێناسەی

(١) د. ثروت بدوي: أصول الفكر السياسي والنظريات والمذاهب السياسية الكبرى ل:١٣.

مەدرەسەی فیکریی و فەلسەفی بەشەرییەوە بڕوانینە سیستمی کۆمەڵایەتی ئیسلامیی، چجای ئەوەی هەوڵبدرێت دیدو تێڕوانین و سیستمی ئیسلامیی بخرێتە قاڵبی غەیرەوەو بە زاراوەی نامۆ پێناسەیبکرێت.. ئەمە هەڵەیە.. ناشێت وابزانین ئەگەر سیستمی ئیسلامییمان لە قاڵبی فیکری سیاسیی ئەم و ئەودا دابڕێژین و بە زاراوەی ئەوان بناسێنین باشترە، بە بەهانەی ئەوە زووتر تێماندەگەن و باشتر بۆیان دەسەلمێت، کە ئیسلام پێشکەوتوو و راقیەو هیچی لە تێورە سیاسیەکانی سەردەم کەمترنییە!

لاریشی لەوە نییە کە دیدو رێی فەلسەفیی و ئایدیۆلۆجیەکانی سەردەم لەخۆبگرێت و مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، ئەوانەی وا دەکەن نازانن ئیسلام ناشیریندەکەن ،چونکە ناچاردەبن هەندێک بنەمای ئوسوڵ و رێسای سەرەکی بەلاواز نیشان بدەن لە بەرامبەردا رای ناقۆڵاو لاوەکی دەخەنە جێی رێسا نەگۆڕەکانی ئیسلام.

بەمەش ئیسلام لە پێناسەی خۆی دەردەهێنن و پێناسەیەکیتری دەدەنێ، ناچاردەبن بە زۆر ملی هەندێک دەق بۆ لای مەبەستەکانی خۆیان لاربکەنەوە، تا دەکەونە ئینحیراف و گۆڕینی جەوهەری ئیسلامەکە!

دیدو بۆچوونێکی کاڵ وکرچ و لێڵ و تێکەڵ وپێکەڵ سازدەکەن و ناوی دەنێن جەوهەری ئیسلام! دەعبایەکیان هێناوەو سیماو سیفاتی فیکری فەلسەفیی رۆژهەڵات و رۆژئاوایان پێداوەو ناویاننناوە ئیسلامیی سەردەم! ئیسلامیی رەسەن! (ئیسلامیی دیموکراسی)!!.

ئەگەر ئەم کەسانە سەرڕاستانەو ورەبەرزانە بگەڕانایاتەوە سەر سەرچاوەکانی دینەکە خۆی و لە قورئان و سوننەتەوە دیدو تێڕوانین و رێسای سیستمە ئیسلامییە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکەیان وەربگرتایە، بە مرادی خۆشیان دەگەیشتن و ئیسلامەکەشیان نەدەشێواند.

لەبەر ئەوەی وەکو وتمان: لە زۆرینەی جاردا تیۆرییە سیاسیەکان بەرهەمی ئەو فەلسەفە سیاسییانەن کە سیستمی سیاسی لە پاڵیاندا دەڕوێت و لە سایەیاندا گەشەو نەشونمادەکات، یان بەرهەمی واقیعی سیستمە سیەکان خۆیانن کەناچاری پێشردو گۆڕانکاریی دیدو بزاوت و هەڵوێستیان بوون ..

لەم روانگەو رێسایەوەیە کە ئەگەر هەوڵبدەین سیستمی سیاسی ئیسلامییش لەبەر رۆشنایی ئەو تیۆرو دیدە فەلسەفیانەدا لێکبدەینەوە تا بتوانین (!) بە سیستمە سیاسیەکانی سەردەمیان بچوێنین، هەڵەیەکی زۆر دژوار دەکەین، هەڵە کە بەخۆیەوە ناوەستێت و ڕامانده‌کێشێت بۆ کۆمەڵێک هەڵەی دژواری تر یەک لەدوای یەک، جگە لەوەی لەباسەکانماندا بەربەستی زۆرمان دێتەرێ.

هەموو سیستمێکی سیاسیی تیۆرێکی سیاسیی خۆی هەیە کە لە دیدو روانگەی فەلسەفی خۆیەوە، لە مێژووی پێشبردیی خۆیەوە، هاتووە... دەبێ بۆ سیستمی ئیسلامیی ئەوەمان لا نەگۆڕێت کە ئیسلام بە تەواویی سەربەخۆیەو لەو سیستم و تیۆرو دیدە فەلسەفیی و فیکرییانە جودایە.

ئەگەرچی دەشێت لەملایەنەوە یان لەولایەنەوە لەگەڵ سیستمێکیتردا لێکبچن، بەڵام بە تەئکید ئیسلامییەکە لە هەموو بنەماو رێساو پێناسەو زاراوەیەکییدا سەربەخۆو جودایەو هەموو رەهەندو لایەنێکی ئیسلام هەر دەگەڕێتەوە سەر حەقیقەتە عەقائیدییەکانی و هەموو دیدو تێڕوانینێکی جیهانبینیەکەی وەکو ژیانبینیەکەی هەر لە بنەما عەقائیدییەکانیەوە هاتووە.

بۆیە ناشێت هیچ رێساو سیستمێکی ئیسلام بە غەیری خودی ئیسلام لێکبدەینەوە.. ئەم باسەمان لێرەدا تەرکیزکردن و جەختکردنەوەیە لەم مەرج و رێسا نەگۆڕە[1].

---

[1] جێی داخە کە بەحس و لێکۆڵینەوەی تایبەتمەند دەبینین کە لەسەر (تیۆری ئیسلامیی دەربارەی ←

**بڕگەی دووەم:**
**تیۆرییە دینییەکان (تیوکراسی theocracy) لە فیکریی بەشەرییدا[1]:**

ئەم تیۆرانە، کە لێرەدا باسدەکەین بۆ ئەوەمان نییە تا بەراوردیانبکەین لەگەڵ تیۆرەکانی فیکری ئیسلامیی، نا ،چونکە بەراوردکردن عادەتەن، لە نێوان دووشتدا دەبێت، کە لە زۆرینەی سیفەتەکانیاندا لێک بچن.

لێرەدا مەبەستمان: ناساندنی ئەم تیۆریانەو ڕەواندنەوەی ئەو گومانانەیە، کە دەخرێتە سەر سیستەمی سیاسیی ئیسلامیی ،کە گوایە: هەر سیستەمە تیوکراسیەکەی ڕۆژئاوایە، کە بە ناوی مافی خوا (نظرية الحق الالهي)یەوە

دەوڵەتداریی) نوسراون، کەچی لە دوورو نزیک ئاماژەیەکی تێدا نییە بۆ پەیوەستی تیۆرەکە بە لایەنی عەقائیدیی و فیکریی ئیسلامەکەوە، کە دەوڵەتداریی بەشێکە لە دیدو تێڕوانین و پێناسە عەقائیدییەکەی بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ. ئەم لایەنە، تەوەرە سەرەکیی و گرنگەکەی ئەو جۆرە باسانەیە. تەوەری سەرەکی هەموو باس و لێکۆڵینەوەیەک بنەما فیکرییەکانێتی، کە بینای باسەکەی لەسەر دامەزراوە. ئەو بنەماو بناغە فیکرییانەشن کە باسێک لە باسێکیتر جودادەکاتەوە. نموونەیەک لەو لێکۆڵینەوە هەڵانە باسەکەمی د. حازم عبدالمتعال الصعيدي يە کە بە ناوی: (النظرية الاسلامية في الدولة، دراسة مقارنة) دکتۆرانەمەیەکەو دراوە بە کۆلیجی یاسا لە قاهیرە. چاپی یەکەم ١٣٩٧ک. ١٩٧٧ز دارالنهضة المصرية. بڕوانە بەشی: (أصل نشأة الدولة الاسلامية وأساس السلطة السياسية فيها) ل: ١٤٩ و دواتریی.

[1] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم تیۆرانە بڕوانە:

_ د. ثروت بدوي: النظم السياسية ب١ ل: ٩٢ و دواتریی.

_ د. طعيمة الجرف: نظرية الدولة الأسس العامة للنظم السياسية/ الكتاب الأول ل: ٣٥ و دواتریی.

_ د. يحيى الجمل: الأنظمة السياسية المعاصرة ل: ٥٦ و دواتریی.

_ د< عصمت سيف الدولة: النظام النيابي ومشكلة الديمقراطية ل: ٣٨ و دواتریی.

حوكمی دەكرد.. بێگومان نـاتوانین گومانێـك بـڕەوێنینەوە كە نەناسرابێـت،بۆیە دەبێت ئەم تیۆرە بناسێنین.

سیســتمی تیوكراســیی: ئەو تیۆرەیـانەیە كە مـافی خـوایی بەســەرچاوەی دەسەڵاتی مرۆڤ دەزانـن، واتە: خـوای گەورە خـۆی كەسـانێک بـۆ حـوكمڕانی مرۆڤ هەڵدەبژێرێت و تەعینیاندەكات. لەم روانگەوە هەر حاكمێـك دەسـەڵاتی حوكمڕانی شوێنێكی كەوتەبەردەست ئەوە دەسەلمێت: كە سروشتی پێكهاتەی لە سروشتی گشتی مرۆڤیتر باڵاترەو جودایە.

لەبەرئەوە ویســت و ئیرادەشــی لە ویســت و ئیــرادەی خەڵكــی بــاڵاترەو بڕیارەكانی پیرۆزو رەوان ،چونكە ئەو ویستی خوایی دەهێنێتەدیی... لە پێناسەی ئەم دیــدە فەلســەفیەوە دەوڵەت خــوا خەلقیــدەكات و دەســەڵاتی سیاسیشــی دەسەلاتی خوای گەورەیە. بەم پێیە دەوڵەت دەزگایەكی سیاسیی مرۆیـی نیـیە، بەڵكو سیستمێكی ئەودیووسروشت و باڵاتر لە سروشتیە.

ئەم تیۆرە لە كۆنترین تیۆرییەكانی فیكری سیاسین، كە دەكـرێنە هۆكـاری پەیدابوونی دەوڵەت و هەنجەتی هەبوون و بەردەوامیـی و پاراسـتنی دەسـەڵاتە سیاسییەكەی.. ئەم تیۆرە لە سەرەتایدا بە رەهایی و بێ بەربەست دەچەسـپێندرا، بەڵام قۆناغ بە قۆناغی پێشڕەوتی فیكری سیاسـیی و ئیعتیمادكـردنە سـەر هـزرو ژیریی و واقیعی خەڵكی جار بۆ جار شتێكی لێ دەگۆڕا.

هەر وەكو كە لە سەرەتاشـەوە مەحكەمبـوونی پـلە بەپـلەو قۆنـاغ بە قۆنـاغ دەهات و دەچەسپا... دەشێت قۆناغەكانی گۆڕانكارییەكەی بەم خاڵانە دابڕێژین:

**خاڵی یەكەم: دەسەڵاتدار لە سروشتی زاتی خواییە:**

حــوكمڕانی شارســتانێتیە كۆنەكــانی: (میسـری فیرعەونــی و فــارس و هیندستان و چین) حاكمی وڵاتیـان بە خـوا، یـان بە كـوڕی خـوا دادەنـا، لەمەوە

دەسەڵاتدارێتییەکەیان بە مەعسووم (بێ گوناح و بێ هەڵە) و پیرۆز دادەنرا، بڕیارەکانیان ڕێی موناقەشەی نەبوو، مرۆڤ بۆی نەبوو بە هیچ شێوەیەک ڕەخنەیان لێ بگرێت.

بۆیە دەسەڵاتی ئەمانە دەسەڵاتی (پاشاخوا)یی بوو، سنووری دەسەڵاتیان دیاری نەدەکرا، هەر فەرمانێکیان لە هەر شتێکدا دەربکردایە، بە فەرمانی بێ هەڵە تەماشادەکرا[1] و دەبوو بێچەندوچوون رابپەڕێنرایا.. دژوارییەکەش لەوەدا بوو کە دەسەڵاتی پاشاخوایی ئەمان ویراسی بوو لەباوەکەوە بۆ کوڕو نەوە دەمایەوەو لە بازنەی ئەوان دەرنەدەچوو.

### خاڵی دووەم: تیۆری مافی خوایی پیرۆز (ڕاستەوخۆ):

ئەم تیۆرە لە ئەورپا سەرەنجامی ململانێی نێوان مەسیحێتی _لە سەرەتای تەشەنەکردنیدا_ بەرامبەر ئیمپراتۆرەکانی رۆمان دروستبوو، واتە: لە نێوان دەسەڵاتی دینیی و دەسەڵاتی دنیاییدا.

دواتر جۆرێک لە ڕێکەوتنیان لە نێواندا دروستبوو، لەسەر رێسای: (دع لقیصر ما لقیصر وما لله لله).

واتە: ئەوەی هی قەیسەرە بۆ قەیسەری لێگەڕێ و ئەوی هی خوایە بۆ خوای لێگەڕێ..

مەبەست ئەوەیە: کە لێگەڕێ دەسەڵاتی دنیایی بۆ قەیسەر بێت و دەسەڵاتی

---

[1] تا ئێستاش دەسەڵاتی پاپای فاتیکان _کە حیبری هەرەگەورەی کاثۆلیکییەکانە_ هەر وا سەیر دەکرێت و فەرمانەکانی بە فەرمانی خوای گەورە دەناسێنرێت، بۆیە کە بڕیارێکیشی دا گەڕانەوەی نییە.

لەم ڕوانگەوەیە کە تا ئێستا هیچ پاپایەک بۆی نییە جەنگی خاچپەرستانی کۆنی خۆیان بەهەڵە دابنێت،چونکە پاپای ئەو زەمانە بڕیاری لەسەرداوە!

دینیی بۆ پاپاو کڵێسا بێت، تا کەس تەدەخول لە کاروباری ئەویتریاندا نەکات...

بە پێی ئەم رێکەوتنە، دەبوو کڵێسا یارمەتی ئیمپراتۆر بدات، تا دەسەڵات و حوکمی بچەسپێت و بڕیارەکانی راپەڕێنرێن، لە بەرامبەردا پاپاو کڵێسا ئازادیی دینی خۆیان دابین دەبێت.

لە ڕوانگەی ئەم ڕێکەوتنەوەوە، پاپاکانی ئەو سەردەمانەی رێکەوتنەکە بەکاربوون دەیانووت: خوای گەورە فەوزاو گەڕەلاوژێی خەڵکی ناوێت، بۆیە بەویستی خۆی مافی حوکمڕانی خۆی داوەتە کەسانێک کە دەسەڵاتی گەل بگرنەدەست، بەڵام ئەمە ئەمانەتی خوای گەورەیەو پێیان سپێرراوە، بۆیە فەرزە لەسەر رەعییەتەکانیان ملکەچیان بن و فەرمانەکانیان راپەڕێنن ،چونکە فەرمانەکانیان لە هەقی خواییەوە دێن، پیرۆزو فەرزن.

ئەم تیۆرییە ئەو دیدو تێڕوانینەی پێشووی لادا، کە دەیووت: حاکم خوایە، یان کوڕی خوایە، لێرەدا هەر بە مرۆڤی ئاسایی دانران، بەڵام دەسەڵاتی خواییان خراوەتە بەردەست، بەڵام ئەرکی سەرشانی بەرامبەرەکانی _کە رەعیەتەکەن_ هیچ نەگۆڕا.. هەر دەبوو بڕیارەکانیان بێ موناقەشەکردن راپەڕێنن و رەخنە لە هیچ دیدو هەڵوێستێکیان نەگرن.

دەبوو ملکەچ و گوێڕایەڵیان بن، هەقی بەدواداچوون و موراقەبەکردن و موحاسەبەکردنیان نەبوو ،چونکە ئەوە _خوای گەورە کە دایناون_ لێشیان دەپرسێتەوەو لە قیامەتدا موحاسەبەیان دەکات.

بە پێی ئەم رێکەوتنە دژوارە، رەعییەتەکان دەبوو بە تەواویی ملکەچی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکان بن، کە دیدو رەفتارو بڕیاریان بێسنووربوو، پیرۆزبوو ،چونکە لە دەسەڵاتی خوای گەورە وەرگیرابوو.

دیسان لەوەشدا خەتەربوو کە شەرعێیتەکی تەواوی دا بە دەسەڵاتی دیکتاتۆریی و تاکڕەویی ئیمپراتۆر، کە پاپاکان بە پیرۆزو مەعسوم بە خەڵکیان

دەناساند، ئەمە هەروا بەردەوام بوو، تا سەدەی شازدەیەم، چارەنووسی هەموو گەلانی ئەوروپاو پاشاو ئەمیرو کاربەدەستانیان لە دەست پاپاکاندا بوون.

**خاڵی سێیەم: تیۆری مافی خوایی لاوەکی (ناڕاستەوخۆ):**

ئەم تیۆرییە کاتێک سەری هەڵدا کە دەسەڵاتی کڵێسا لەسەر حسابی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکانی رۆمان زیادی کردو ئەوان لاوازبوون. بۆیە هەل رەخساوبوو بۆ کڵێسا، تا دەسەڵاتی بەرفراوانتر بکات و هەوڵبدات دەسەڵاتی دین و دنیا بگرێتەدەست.

بۆیە ئەوەی خستە بەرچاوان کە بەڵێ، ڕاستە کە دەسەڵاتی دنیایی لە خوای گەورەوەیە، بەڵام هەر دەبێت ئەو کەسەی کە دەسەڵاتە دنیاییەکە دەگرێتە دەست گەل لێی رازیبێت و حەتمەن ئەوەش دەبێت لە ژێر سەرپەرشتیارێتی پاپاو کڵێسا دابێت و بە رەزامەندیی دەسەڵاتی دینی ئەوان ببنە ئیمپراتۆری خاوەن دەسەڵاتی دنیا.

ئەمەشتێکی تری هێنایەکایەوە: کە جویکردنەوەی دەسەڵاتە لە خودی حوکمڕانەکەی... دەیووت : خوای گەورە دەسەڵاتەکەی بەخشیووە، بەڵام کەسەکەی بۆ دیاریی نەکردووە، کەسەکە دەبێت رەعییەتەکە هەڵیبژێرن..

واتە: دەسەڵاتدار هەر مافی خوایی بەدەستە، بەلام ناڕاستەوخۆ (لاوەکی) و لەژێر سەرپەرشتی خوای گەورەدا دەبێت، بۆیە بەم تیۆرە دەووترا: تیۆری سەرپەرشتیاری خوایی (نظرية العناية الالهية).

ئەم جۆرە تا سەرەتای سەردەمی راپەڕین لەئەوروپا بەردەوامبوو.. گومانی تێدا نییە کە ئەمە کاریگەریی دیدو تێڕوانینی زانایانی ئیسلامە لە فیکری سیاسی دینیی ئەوروپا ،چونکە لەم سەردەمەدا جیهانی ئیسلام لە شارستانێتی پرشنگدارییدابوو، پەیوەندیشی بە ئەوروپاوە زۆر بوو.

ئەم تیۆرییە رێخۆشکەرێک بوو بۆ دەرکەوتنی تیۆرییەکانی گرێبەستی ئیداریی نێوان حوکمران و رەعیەتەکەی.

دیارە کە ئەم تیۆرییە لە هەردوو شێوەکەیدا حوکمێکی رەهاو بێسنوور دادەمەزرێنێت، شێوەکەی دووەم هەر چەندە دەسەڵاتی بێسنوور دەداتەوە بەحوکمڕان بەڵام لەو لایەنەیەوە لەگەڵ دیموکراسییدا یەکدەگرێتەوەو کە خودی حوکمڕان دەبێت خەڵکی هەڵیبژێرن.. ئەم تیۆرییە کاتێک دەسەڵاتەکەی پێ (شەرعیی) دەبێت، کە ویستی خوایی راپەڕێنێت و خودی حاکمەکەی بەویستی خەڵکی هاتبێتەسەرکار..

واتە: هەبوونی دوو مەرج: (ویستی خوایی) و (دیدو رای کۆمەڵایەتی).

ئەمە _کە پیاوانی کڵێسا دایانڕشت و رەواجیان پێدا، تا چووەسەر_ بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی بێسنووری ئیمپراتۆرەکان بوو، کە دەیانوت نابێت هیچ سنوورو بەربەستێک بۆ ئیمپراتۆر دابنرێت.

بەڵام وەکو تێبینی دەکەیت هیچی لەوە نەگۆڕیوە کە دەسەڵاتدار _دەسەڵاتی پاپابێت یان دەسەڵاتی ئیمپراتۆر_ هەر لە خواوەیەو دەسەڵاتەکەی بێسنووردەبێت.

ئەمەش بەوە شەرعێتیی وەردەگرێت کە خەڵکی حاکمەکە هەڵدەبژێرنو بەڵام مافی موراقەبەو موحاسەبەیان نییە ،چونکە هێشتا هەر لەسەر ئەو رێسایە یە کە خوای گەورە ناڕاستەوخۆ دەسەڵاتی پێبەخشیووەو هەر خۆشی چاودێریی و لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات، ئەمەش ئەوەی سەلماند : کە هەڵبژاردنی ئازادانەو دیموکراسیانەی حوکمڕان، دەشێت تاکرەوێکی دیکتاتۆری پێبێتەپێشەوە.

**تیۆرییە دینییەکان.. و اقیع و بارودۆخیان:**

ئێمە وا دەبینین کە تیۆرە دینیەکانی دەسەڵاتدارێتیی سیاسیی _لە شێوە سەرەتاییەکانییدا_ کە وایدادەنا کە حوکمڕان خوایە، یان کوڕی خوایە، لەگەڵ

هۆشـــیارییە ســـەرەتاییەکەی مرۆڤایەتییـــدا گونجـــاوبوو، کە ســـەروەرێتی (باڵادەستیی) بۆ دینەکان بوو.

دەسەڵاتدارە دینییەکان (پیاوانی دینەکان) جەختیان لەوە دەکـردەوە ،کە هەر دەبێت دەسەڵاتی سیاسیی پشتی بەسەرچاوەی خوایی ببەستایە، تا شەرعێتی بـۆ درووست ببێت[(١)].

ئەمەش سروشـتیە ،چـونکە لە هەمـوو مێـژووی مرۆڤایەتییـدا ئەوە تێبینـی کـراوە، کە پەیوەنـدیی (شـەرعاندن) لە نێـوان دەسـەڵاتی سیاسـیی و بـاوەڕە دینیەکاندا هەبووە، وەکو لازم و مەلزومی یەکتربوون.

بەڵام لە شێوەکانی دووەم و سێیەمی تیۆرییەکەدا رێسایتر دەردەکەوێت، کە لە ئەنجامی ململانێـی دوورودرێژیـی مەڵبەنـدەکانی هێـزدا دروسـتبوو: (پاپـاو کلێسا، ئێمپراتۆرو پاشاکان، سیستمی پاشایەتی و سیستمی دەرەبەگایەتی...) بە تایبەتی ناکۆکیە سەختەکانی نێوان دەسەڵاتی دینیی پاپـاو کلێسـا لە لایەک و، دەسەڵاتی دنیایی ئیمپراتۆرو حوکمڕانان لە لایەکیترەوە، کە هەر بەرەیەکیـان لە هەوڵـدا بـوو دەسـەڵات و نفـوزی خـۆی لەسـەر حسـابی بەرەی بەرامبەریـی بەرفراوانتر بکـات. ئەم ملمڵانـی سـەختە هەر لە ئەوروپـا روویـدا، هەر گەلانـی ئەوروپـا لە نێـوان ئەو دوو دەسـتاڕە بێئامـانەدا هـاڕران، هەر دوولاشـیان خەڵکەکەیان هەر دەچەوساندەوە...

ئەمە هۆکـاری هەرەسـەرەکی دەرکەوتنـی (عەلەمـانییەت)ەکەبـوو، کە بە ئێجگاریی دینی لە دەسەڵات و جیهانی سیاسەت دوورخستەوەو نینۆکی کرد...

لەمـلاوەش سیسـتمە سیاسـیەکەی سـەرتاپا گـۆڕی و نە ئیمپراتـۆر مـاو

(١) أصول الفكر السياسي ل: ١٣.

نەدەسەڵاتی پاشاکان .. بەڵام گەلانی ئەوروپا کە لە تـاو چەوسـانەوەی کڵێسـا خۆیان هەڵدایە بەرەی عەلەمانییەتەکەوە، پـاش مـاوەیەک هەسـتیانکرد کە رای سیاسیان بردەوە، بەڵام هەموو سەرمایە ئەخلاقییەکان و قیەمەکانی کۆمەڵگەیان دۆڕانـد.. کۆمەڵگەکانیـان بە جارێـک داخـزینە نـاو گەڕەلاوژێـی رەوشـتیی و فەوزای جنسییەوە[١].

بێگومان لە هەمو مێژووی توولانی ئیسلامدا شتی وا لە نـاو موسـوڵمانـاندا ڕوویـنەدا ،چـونکە هەر لە سـەرەتاوە دەسـەڵاتی سیاسـیی و دەسـەڵاتی دینیـی جودانەبوون ..

---

(١) د. محمـد عصفور نموونەیەک لەسەر ئەوە دەهێنێتەوە، دەڵێ: (کڵێسا _کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتی بەسەر کۆمەڵگەی ئەوروپادا کێشابوو_ بە رمـانی دەوڵەتە رۆمـانیەکەی رۆژئـاوا دەسـتیپێکردو بە دەرکەوتنـی سیسـتمی دەرەبەگایەتیی کۆتاییپێهات. لەم ماوەیەدا کڵێسـا هـزرو ژیریـی لە خەڵکـی سـاندبوو، وویسـتی خەڵـکەکەی مرانـدبوو، ئیعتیرافـی بە هـیچ مـافێکی تاکوکۆی خەڵکەی لە رووی فیکرو شێوازی ئیدارەی سیاسـییەوە نەدەکـرد، خەڵکی غەیـری "سیسـتمی حـوکمی خوایی"یـان نەدەبینـی کە بەسـەریانەوە حاکمبوو، کە بە پێی نەخشەی سەدان ساڵەی پێشوو وەکـو میـرات مـابۆوەو پیرۆز نەخشێنرابوو، کەس بۆی نەبوو رەخنەیەکیشی لێبگرێت. کڵێسا هەموو سـەرپێچی و یـاخیبوونێکی لە فەرمانەکـانیی خـۆی بە سـەرپێچیی خـوای گەورەو تـاوانی گەورە دادەنـا، کە سـزای قورسـی لەبەرامـبەردا بەسـەردا دەچەسپاند.

_هەروەها بـڕوانە: الحريـة في الفكـرين الـديمقراطي والاشـتراكي چاپی یەکەم ساڵی ١٩٦١ ل:٦.

ئەسڵەن دینەکە دەزگاو دەسەڵاتی ماددیی بەرجەستەی نەبوو تا ببێتە کێبڕکێی دەسەڵاتی سیاسیی (دینەکە رۆحی دەوڵەت و کۆمەڵگەکە بوو، دینەکە لە مەڵبەندەکانی کۆمەڵگە مەدەنییەکەدابوو...).

ئەمە واقیعی مێژووی ئیسلام و موسوڵمانان بوو.. ئەگەرچی هەندێک لەم سەردەمەدا پەیدابوون کە شیکارێکی ئەوروپیانە _لە روانگەی عەلەمانییەتەوە_ بۆ مێژووی موسوڵمانان دەکەن و دەڵێن: ئەوانەی لە ناو موسوڵمانانیشدا حاکم بوون، هەر بە پێی دیدی (تیوکراسی) حکومەتی دینییان پێکدەهێناو وا حوکمیاندەکرد کە گوایە: دەسەڵاتیان لە خوایەتیی خوای گەورەوە وەرگرتووە، جا بە هەر شێوەیەکی بووبێت..

(ان شاء الله) لە بڕگەکانی داهاتوودا باس لەمەش دەکەین و ئەم گومانەش دەڕەوێنینەوە.

**بڕگەی سێیەم:**
**گومانی (مافی خوایی) حوکمڕان لە فیکری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی:**

دوای بەدوادا چوونی نوسراوی ڕەخنەگران لەفیکری سیاسی ئیسلامیی دیهان گومانەکانیان چوارن، کە (ان شاء الله )لێرەدا ئەوانیش دەهێنینەوە و ڕەتکردنەوەی خۆشهان بۆ ڕەواندنەوەیان:

**یەکەم: گومانەکان:**

بەشێوەیەکی گشتی ئەو گومانانەی لە ڕووی فیکریی سیاسیی و دەسەڵاتدارێتیی ئیسلامییدا ووروژێنراون، چوارن، چ ئەوانەی لەسەردەمانی پێشوودا دەربڕراون، چ ئەمانەی لەسەردەمی نوێدا ئیسارەکراون.

ئەمانە بە زۆر شێوازی ڕاستەوخۆو لاوەکی، یان راشکاوو پێچاوپێچ دەببڕراون.، پێهان باشبوو یەک لەدوای یەک بیانهێنینەوە، پاشان وەڵامێکی گشتی هەموویان و وەڵامی هەریەکەیان بەجیا بدینەوە (ان شاء الله).

**گومانی یەکەم: حاکم دەسەڵاتی لە خواوە وەرگرتووە بە پێی تیۆری مافی خوایەتی (نظرية الحق الإلهي) .**

خاوەن ئەم گومانە ئەوەیان کردووە بە بەڵگە کە سەیدنا عوسهان کوڕی عەففان - خوالێی ڕازی بێت -کاتێک لە رۆژانی کۆتایی تەمەنییدا بەرهەڵستکارانی حوکم و دەسەڵاتیی، گەمارۆیاندابوو، دەیانووت :دەبێت لە خیلافەت بێتەخوارەوە، ئەویش فەرمووی: (كَيفَ اخْلَعُ قَميصَاً قَمَّصَنِيَهُ الله).

واتە: چۆن ئەو کراسە لەبەر خۆم دامالّم کە خوای گەورە کردوێتیە بەرم؟! ئەمەی لەو رۆژەدا فەرموو، کە دواتر ناونرا: رۆژی فیتنە گەورەکە (الفتنة الكبرى) کە بە دوایدا شەهیدبوو..

بەرهەڵستکاران (کە لە عێراق و میسرو شوێنیترەوە هاتبوون و یاوەریان تێدانەبوو) هەڕەشەیان لێکرد ،کە یان دێیتەخوارەوە لە خیلافەت، یان دەتکوژین[1]..

ئەو یاوەرانەی لەو کاتەدا لە مەدینە لە خزمەتییدابوون، لایەنگریی سەیدنا عوسمان بوون.. ئیبنوعومەر -خوالێیان رازی بێت- چووە خزمەت سەیدنا عوسمان _کە لە ماڵی خۆیدا گەمارۆ درابوو_ سەیدنا عوسمان پێی فەرموو: بزانە رات چییە لەسەر ئەوەی ئەوانە دەیڵێن، کە یان لە خیلافەت دێیتەخوارێ یان دەتکوژین؟

ئیبنوعومەر عەرزیکرد: جەنابت لە دنیادا بە نەمریی دەژێت؟

فەرمووی: نەخێر.

---

[1] بۆ باسی زیاتری ئەم گومانە بڕوانە: د. عبدالكريم عثمان: معالم الثقافة الاسلامية ل: ٢٩١و دواتریی. ئەو فەرمـوودەیەی کە سەیدنا عوسمان خوا لێی رازی بێت پشتی پێبەستبوو ئەوەیە کە خاتووعائیشە خوا لێی رازی بێت گێڕاوێتییەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە سەیدنا عوسمانی فەرموو: (يَا عُثْمَانُ إِنْ وَلَّاكَ اللَّهُ هَذَا الْأَمْرَ يَوْمًا فَأَرَادَكَ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تَخْلَعَ قَمِيصَكَ الَّذِي قَمَّصَكَ اللَّهُ فَلَا تَخْلَعْهُ يَقُولُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ) واتە: ئەی عوسمان! ئەگەر خوای گەورە ئەم کارەی خستە ئەستۆت و دووڕووەکان ویستیان ئەو کراسەی خوای گەورە بەبەرییدا کردوویت، داکەنیت، داینەنێیت.. سێجار ئەمەی پێ فەرموو.. بڕوانە: سنن ابن ماجه توێژینەوەی محمد فؤاد عبدالباقي چاپی مصر ساڵی ١٣٧٣ک پێشەکییەکەی ژمارە ١١٢ باب ١١ ب١ ل: ٤١، هەروەها: مسند الإمام أحمد چاپی یەکەم ١٣١٣ک مصر- ب٦ ل: ٧٥ و٧٦و ١١٤و ١٤٩. ئەمەی سەرەوە نووسەری بەڕیز نوسیوێتی راستە لای ئیبنوماجەیە (ژمارە ١١٢). شێخی ئەلبانی لە (صحيح سنن ابن ماجه/ ١١٢)دا دەفەرموێ: سەحیحە. بە شێوازی تریش ریوایەتکراوە وەکو: ( يَا عُثْمَانُ إِنَّهُ لَعَلَّ اللَّهَ يُقَمِّصُكَ قَمِيصًا فَإِنْ أَرَادُوكَ عَلَى خَلْعِهِ فَلَا تَخْلَعْهُ لَهُمْ) ترمذی (٣٧٠٥)، ئیبنوئەبوشەیبە (٥٦١٦)، حاکم (٤٦٠٠) دەشفەرموێ: (عالي الإسناد ولم يخرجاه)، طەبەرانی لە: الأوسط(٢٨٥٤).
_ بۆ تەفسیلی باسەکەش بڕوانە کتێبی: القاضي أبوبكر بن العربي: العواصم من القواصم المطبعة السلفية قاهيره. توێژینەوەی محب الدين الخطيب چاپی سێیەم ل: ١٠٩و دواتریی.

ئیبنوعومەر پرسی: لە کوشتنت زیاتریان دەوێت؟

فەرمووی: نەخێر.

لێی پرسیەوە: ئایا چوونەبەهەشت  و دۆزەخ لەدەست ئەواندایە؟

فەرمووی: نەخێر...

ئینجا ئیبنوعومەر پێی فەرموو: (فلا تَخْلَعْ قَمیصَ اللهِ عَنْکَ، فَتکونَ سُنَّةً کُلَّما کَرِهَ قَومٌ خَلیفَتَهمْ خَلَعُوهُ اوقَتَلَوهُ).

واتە: دەی سا ئەو کراسە دامەکەنە کە خوای گەورە بەبەریداکردوویت، دەنا دەبێتە ڕێساو ڕێباز هەر کۆمەڵە خەڵکێک خەلیفەکەی خۆیان بەدڵنەبوو گەلەکۆمەکێی لێدەکەن، دەیهێننەخوارەوە یان دەیکوژن.

**گومانی دووەم: خەلیفایەتی _کە ئیمامەتی گەورەیە_ وەکو پێغەمبەرێتییەو لە خواوە دیاردەکرێت:**

ئەمە دیدو بۆچوونی شیعەیە کە هەموویان لە کتێبەکانیاندا هێناویانەتەوەو شەرحیان کردووە. دەڵێن: دەسەڵاتدارێتی باڵا (خەلیفە یان پێشەوایەتی مەزن: الامامە العظمی) مەسەلەیەکی بەرژەوەندیی نییە، تا بخرێتە بەردەست خەڵکی و بووترێت یەکێک هەڵبژێرن، کە هەڵیانبژارد شەرعێتی حوکم بگرێتەدەست.

ئیمامەت ڕێسایەکی ئوسولی دینە، روکنێکی دینەکەیەو ناشێت هیچ نێرراوێکی خوای گەورە ئیهمالی بکات.

دەبێ ئەوان (ئیمام)ی دوای خۆیان دیاریی بکەن، نەک بیخەنە بەردەستی عەوام! دەڵێن: ئیمامەکان وەکو پێغەمبەرانن، مەعسوومن، گوناح ناکەن و پاکن، نە گوناحی گەورەو نە گوناحی گچکەیان لێناوەشێتەوە، خوای گەورە ئیمامەکانیش وەکو پێغەمبەرەکان( علیهم السلام) دەپارێزێت[1].

---

[1] گەورەترین مەزهەبی شیعە پێنجن: کەیسانییەو زەیدییەو ئیمامیەو ئیسماعیلییەو غولاتەکانیان. ←

ئەمـانە ـبە تـايبەتی ئيمامييەكـان ـ پێيـانوايە: ئـيمامەت پڕاوپـڕ وەكـو پێغەمبەرێتيە، هەر وەكو كە خـوای گەورە لە نێـوان خەڵكييـدا نێـرراوی خـۆی هەڵـدەبژێرێت و پەيـامی بە وەحيـی بـۆ دەنێرێـت و مـوعجيزەی لەسەردەسـت نيشاندەدات، كە تەنها بە خوای گەورە دەكرێت، بە هەمان شێوەش ئيمام لە نێوان خەڵكييدا هەڵدەبژێرێت و بە پێغەمبەرانی دەفەرمووێ، كە فڵان و فـڵان ئيمامـی دوای جەنابتانن.

ئاوا بە دەق ناويان دياريدەكرێت، لەوانەشن كە ناسراوی نـاو خەڵكـين، دوای كۆچی دوايی نێرراوانی خوای گەورە ئەم ئيمامانە، هەمـان ئەركـی پێغەمـبەرەكە دەگرنەئەستۆ.

هەمـوو جيـاوازی نێـوان ئـيمام و پێغەمـبەرەكە ئەوەيە :كە وەحـی بـۆ ئـيمام نايەت، بەڵام هەموو ئەحكامێـك ڕاسـتەوخۆ لە پێغەمـبەرەكەوە وەردەگرێـت و خـــوای گەورەش سەرپەرشـــتی دەكـــات، بـــۆيە ڕاســـت و دروســـت و ڕەوا ڕەفتاردەكات.

لەم وەسـفانەوەيە، كە شـيعە ،ئيمامەكانيـان بە مەعسـوم (پـاك و پيـرۆزو دوورلەگوناح و هەڵە) دەبينن[1]،هەر لە منداڵييانەوە، تـا مردنيـان، لە گونـاحيش دوورن و هەڵەش ناكەن، نە بە ئەنقەست و نە بە سەهوو...

دەڵێن: ئيمام دوورە لە گوناح، لە نەزانين، لە هەڵە، لە سەهوو، لە بيرچـوونەوە

---

بڕوانە: أبوالفتح محمـد عبدالكريم ابن أبي بكـر احمـد الشهرسـتاني: الملـل والنحـل. تـوێژينەوەی: عبدالعزيز محمـد الوكيل. بڵاوكار: مؤسسة الحلبي وشركاؤه قاهيره ١٣٨٧ك/ ١٩٦٨ز ب١ ل: ١٤٦ و دواتريی.

(١) ابن المطهر الحلي: منهـاج الإمامـة في معرفـة الكرامـة. لە سـەرەتای كتێبـی منهـاج السـنة كەی ئيبنوتەيمييەدايە ل: ٧٧و دواتريـی. هەروەهـا بـڕوانە: معزالـدين السـيد محمـد المهـدي الحسـيني الشهير بالقزويني: قلائد الخرائد في أصول العقائد. توێژينەوەی جودت كاظم القزوينـي چاپخـانەی الإرشاد/ بغداد چاپی يەكەم ١٣٩٢ك/ ١٩٧٣ز ل: ٧٢ ودواتريی. هەروەها بڕوانە: محمـد الحسـين آل كاشف الغطاء: أصل الشيعة وأصولها چاپی نۆيەم ل: ١٢٨.

،چونکە پاراستنی شەرعی لە ئەستۆدایە، هەمـوو حاڵەتێکیـان وەکـو حـاڵەتی پێغەمبەرانە، ئەو بەڵگانەی بۆ مەعسومێتی پێغەمبەرانن بەڵگەی مەعسـومێتی ئەمانیشن ،هیچ جیاوازییەکیان نییە.

ئیمامییەکان زیاتر رۆیشتوون و دەڵـێن: فەرمـانی ئـیمام، فەرمـانی خـوایە، نەهـی ئـیمام، نەهـی خـواییەو ملکەچیـی و گـوێڕایەڵیی ئـیمام، ملکەچیـی و گوێڕایەڵیی خوای گەورەیەو، گوناحکردن بەرامبەریـان، گونـاحکردنە بەرامـبەر خـوای گەورە، ئەوی دۆسـتی ئیمامەکـانە، دۆسـتی خـوایی گەورەیەو ئەوی دوژمنیـانە دوژمنـی خـوای گەورەیە، نابێـت فەرمایشـتیان رەتبکـرێتەوە، ئەوی فەرمایشتیان رەتبکـاتەوە، حـوکمی ئەوەیە: کە فەرمایشـتی پێغەمـبەری خـوای (صلی اللە علیە وسلم) رەتکردۆتەوە، ئەوی فەرمایشتی پێغەمبەری خـوا (صـلی اللـە علیـە وسـلم) رەتبکـاتەوە وەکـو ئەوەیە: کە فەرمایشـتی خـوای گەورەی رەتکـردبێتەوە. دەبێـت بەهەمـوو شـێوەیەک فەرمانیـان قبوڵبکرێـت و جێبەجێبکرێت[1].

لەمانیشدا هەیانە بێ تەفسیلات و ڕوونکردنەوە دەڵێ: بڕیاری ئیمام بڕیاری خوای گەورەیە.. ئەمە دیدو رای تەفویزییەکان (المفوضیە) یشیانە[2].

هەندێکیتریان وەکو سەبەئیەکانیان دەڵێن: ئیمامەکـان خـوان ،چـونکە خـوا لەوانـدا خـۆی نیشـاندەدات و لەوانیشـدا پەنهـان دەبێـت، بـۆیە ئەوان هەرچـی دەیفەرموون لە خواوەیە!..

---

(١) محمـد رضا المظفر: عقائد الإمامیة . المطبعـة العالمیـة قـاهیرە چـاپی هەشـتەم ١٣٩٣ک. ١٩٧٣ز ل: ٧٢_٧٤.

(٢) القاضي أبوالحسن عبدالجبار: المغني في أبواب التوحید والعدل. الدار المصریة للتألیف والترجمـة/ سلسلة تراثنا ب٢٠ بەشی یەکەم ل:١٣.

هەموو ئەمەیان دەربارەی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالیب - خوالێی ڕازی بێت -وتووە.

سەرەتا دەیانووت: پێغەمبەرەو بەردەوام وەحی بۆ هاتووە، تا دواتر بوو بەخوای گەورەو لەگەڵ ئەودا بوون بەیەک.

کۆمەڵێتریشیان هەیە کە هەر ئەمە باوەڕیانە. وەکو (الباطنیة) و (البیانیة) و (المغیریة) و (الخطابیة)[١].

**گومانی سێیەم: ئیسلام حکومەتی ڕاستەوخۆی خوایە:**

ئەم گومانە هەندێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان وەکو (سانتیلانە) وروژاندوویانە، بۆ ئەوەی پڕاوپڕ پێناسەکانی خۆیان بۆ حکومەتە دینییەکانی سەدە تاریکەکانیان بهێننە سەر ئیسلام و سیستمە سیاسیەکەی، بۆیە دەبینیت وەکو ئەوەی وەسفی (گەلی جولەکە) و (دەسەڵاتی پاپا) بکات.

بۆ ئیسلامییش دەڵێ: (ئیسلام حکومەتی ڕاستەوخۆی خوایە، کە هەمیشە سەرپەشتیارێتیی و چاودێریی گەلەکەی دەکات، دەوڵەت لە ئیسلامدا خوا نوێنەرێتی دەکات،تەنانەت کارمەندان فەرمانبەرو گشتییەکانیشی، فەرمانبەری لای خوان)[٢].

ئەم پێناسەو وەسفەی (سانتیلانە) بۆ سیستمی ئیسلامیی دەیکات ،کتومت

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ل: ١٣.

(٢) لەبەر گرنگی دەستەواژەکەی خۆی بە دەقی خۆی وەکو خۆی بە ئینگلیزییەکەشی دەیهێنینەوە:

(Islam in The direct government of Alla, The rule of God Whose eyaes are upon his people. The State in Islam Personified by Alla, Even the Puplic functionaries are employees of Alla.)

_ De Santillana: The Legacy of Islam, P.286.

پێناسەو وەسفی (حکومەتی تیوکراسی)یە، هەر وەکو کە لە فەرهەنگ و دەستووری ڕۆژئاواییدا هاتووە.

## گومانی چوارەم: ئیسلام دینەو دەوڵەتی نەخواستووە:

ئەمە ئەوەیە، کە لە دەیەی سێیەمی سەدەی بیستەمدا (شێخ عەلی عبدالرزاق) بە بڵاوکردنەوەی کتێبی (الاسلام وأصول الحکم) وروژاندی، کە دیدو ڕای خۆی تێدا ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ: کە ئیسلام دینی هێناوە، نەک دەوڵەت، روکن و ئوسوڵەکانی ئیسلام نەیانفەرمووە دەوڵەت دامەزرێنن..

واتە: ئیسلام عەقیدەیە، نەک شەریعەت، بەڵام لە ناو خودی کتێبەکەشییدا گومانیتر دەوروژێنێت، وەکو ئەوەی، کە دەڵێ؛ خەلیفە دەسەڵاتی لە دەسەڵاتی خواوە وەردەگرێت و هێزی لە هێزی خواوەیە...

ئینجا دەڵێ: ئەمەش بۆچوونێکە دەبینیت وەکو باوەڕ لە ناخی زانایان _بە تایبەتی و موسوڵمانان‌دا بەگشتی_ چەسپیووە.

هەموو قسەو باسێکیان دەربارەی خیلافەت ئاماژە بەم باوەڕە پتەوبووە،ئەمەیان بە ڕێسایەکی عەقائیدیی وەرگرتووە...).

پاشان دەڵێ: (موسوڵمانان خەلیفەیان بەسێبەری خوا لە سەر زەمیندا دادەنا، تەنانەت (ئەبوجەعفەری مەنسوور) لافوگەزافی ئەوەی لێدەدا:کە ئەو دەسەڵاتی خوایە لەسەر زەمیندا، وەکو کە لە یەکێک لە وتارەکانییدا وتبووی...).

پاشان دەڵێ: (ئەم ڕاو بۆچوونە بەناوبانگەو زانایان و شاعیرانی موسوڵمان، هەر لەسەدەکانی یەکەمەوە دەیڵێن و دەیڵێنەوە)[١]..

---

(١) علي عبدالرزاق: الaسلام وأصول الحکم چاپی ١٩٢٥ز ل: ٧و دوتریی.

_ ئەم کتێبە _کە یەکەمین چاپی لە ١٩٢٥ لە میسر بوو، تا ١٩٦٦ چاپ نەکرایەوە، ئینجا لە بەیروت لە دار مکتبة الحیاة چاپکرایەوەو لە ١٩٧٢شدا المؤسسة العربیة للدراسات والنشر_ لە بەیروت لە

←

ریزی (سلسلة الدراسات التاريخية)دا لەژێر ناوی: (الاسلام وأصول الحكم لعلي عبدالرزاق. دراسة ووثائق بقلم محمد عمارة) بڵاوی کردەوە _ هەراو گەرەلاوژێیەکی زۆر گەورەی نایەوە. هەراکەی لەبەر ئەوە نەبوو کە ناوەرۆکەکەی زۆر گرنگە، بەڵکو لەبەر ئەوەی نکوولّیکردنی هەبوونی سیاسەت و حوکمڕانی و خیلافەت لە ئیسلامدا بیرۆکەیەکی نامۆو غەریبەبوو.

سەیرتر ئەوەبوو کە هەندێک نووسەری تری سەردەم کەوتنە ژێر کاریگەریی پاڵانتەکانی عەلی عبدالرزاق! وەکو: شێخ خالید محمد خالید کە لە کتێبەکەیدا: (من هنا نبدأ) کە لە ١٩٦٣دا بڵاویکردەوە، تێیدا دەڵێ: (بە لامەوە ئەوە هیچ گرنگییەکی نییە کە دین دەوڵەتی هەبێت یان نا. ئەوەشم بەلاوە گرنگ نییە کە دین تەدەخول بکاتە کاروباری دەوڵەتەوە، یان نا)!هەر لە دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی عەلی عبدالرزاقەوە زۆر کتێبیتر لە رەتکردنەوەی بۆچوون و رەواندنەوەی گومانەکانییدا دەرچوون.

لەوانە: کتێبەکەی موفتی گەورەی ئەوکاتەی میسر: شێخ محمد البخيت المطيعي: (حقيقة الاسلام وأصول الحكم) و کتێبەکەی شێخی ئەزهەری ئەوکاتە: شێخ محمد الخضر حسين: (نقض كتاب الاسلام وأصول احكم)و کتێبەکەی موفتی مەزهەبی مالیکی لە تونس: شێخ محمد الطاهر: (نقد علمي لكتاب الاسلام وأصول الحكم) هەروەها کتێبەکەی دکتۆر ضیاءالدين الريس:(الاسلام والخلافة في العصر الحديث) بڵاوکار: منشورات العصر الحديث/ بيروت.کە لە ١٣٩٣ک/ ١٩٧٣ز دا بڵاوکرایەوە.

ئینجا هەموو ئەو کتێبانەی لەسەر فیقهی دەستووریی لە ئیسلامدا نوسرابوون، هەموویان رەددیان لە عەلی عبدالرزاق و بۆچوونە نامۆکانی دایەوە. هەروەها سەدان مەقالەو بابەتی تری شیکاریی و رەخنە کە لە رۆژنامەو گۆڤارو بلاڤۆکە خولییەکاندا بڵاودەکرانەوە..

ئەمما دەربارەی ئەوەی کە شێخ خالید محمد خالید نوسیبووی، زۆری نەبرد هەر خۆی لە ١٩٧٧دا لێی پەشیمانبۆوەو لە زۆر بابەتی خۆیدا کە لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاویکردنەوە نووسی کە ئیسلام دین و دەوڵەتە.

لە چاوپێکەوتنیشییدا لەگەڵ گۆڤاری (الدعوة ژمارە/٢٢ ساڵی ٢٧ بەرواری ٥ی رەبیعی دووەمی ساڵی ١٣٩٨ک/ ئازاری ١٩٧٨)دا دانی بەوەدا نا کە هەڵەبووە. پاشان هەر خۆی کتێبێکی دەرکرد بە ناوی (الدولة في الاسلام) کە لە دار ثابت للنشر/قاهيره لە

←

پاشان هەندێک رستەی ئینشائی مەدح و پێداهەڵدانی دانەرانی هەندێک کتێب دەکاتە بەڵگە، کە نوسەران لە پێشەکی کتێبەکانیاندا وەکو سڵاو پێشکەشیی و رێز بۆ دەسەڵاتدارانی زەمانی خۆیانیان نووسیووە !

ئینجا دوایی ئاوا کۆتایی بە بۆچوونەکەی دەهێنێت: (پوختەی باس ئەوەیە: کە خەلیفە دەسەڵاتی حوکمڕانی خۆی لە خوای گەورەوە وەردەگرێت، ئەمەش دیدو رایەکە لەسەر زمانی هەموانیانەو لەناو موسوڵمانانددا بڵاوە)... دوای ئەمە دەڵێ: (هەندێک لە زانایان دەڵێن: دەسەڵاتی خەلیفە هەر لە ئوممەتەوە دێت)[1].

**دووەم: رەواندنەوەی گومانەکان:**

سەرەتا وەکو ئاماژەمان پێدا بۆ وەڵامیوردەکارییانەی ئەم گومانانە دەبێ دووجۆر وەڵام بدەینەوە:

١- وەڵامێکی گشتی: بە باسکردنی دیدو تێڕوانینی گشتی ئیسلام دەربارەی پلەی خەلیفە لە دەوڵەتی ئیسلامییداو پەیوەندیی خەلیفە بە خوای گەورەوە.

٢- وەڵامی تایبەت: کە رەواندنەوەی هەر یەک لەو گومانانەیە، کە وروژێنراون کە بە چوار خاڵ دەبێت:

<u>١-وەڵامی گشتی گومانەکان دەربارەی حاکمێتیی لە ئیسلامدا:</u>

ئەمە بیر خستنەوەیەکە دەربارەی پەیوەندی حاکمی موسوڵمان (خەلیفە) بەخوای گەورە وەو پەیوەستی ئەمە بە بنەماکانی عەقیدەوە.

پێشتر وتمان: کە مرۆڤ لە لایەن خوای گەورەوە لەم زەمینەدا کراوە بە

---

١٤٠١ک/١٩٨١ز دا چاپی یەکەمی بڵاوکردەوە، کە هەموو لەسەر سەلماندنی هەبوونی سیاسەت و حوکم و دەوڵەتە لە ئیسلامدا.

(١) سەرچاوەی پێشوو ل: ٧ و دواتریی.

بریکـــاریی.. ئەرکـــی سەرشانیشـــی بـــریتیە لە: ئـــاوەدانکردنەوەی زەوی و نیشتەجێبوون تێیدا... ئەمە بریکارییە گشتیەکەبوو، کە بە تـاک تـاکی مـرۆڤ نایاتەدیی، بەڵکو بە کۆمەڵگەیەکی ڕێکخراویی مرۆیی دێتەدیی..

ئیبنـــوتەیمییە- رحمەالـــلە - دەفەرمـــووێ: ((کاروبـــاری بەنوئـــادەم و بەرژەوەندییەکانیان بە کۆبوونەوەو کۆمەڵکاریی نەبێت، نایەتەدیی ،چونکە هەر یەکەیـان پێویسـتی بەوانیـترە، کە کۆمەڵکـارانەش کۆبـوونەوە، هەر دەبێـت سەرێکیان هەبێت، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرمـووێ: (إِذَا خَرَجَ ثَلاَثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ ) ئەبوداود.

واتە: ئەگەر سێ کەس بۆ سەفەر لەماڵ، لەشار چوونەدەرێ، بـا یەکێـک لە خۆیان بکەنە ئەمیری خۆیان... ئیبنوعومەر خوا لێیان رازی بێت دەگێـڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (لَا يَحِلُّ لِثَلَاثَةٍ يَكُوْنُوْنَ بِفَلَاةٍ مِنَ الْأَرْضِ إِلَّا أَمَّرُوْا عَلَيْهِمْ أَحَدَهُمْ). [١]

واتە: جائیز نییە سێ کەس لە دەشتێک بن و یەکێکیانیان نەکردبێتە ئەمیری خۆیـان.. دیـارە کە داوایکـردوە لە کۆبـوونەوەی کەسـانێکی کەمـدا دەبێـت یەکێکیان بکەنە ئەمیر، ئەو بۆ هۆشداریدانیانە کە لە هەموو جۆرە کۆبـوونەوەو کۆمەڵکارییەکیاندا دەبێت یەکێکیان بە ئەمیری خۆیان دابنین))[٢].

---

[١] نووسەری بەڕێـز نوسـیوێتی: (السیاسـة الشرعیة ل:١٥٨). بەڵام پێویسـتە حـوکمی فەرمـوودەکە روونببێتەوە، ئەگەرچی ئیمامی ئیبنوتەیمییە رحمەالله هێناوێتیەوە. فەرمووده‌كە: ئیمامی ئەحمەد لە (المسـند/٥٦٩ و٦٦٤٧) هێنـاوێتی. بەڵام ئەلبـانی رحمەالـلە لە (سلسـلة الأحادیـث الضـعیفة ٥٦/٢ ژ٥٨٩)دا دەفەرموێ: زەعیفە. بەڵام ریوایەتەکەی یەکەمیـان: (إِذَا خَـرَجَ ثَلَاثَـةٌ فِي سَـفَرٍ فَلْيُـؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ) ئەبوداوود (٢٧٠٨). شێخی ئەلبانی رحمەالله دەفەرموێ: سەحیحە.

(٢) السیاسة الشرعیة ل:١٨٥.

پێشتر باسمانکرد: کە خیلافەتی ئەم دەسەڵاتدارێتییە سیاسییە لە ئیسلامدا بریتیە لە بریکاریی تایبەت بە سەرۆکایەتی موسوڵمانان خۆیان[1].

لە ڕاستییدا ئەستەمە لە ماهییەت و چۆنییەتی حوکمڕانی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بزانرێت ،ئەگەر ماف و ئەرک و دەسەڵاتەکانی بە دیدو تێڕوانینە عەقائیدیەکەی ئیسلام ـدەربارەی بریکارێتیی مرۆڤ لەسەر زەمین ـ پەیوەست نەکرێتەوە..

هەروەها بە پێکهاتەکانی تری دیدو تێڕوانینی ئیسلام دەربارەی شاهێدیدانی خوایەتی خوای گەورە کە لە رۆژی ئەزەلدابووە،هەروەها پەیوەستبوونەوە بە مەسەلەی راسپاردە (ئەمانەت)ە خواییەکەوە، کە خوای گەورە خستیە ئەستۆی مرۆڤەکان، کە لە باسی پێشودا زیاتر ڕوونمانکردنەوە... ئەمانە هەموویان دەبێت پێکەوە پەیوەستبکرێنەوە.

دەبێ دیدو تێڕوانینە عەقائیدیەکە دەربارەی بریکارێتییەکەی مرۆڤ بە گشتی لە ناخی تاک تاکەکانی مرۆڤدا جێگیرببێت و بزانن بۆچی لەسەرزەمینن؟

ئەرک و رۆڵی بریکارێتییەکان چییە؟.. ئینجا لەم تاک تاکانە کۆمەڵگەیەک پێکدێت، ئینجا ـبە حوکمی دیدە دینیەکەو پێداویستی واقیعەکە پەیوەندیی تووندوتۆڵی عەقائیدیی و بەرپرسێتی ئەرکی بریکاریی و هێنانەدیی بەرژەوەندییەکانیان ـ زیاتر کۆمەڵکارانە دەبزوێن..

بە پێی دیدە عەقائیدییەکەو زەروورەتە واقیعییەکەش، دەبێ لەناو خۆیاندا سەرێک ـوەکو ئیبنوتەیمیە فەرمووی ـ لەناوخۆیاندا بکەنە حوکمڕانی خۆیان و دەسەڵاتی باڵای پێبەخشن، تا دین و ئەحکامەکانیان بەسەردا بچەسپێنیت و حوکمی نێوانایان بکات و ئاڕاستەی خواپەرستیی و دینداریيان بکات و لەسەر

(١) د. فاروق دسوقي: مشكلة الحرية في الفكر الاسلامي الخالص ل:٥٥.

سەلماندن وچەسپاندنی شەرع رایانبهێنێت.. کەس لەو رەعیـیەتە فەرمـانی دینـی ڕاستەوخۆی لە خوای گەورەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو لە ڕێگای نێرراوانی خـوای گەورەوە بوو، کۆمەڵگە بەکۆمەڵگە ئاوا هاتووە. کاتێـک لە دیـن ودینـداریی و بریکاریی لایانداوە نێرراویتریان بۆ هاتووە. تا ئەو زەمانەی کە پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیـه وسـلم) ،کە کۆتـا پێغەمـبەری خـوایە بـۆ هەمـوو مرۆڤـایەتیی تەشریفی هێنا.

کۆمەڵگە ئیسلامییەکەی یەکەمینیش هەر وا بەو بـاوەڕو هەسـتی ئینـتماو بەرپرسـێتی بریکـارییەوە دامەزرا.. تـاک تـاکی ئەوانـیش فەرمـان و ئەرکـی بریکارێتییەکەی خوای گەورەیان ڕاسـتەوخۆ لە خـوای گەورەوە وەرنەگرتبـوو، بەڵکـو لە ڕێگـای پێغەمـبەری خـواوە (صـلی الـله علیـه وسـلم) کە بـوو بەپەیامهێنەری خوای گەورەو بریکـاری حـوکمڕان و ئەحکامەکـانی ئیسـلامیی پێگەیانـدن و لەناویانـدا سـەلماندی و چەسـپاندنی (لە سـەلماندن و چەسـپاندنی خوایەتی خوای گەورەو عەبـدێتی مـرۆڤ و حـوکمکردنی دەوڵەت و ئاڕاسـتەی کۆمەڵگەکەیان بە ئەحکامەکانی قورئان و سوننەت) .

دوای جەنابیشی (صلی الله علیه وسلم)، خەلیفەکانی -خوا لێیان رازی بێت- هەمان رۆڵی سەلماندن و چەسپاندنی خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی مـرۆڤ و حوکمی دادپەروەرانەیان بەشەرع هێنایەدیی.

دانانی حاکمی بـاڵای دەوڵەتـی ئیسـلامیی هەر لەسەردەسـتی موسـوڵمانان دەبێت، کە کۆمەڵگەی ئەو دەوڵەتەن، کە خەلـیفەکەی بـۆ هەڵـدەبژێرن، خەلـیفە بەرەزامەندیی موسوڵمانان دەبێتە دەسەڵاتداری باڵا، تا ببێتە ئـامێری سـەلماندن و چەسپاندنی بریکارێتییەکە، کە چەسپاندنی شەریعەتی ئیسلام دەبێت.

ئـاوا (بریکـارێتیی خـوای گەورە لەسـەرزەمین) دا دێتەدیـی (لە ڕاسـتییدا بریکارێتیی سەرزەمین زیاتر پێشەواو ڕێبەرو دەسەڵاتدارانی مرۆڤ دەگرێتەوە ،چونکە ئەوان داوایان لێدەکرێت ئەحکامەکـانی شـەریعەتی خـوا بچەسـپێنن و دادپەروەریی لەناو خەڵکییدا بەو شەریعەتە بهێننەدیی) .

ئاوا هەردوو بریکارییەکە لە کۆمەڵگەو دەوڵەتی ئیسلامییدا دێتەدیی، بریکارێتیی گشتی مرۆڤەکان و بریکارێتیی دەسەڵاتداری دەوڵەت، کە بریکاریی تایبەتە.. هیچ لایەکیان ڕاستەوخۆ، یان لاوەکی، وەحی لە خوای گەورەوە وەرناگرن..

هیچ لایەکیان کۆمەڵگەو خەلیفە، پەیوەندیی تایبەتیان بە خوای گەورەوە نییە. جگە لە بەجێهێنانی ئەرکی بریکارێتییەکە، کە بە حوکمی قورئان و سوننەت بۆتە بەرپرسێتی دنیاو قیامەتیان... بریکارێتیەکە -کە دەبێ هەردوولایان بیهێننە دیی_ ڕۆشنە، بریتیە لە سەلماندن و چەسپاندنی خوایەتی خوای تاک وپاک و عەبدێتی مرۆڤەکان، وەکو زۆر جارمان ئاماژەپێداوە، کە ڕوون دەبێتەوە: ئا ئەمەیە ئامانج و مەبەست لە خەلقبوون و هاتنی مرۆڤ بۆ سەرزەمین، ئیتر بواری ئەوە نامێنێت کەسێک لافوگەزافی پەیوەندیی تایبەت بەخوای گەورەوە لێبدات، نە تاک و نە کۆ.

نە حاکم (وەکو کە فیرعەون دەیوت: من خواتانم) و نە رەعییەت (وەکو جولەکەکان دەڵێن: ئێمە گەلی هەڵبژاردەی خواین).. بە کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەحی نەماو هەر هەموو مرۆڤ لەبەردەستی خوای گەورەدا وەکو یەکیان لێهاتووەو کەسیان پەیوەندیی تایبەتیان پێوەی نییە...

هەرچی هەیەو ئەرکی هەموویانە بیگرنەبەر: قورئان و سوننەتە، کە ئەحکامەکانی دەسەڵاتدارو رەعییەت وەکو یەک دەگرێتەوە.. هەر وەکو کە دەوڵەمەندو هەژار، یان پیاو ئافرەت، یان گەورەو بچووک دەگرێتەوە، بێ جیاوازیی، بێ هەبوونی پلەی چاکترو خراپتر... هەر کەسێک تەقواکاریی زیاتربێت (سەلماندن و چەسپاندنی خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی خۆی و پابەندبوونی بە شەرعەوە زیاتر بێت) ئەوە لە پێشترە لەو کەسەی کە کەمتریی لەوانە هەیە..

ئەم پـــــلەیەی چـــــاکێتییەش لە قیامەتـــــدایە، نەک لە دنیـــــادا، ئەمەش بەڵگەنەویست و ڕۆشنە.. هەر لەو ڕۆژەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الـله عليـه وسـلم) بە( بەنوهاشـم)ی فەرمـوو: (یـا بَنـي هاشِـم لا يَجيئُنـي النَّـاسُ بـالأعمالِ وَتَجيئونني بِالأنسابِ، إ ن أكرَمَكُم عنداللهِ أتقاكُم).[1]

واتە: هۆ گەلۆی بەنوهاشم! خزمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليـه وسـلم) نەکەن خەڵکـی بە کـردەوەی چـاک لـێم نزیـک ببـنەوەو ئێـوەش وا بـزانن بە خزمایەتیم بۆتان لێم نزیک دەبنەوە! نا، بەرێزتـرین کەس لای خـوای گەورە، ئەو کەسەتانە، کە تەقوای خوای گەورەی زیاتر هەیە.

*ڕەخنە و وەڵامێک:

لەوانەیە کەسێک ڕەخنە لەوە بگرێت، کە ئەرکـی حـاکم و دانـانی لەسـەر بنەمایەکی نادیار (غەیبی) هەسـتپێنەکراو، کـارێکی ڕاسـت و دروسـت نابێـت، چۆن دەشێت ئیعتیمادبکرێتە سەر ڕەفتارانێـک کە پـێش خەلقبـوونی جەسـتەیی مرۆڤ ئەنجامدراون؟

کە بارودۆخ و کیـانێکیتر بـووە، جیـاواز لە بـارودۆخی بەشـەریی و کیـانی بەشەرێتیی ئیستای مرۆڤ؟

هەروەهـا ئیعتیمادکـردنە سـەر بەڵگەیەکـی غەیبـی، کە شـاهێدیدانە لەسـەر خوایەتی خوای گەورەو، پاشان وەرگرتنی ڕاسپاردە (ئەمانەت)ە خواییەکە لێی..

---

(١) نووسەری بەڕێز هەر ئاوا ئەوەی هێناوەتەوەو ئاماژەی بە سەنەدو حوکمی نەکردووە. بە لەفزی (لا يجيئني) نەمدۆزییەوە بەڵام بە لەفزی (لا يـأتيني) ڕیوایەتەکـانی زۆرو جۆراوجـۆرن.. ئەوەی لای ترمذی و ئیمامی ئەحمەدە ئـاوایە: (يـا بنـي هاشـم لا يـأتيَنِّيَ النَّـاسُ بـأعمالِهم وتـأتوني بأنسـابِكُم). ڕیوایەتی متفق علیه ئاوایە: (يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لاَ أُغْنِي عَـنْكُمْ مِـنَ اللَّـهِ شَـيْئًا ، يَـا عَبَّـاسُ بْـنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ، وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ لاَ أُغْنِي عَنْـكِ مِـنَ اللَّـهِ شَـيْئًا ، وَيَـا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَـيْئًا) بوخـاری (٢٧٥٣)، موسـلیم (٢٠٦).

ئەمە چۆن دەبێتە گرێیەست كە سەرەتای دیـار نیـیەو ناتوانرێـت دیـاری بكرێت؟

نازانرێت چ قۆناغێكی چ مێژوویەك بووە!

لە ڕاستییدا ئەمە ڕەخنەیەكە ،جێ و ڕێی خۆی هەیە، ئەگەرچـی لە لایەنـی هـزرو ژیریـی و لە لایەنـی بەڵـگەی (نەقـڵ)یشـەوە دەسـەلمێنرێت، كە شـتێكی مومكینەو مەحاڵ نییە.

لە ڕووی هزرو ژیرییەوەو كە تەنهـا بەوەنـدەی كە وەسـفدەكرێت كە نادیـار (غەیـب)یــیە، بەڵــگەی ئەوە نیــیە كە ڕاســتە، یــان هەڵەیە، ئەوە یەك مانــا دەبەخشێت ،كە دەڵێین :تیۆرە غەیبییەكان ناكەونە ژێـر ڕێسـاكانی تـوێژینەوەی زانستەوە.. بەڵام خۆ ئەوە ئاشكرایە كە مەرج نییە هەر شێتك خرایە ژێر ڕێسای توێژینەوەی زانستەوە ڕاست و دروست بێت.

هەروەها بە پێچەوانەشەوە مەرج نییە هەر شتیک نەخـرایە ژێـر ڕێسـاكانی تـوێژینەوەی زانسـت هەڵەبێـت.. دەیـان تیـۆر هەیە كە لە سـەدەكانی پێشـوودا بەڕاست و دروست دەزانـران، بەڵام ئەمـڕۆ كەس لا ناكـات بەلایـانەوە ،چـونكە لەتوێژینەوەی زانسـتییدا دەرنەچـوون،كە وایەو ڕاسـتە، هەر وەكـو كە سـەدان شتیتریش هەبوو، هەر وا دەزانـرا جـۆرێكە لە خەیـاڵات و وەهـم، كەچـی ئێسـتا بەزانست سەلمێنراون، كە زانستی ڕاست و حەقیقەتی ژیانن[1].

ئەمما لە لایەنی (نەقڵ)ی بەڵگەوە موسوڵمان مەرجەو فەرزی باوەڕەكەیەتی، كە باوەڕی بە نادیار (غەیب) هەبێت، ئەگەر باوەڕی پێیان نەبوو، بێگومـان ئەوە هەڵوەشاندنەوەی خودی ئیمانێتی.

خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی بەقەرەدا دەفەرمووێ: كە ئەم قورئانە بـۆ ئەو كەسانەیە كە باوەڕیان بە نادیار هەیە، دەفەرمـووێ:﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ

(١) د. يحيى الجمل: الأنظمة السياسية المعاصرة ل:٥٥

فِيهِۛ هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣﴾ البقرة: ١ – ٣.

واتە: ئەم قورئـانە بە هـیچ کلۆچێـک گومـانی تێـدانییە کە لە لایەن خـواوە هـاتووەو هەمـووی ڕاسـت و دروسـت و ڕەوایەو مـایەی ڕێنمایـی تەقواکـارانە، ئەوانەی کە باوەڕیـان بە نادیـار هەیەو نـوێژدەکەن و لەوەی پـێیان بەخشـیوون دەکەنە خێرو زەکات...

هەروەهـا دەفەرمـووێ: ﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ١١﴾ یس: ١١ .

واتە: بەم قورئانە هۆشداریی بدە بەو کەسـانەی شـوێنیدەکەون و لە خـوای میهرەبانی خۆیان _کە نادیارە- دەترسن.. ئەوانە مژدەیان بدەرێ کە خـوای گەورە لێیان خۆش دەبێت و پاداشتی ڕێزدارییان دەبێت.

-لەو فەرمـوودە بەناوبـانگەدا ،کە (موسـلیم) لە سـەیدنا (عـومەری کـوڕی خەتـاب)ەوە - خـوالێی ڕازی بێـت -گێـڕاوێتیەوە کە دەربـارەی تەشریفهێنـانی جیبریل (جوبرائیل)ە بۆ خزمەتـی پێغەمـبەری خـوا (صـلی الـلە علیـە وسـلم )لە شێوەی عارەبێکی دەشتەکییدا، کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلی الـلە علیـە وسلم) دەکات کە (ئیمان) چییە و(ئیسلام) چییە؟

لە وەڵامی پرسیاری (ئیماندا) دەفەرمووێ: (أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلائِكَتِـهِ وَكُتُبِـهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ).[1]

واتە: ئەوەیە کە باوەڕبهێنیـــت بە خـــوای گەورەو بە فریشـــتەکانی و بەکتێبەکانی و بە نێرراوانی و بە ڕۆژی دوایی بهێنیـت، هەروەهـا باوەڕبهێنیـت بەقەزاوقەدەر، کە چاک و خراپی هەر لەخوای گەورەوەیە.

(١) نووسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە: ( شرح رياض الصالحين للنـووي طبعـة شركـة الشـمرلي الطبعة السابعة ١٩٧٣م ص ١٢ ومابعدها). فەرموودەکە متفق علـیەیە: بوخـاری (٤٧٧٧)، موسـلیم (٩).

ئەو موسـولْمانەی بـاوەڕی بەو باسـانە نەبێـت، کە لە قورئانـدا دەربـارەی پێکهـاتەی یەکەمینـی مـرۆڤ و جیهـانی ڕۆح و شـاهیدیدانی یەکەمجـارو ڕاسـپاردەو بریکـارێتیی مـرۆڤ لەسـەرزەمین هـاتوون، باوەڕهێنـانەکەی لـێ وەرناگیرێت ،چونکە ئەوە ڕەفزکردنی قورئـان وسـوننەتە.. (ئـێمە هـزرو ژیـریمان ئەوەندە بەکاردەهێنین تا ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوامان (صلى الله عليه وسلم) لا دەچەسپێت و دڵنیادەبین، کە بەڵێ، وەحیی بۆ هـاتووە، کە ئەم قورئـانەیە.. کە گەیشتینە ئەم ئەنجامە ئیـتر شـەرع دەبێـتە سـەرچاوەی حەقـی زانیـاریمان و لە هەموو شتێکدا دەگەڕێینەوە سەر شەرع)[١].

## ٢-وەڵامی تایبەتی هەر یەک لە گومانەکان:

### ڕەو اندنەوەی گومانی یەکەم:

ئەو گومانەی ،کە دەڵێ: حاکمی موسوڵمان دەسەڵاتی خۆی بە پێـی (مـافی خوایی) یان (مۆڵەتپێدانی خوایی) لە خوای گەورەوە وەردەگرێت.

بەڵگەشیان ئەوە بوو:کە سەیدنا عوسـمانی کـوڕی عەففـان - خـوالێی ڕازی بێت -فەرمووی: (كَيفَ اخْلَعُ قَميصاً قَمَّصَنِيَهُ الله) .

واتە: چۆن ئەو کراسە لەبەر خۆم داماڵم، کە خوای گەورە کردویێتیە بەرم؟!

لە ڕاستییدا ئەمە ناشێت بکرێتە بەڵـگەی پاڵپشـتی گومـانێکی وا گەورە، چونکە ئەمە پێچەوانەی ڕێسا سەرەکییەکەی سیستمی حوکمی ئیسـلامییە، کە دەفەرمووێ: دانانی خەلیفە بە هەڵبژاردنی ئازادانەی ئوممەتەکە دەبێت بۆی.. کە کەسایەتییە لێهاتووەکانی ئوممەت _کە پێیان دەووترێت: (ئەهلی حەللوعەقـد)، یان (ئەهلی ئیختیار)_ هەڵیدەیژێرن.

(١) ابن تيميه: درع تعارض العقل والنقل توێژینەوەی محمـد رشـاد سـالم چـاپی دار الكتـب المصرـية. قاهيره. چاپی ١٣٩١ک/١٩٧١ز ب١ ل:٨٦و دواتریی.

دواتر دێینەوە سەر ئەم خاڵە (ان شاء الـله)، ئەمـانە نـاسراوانی ئـوممەتن لە زانایان و شەرعناسان و شارەزایانی واقیع و ئەهلی ڕاوێژو ڕا، کە ئەم ئەرکەیـان دەخرێتەئەسـتۆ، هەر وەکـو کە لادانیشـیان لە دەسـتدایە، هەر کاتێـک خەلـیفە مەرجێک لەو مەرجانەی تێـدا نەمـا، کە مەرجـی خیلافەتکـاریی بـوون، وەکـو نەمـانی جێمتمانەیـی (ثـقە) بە دینـدارێتییەکەی، یـان نوقسـانبوونی جەسـتەی بەشێوەیەک، کە کار لە ڕەفتاری بکات، بێگومان هەموو ڕەعییەتەکەش لە هەر دوو حـاڵەتەکەدا بـۆیە هەیە ڕا لەسـەر دانـان، یـان لادانـی دەربـبڕن، بەڵام ڕاو بۆچوونەکانیان لای (ئەهلی حەللوعەقد) کۆدەبێتەوە، کە توێژینەوەی ڕاسـتیی و چەوتیـی، یـان بەسـوودیی و بێسـوودیی بـۆ دەکەن و دیراسـەی کارپێکردنیـان دەکەن.

لەم ڕوانـگەوە کەس لە ڕەعـیەتەکە وەکـو تـاکەکەس، بـۆی نیـیە داوا لە خەلــیفە بکــات ئیســتقالەبکات و ئەرکــی ســەرۆکایەتی وەلبکــات،چونکە سەرجەمی راکان دەبێت ئەهلی حەللوعەقد بیانگرێتە خۆو هەموویان یەکبخـات، تا دەبێتە یەکدەنگیی دانان، یان لادان، ئەگەر وا نەبێت، بێگومان دەبێـتە فەوزاو گەڕەلاوژێ و کەس بەکەس نابێـت، هەر کەسـە، یـان هەر کـۆمەڵە خەڵـکەو رایەکیان دەبێت، ئەو دەڵێ: داینێن ئەم دەڵێ: لایدەن، ئەویـتر دەڵـێ: کەسـێکیتر دانێن، ئەویتر شتێکیتر دەڵێ.

نە دەگەنە ئەنجـام و نە سـام و هەیبەتـی حـاکم و حـوکمڕانیی دەمێنێـت، ئەمەش بە تەئکید سەر دەکێشێت بـۆ نـاکۆکیی و ململانـێ و چەنـد بەرەیەکـی دژبەیەک.. ئێ ئەمە ئەو ئەنجامەبوو کە ئیبنوعومەر- خوا لێیان رازی بێت- لێی دەترسا تووشی ئوممەتەکە ببێت.

بۆیە بە سەیدنا عوسمانی فەرموو: (فلا تَخْلَعْ قَميصَ اللهِ عَنْكَ، فَتكـونَ سُـنَّةً كُلَّمَا كَرِهَ قَومٌ خَليفَتَهمْ خَلَعُوهُ اوقَتَلَوهُ).

واتە: دەی سا ئەو کراسە دامەکەنە کە خوای گەورە بەبەریداکردوویت، دەنـا

دەبێتە ڕێساو ڕێباز، هەر کۆمەڵە خەڵکێک خەلیفەکەی خۆیان بەدڵنەبوو گەلەکۆمەکێی لێدەکەن، دەیهێننە خوارەوە یان دەیکوژن) .

سەیدنا عوسمانیش زۆری هەوڵدا (ئاژاوەگێڕەکان)قەناعەت پێبکات، کە هیچ هەڵەیەکی نەکردووە، تا شایانی لادانی بکات، هیچ مەرجێکی خیلافەتکاریی ئیلغانەکردۆتەوە، شەریعەتی ئیسلامییش بە بێهەبوونی هۆیەکی دیار حاکم لەکارناخات.

کۆڕا (ئیجماع)ی یاوەران لەسەر ئەوەیە: کە لەگەڵ هەبوونی سەلامەتیی دین و جەستەی خەلیفە، ناشێت لە خۆڕا لا بدرێت.

ئەوەی ئەوانیش لەسەریان کردووە بە ڕەخنە، بواری ئیجتیهادی خۆی بووەو هەوڵیداوە ئەو بۆچوونە بگرێتەبەر ،کە بە ڕاست و دروستی زانیووەو لە بەرژەوەندیی ئوممەتەکە بووە، بۆیە ئامادەنییە خیلافەت وازلێبهێنێت مادام شتێکی نەکردووە لادانی فەرز بکات[1].

خاڵێکی گرنگ ئەوەیە: کە سەیدنا عوسمان - خوالێی ڕازی بێت -و ئەو یاوەرانەی لەو کاتەدا لە مەدینە بوون، کەسێکیان لەناو ئەم شۆڕشچییانەدا نەدی، کە سیماو سیفاتی ئەهلی حەللوعەقدی تێدابێت و خاوەن بۆچوونێکی ڕاست و ڕەوا بێت، تا موناقەشەی لەگەڵدا بکرێت، کەسێک لەو ئەهلی حەللوعەقدەی ئەمیان بە خەلیفەدانا، لەگەڵ ئەو ئاژاوەگێڕانەدا نەبوون[2].

ئەوانە چەندین کەس و کۆمەڵی فیتنەچی عێراق و میسر بوون، کە لەو دوو وڵاتەشدا خاوەن دیدو ڕاو هەڵوێست نەبوون... فەرموودەکەی پێغەمبەری خواش

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو گومانەی کە ئاژاوەگێڕەکانی ئەو کاتە دژی سەیدنا عوسمان خوا لێی ڕازی بێت ورووژاندیان، بڕوانە کتێبەکەی قازی ئەبوبەکر ئیبنولعەرەبی: العواصم من القواصم ل: ٥٣و دواتریی. هەروەها: قازی عبدالجبار: المغني ب٢٠ بەشی یەکەم ل: ٣٠٥_٣٠٦.

(٢) معالم الثقافة الاسلامية ل: ٢٩١ ودواتریی.

(صلی الله علیه وسلم) بۆ سەیدنا عوسمان - خوالێی ڕازی بێت -وەسفی ئەوانە بە دووڕووو(المنافقون)یــان دادەنــێ و پێشــی فەرمــوو کە بە قســەی ئەوانە لەو بەرپرسـیێتیەی لە ئەسـتۆی دایە، نـایەتەخوارەوە، ئەگەرچـی کوشـتنی خۆشـی تێدابێت.

ئەم هۆکارانەو خەمی ئەوەی کە ئەمە دەبێتە ڕێگاو ڕێسای لادانی خەلیفەو دانانی بەدیل بۆی، تا وای لێدێت ئەم گەڕەلاوژێ و شەڕەپاڵە دێتەجێـی مەرج و ڕێساکانی خەلیفەهەڵبژاردن و ئەهلـی حەللوعەقـد _کە پیاوچاکـانی ئـوممەتن_ دەکەونە کەنـاری مـۆنجی ئـاژەوە گێـڕان و کەس گـوێ لە رایـان ناگرێـت، لەم فەوزایەشدا کەسی شیاو نادۆزرێتەوە کە ئەمانەتی بریکارێتیی خـوای گەورەی پێبسپێررێت..

لەم گەڕەلاوژێـیەدا ،نە دیـدو رای پارسـەنگ دەمێنێـت و نە کۆبـوونەوەی ئەهلی حەللوعەقد دەکرێت.. بەمەش مافی خەڵکی لە هەڵبژاردنـی دەسـەڵاتداری باڵای دەوڵەتیاندا پێشێل دەبێـت (وئینقلابـات جێگـای ڕادەربـڕین و هەڵبـژاردن دەگرێتەوە).

لە لایەکی تریشەوە فەرمایشتەکەی سـەیدنا عوسـمان بەڵگەیەکـی لەسـەر نییە کە مەبەستی ئەوە بووبێت، کە خوای گەورە بە پێی مافی خوایی کردوێتـی بە دەسـەڵاتداری بـاڵاو مـۆڵەتی پێـداوە، تـا بە نـاوی خـواوە هەمـوو ڕەفتـارو بڕیارێک دەربکات..

واشیدانەناوە کە ئەم خیلافەتە مافێکی تـایبەتی خـۆیەتی و خـوای گەورە بە ناو بۆ ئەوی تەرخانکردووە،چونکە دەیزانی کە ئەو بە رای خەڵکی بۆتە خەلیفە.

سێ ڕۆژبوو ئەهلی حەللوعەقد کۆدەبوونەوە و رای خەڵکیان وەردەگرت، کە کێ بکەنە خەلیفە، تا سەرەنجام ناوی ئەو دەرچوو و بە ڕەزامەندیی ئـوممەتەکە کرا بە خەلیفە..

ئێ ئەمە لە کوێ و ئەوە لە کـوێ بووترێـت: بە پێـی (مـافی خـوایی: الحـق

الالهی) بووه بە خەلیفە، هەر وەکو کە فیرعەون بوو بە دەسەڵاتداری میسر یان ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم دەبوون بە حاکمی بێ لەکەو هەڵەو پەڵە؟!

***ڕەو اندنەوەی گومانی دووەم:**

کە تایبەتە بە دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی شیعە دەربارەی ئیمام و ئیمامەت، واتە: پێشەوایەتی ئوممەت و کاربەدەستی باڵای دەوڵەتی ئیسلامیی.

ئەم گومانە ئیعتیمادی کردۆتە سەر ڕاو بۆچوونی پەڕیدەو نامۆ، یان توندڕۆیی لە ڕاو بۆچوونی هەڵەی خۆیدا، وەکو ئەوانەیان، کە دەڵێن: ئیمامەکانمان _کە خوای گەورە بە ناو دیاریکردوون_ لە ئاست و پلەی پێغەمبەرانی خوادان (علیهم السلام)، یان خوا هاتۆتە جەستەیانەوەوخۆشیان بوون بەخوا !

ئەمانە پێویستە لە بازنەی ئیسلام و ئیماندا حسێب نەکرێن.. مەرج نییە هەرچی موسوڵمان دەیڵێت لە ئیسلامەوە بێت (ئەسڵ لە پێناسەی ئەم تاقم و کۆمەڵ و (فرقة)انەدا ئەوەیە: کە مولحیدن، بێباوەڕن، بەڵام خۆیان لەژێر پەردەی مەزهەبەکەیاندا حەشارداوە).[1]

ئەمانە بەڕاستی ئەوانەن ،کە ئیبنوتەیمییە دەربارەیان دەفەرمووێ: (لە هەموو کافرێکیتری جولەکەو دیان و موشریکەکان خراپترن، ئەمانە سەر بەشیعەن و خۆیان بە مەزهەبگریی ئەوان نیشاندەدەن)[2].

ئەمما قالوقیلی دەستەو تاقمەکانیتر، کە دەڵێن: (ئیمامەت) ڕوکنێکی دینە، یان خوای گەورە بە دەق ناوی هەموو ئیمامەکانی دیاریکردووە، یان ئیمامی

---

(١) قازی عبدالجبار: المغني ب٢٠ بەشی یەکەم ل: ١٣.
(٢) منهاج السنة ل: ٣٣٧.

پێشوو، ئیمامی دوای خۆی دیاریکردووە، یان ئیمامەکـان مەعسـومن و دوورن لە گوناح و هەڵەو سەهوو!

هەموو ئەمانە قسەی بێبەڵگەو بێبناغەن، دەشێت بە دوو خاڵ وەڵام بدرێنەوە:

١- ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوە یەکـدەنگن، کە دانـان و لادانـی خەلیفە مافی گشـتی موسـوڵمانانە، هەر کاتێـک پێویسـتیان بە دانـانی خەلـیفە هەبـوو، ئەو کەسـە لە نـاو خۆیانـدا هەڵـدەبژێرن بـۆی، کە مەرج و سـیفاتی خەلیفایەتیی تێدا هاتبێتەدیی و خۆیشی رازیبێت و بەڵێن بدات: کە شـەریعەتی خـوای گەورە بچەسـپێنێت، هەر کـاتێکیش مەرج و سـیفەتی خەلیفـایەتیی تێدانەما، ئوممەت مافی خۆیەتی بیهێنێتە خوارەوەو یەکێکی شیاو بخاتە جێی.

خەلیفە وەکـو هەر مـرۆڤێکیترەو لە بەجێهێنـانی ئەرکەکـانی خەلیفایەتییـدا دەکەوێتە هەڵەوە، هەر وەکو کە رەفتاری ڕاست و رەوا ئەنجامدەدات.

بۆیە بەردەوام لەژێر چاودێریی ئوممەتـدا دەبێت،لەسـەر هەمـوو رەفتارێـک موحاسەبە دەکرێت و هەر تاوانێکی لـێ دەربکەوێـت، دادگاییـدەکرێت و ئەگەر تۆمەتەکەی لەسەر ساغبۆوە سزای شیاوی دەدرێت...

بە شـێوەیەکی گشـتیی، خەلـیفە وەکـو هەر تـاکێکی ئـوممەتەکەیە، مـافی گشتیی وەکو ئەوانەو هەرچی ئەحکامێک ئەوان بگرێتەوە، ئەمـیش دەگـرێتەوە ،چونکە ئەم هیچ ئیمتیازێکی تایبەتی نییە تا بۆی ببێتەپارێزبەندیی (حەصانە).

٢-سەیدنا عەلی کوڕی ئەبوطالیب - خوالێی ڕازی بێـت -کە زۆریـنەی هەرە زۆری دەستەو تاقمەکانی شیعە زێدەڕۆیی لە وەسف و مەدح و سـەنایدا دەکەن و، هەندێکیان بە خـوای دادەنـێن و هەنـدێکیتریان بە گەورەتـر لە پێغەمبەرانـی بەنوئیسرائیل و ،هەر هەمووشـیان بە ئیمامـی مەعسـووم و دیـاریکراو بە دەقـی دەیناسێنن!

ئەم خەلـیفە بەرێـزە لە وتارێکیـدا لە کـاتی جەنگـی صـففین (الصـفین)دا

دەفەرمووێ: (فَلاَ تُثْنُوا عَلَيَّ بجَميل ثَنَاء لإخْرَاجي نَفْسي إلَى اللَّه سُبْحَانَهُ وَإلَيْكُمْ منَ التَّقيَّة في حُقُوق لَمْ أَفْرُغْ منْ أَدَائهَا وَفَرَائضَ لا بُدَّ منْ إمْضَائهَا فَلاَ تُكَلِّمُوني بمَا تُكَلَّمُ به الْجَبَابرَةُ وَلاَ تَتَحَفَّظُوا منِّي بمَا يُتَحَفَّظُ به عنْدَ أَهْل الْبَادرَة وَلاَ تُخَالطُوني بالْمُصَانَعَة وَلاَ تَظُنُّوا بي اسْتثْقَالاً في حَقٍّ قيلَ لي وَلاَ الْتمَاسَ إعْظَام لنَفْسي فَإنَّهُ مَن اسْتَثْقَلَ الْحَقَّ أَنْ يُقَالَ لَهُ أَو الْعَدْلَ أَنْ يُعْرَضَ عَلَيْه كَانَ الْعَمَلُ بهمَا أَثْقَلَ عَلَيْه)[١].

واتە: ئەوەنــدەم بەشــانوباهوودا هەڵــمەدەن و بەوەســفی جــوانی وا مەدح ممەکەن، کە لە خوام یاخیی بکـات و کەمـتەرخەمم بکـات لە هێنـانەدیی بـاقی مافەکانتان، کە هێشتا ماومە تەواویان بکەم، یان ساردم بکاتەوە لە بەجێهێنـانی کۆمەڵە فەرزێک، کە هەر دەبێت بیانهێنمەدیی..

وا قسەم لەگەڵدا مەکەن، وەکو دەسـەڵاتدارانی سـتەمکار دەدوێـنرێن، هـیچ شـتێکی مـن واتـان لێنەکـات پێشـنیاری جـوانم نەخەنە بەرچـاوو زوو نەمگەنێ،ڕیابازانە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا مەکەن.

وا مەزانن ئەگەر حەقیان نیشانمدا لە وەرگرتنییـدا سسـت دەبـم ، وا مەزانـن خۆم بە گەورەتر دەگرم، هەر کەسێک خۆی لە جەنابی حەقدا بە گەورەتر بزانێت، یان دادپەروەرییەک قبوڵ نەکات، بە تەئکید کارکردن و هێنانە جێی ئەو حەق و دادپەروەرییەی لەسەرشان قورستردەکات.

هەروەها لە وتارێکی ترییـدا هەر لە سـففین (الصـفین) مرۆڤێتـی خـۆی و ئاساییەتی خۆی و حاڵی خۆی زیاتر ڕووندەکاتەوە، کەدەفەرمووێ: (فَلاَ تَكُفُّوا عَنْ مَقَالَة بحَقٍّ أَوْ مَشُورَة بعَدْل فَإنِّي لَسْتُ في نَفْسي بفَوْق أَنْ أُخْطئَ وَ لاَ آمَنُ ذَلكَ منْ فعْلي إلاَّ أَنْ يَكْفيَ اَللَّهُ منْ نَفْسي مَا هُوَ أَمْلَكُ به منِّي فَإنَّمَا أَنَا وَ أَنْتُمْ عَبيدٌ مَمْلُوكُونَ لرَبٍّ لاَ رَبَّ غَيْرُهُ يَمْلكُ منَّا مَا لاَ نَمْلكُ منْ أَنْفُسنَا)[٢].

(١) نهج البلاغة ل:٤٦٤_٤٦٥. لە وتاری ژمارە ٢١٦ دایە.

(٢) هەمان سەرچاوە ل: ٢٦٥ . وتاری ژمارە ١٠٢.

واتە: لەوە کۆڵمەدەن ،کە حەقێکم پێڕابگەیێنن، یان راوێژێکـی دادپەروەریـیم لەگەڵدا بکەن، من لە ناخی خۆمەوە دەزانم، کە ئەوە نـیم هەڵە نەکەم، لە خۆشـم دڵنیانیم، کە هەموو رەفتارێکم چاک بێت.

هیوام هەر بە خوای گەورەیە، کە نەمداتە دەست نەفسی خۆم ،چـونکە ئەو لە خۆم زیاتر دەسەڵاتی بەسەر مندا دەشکێت و، دەتوانێت ئاڕاستەم بکات.. مـن و ئێوە هەمووومان کـۆیلەو بەنـدەی ئەو خـوایەین، کە هـیچ خـوایەکیتر وەکـو ئەو نیــیە... ئەوەی ئەو لە خۆمانـدا دەسـەڵاتی بەسـەریدا دەشـکێت، ئـێمە خۆمـان دەسەڵاتمان بەسەر خۆماندا ناشکێت.

<u>*دیدی عەقائیدیی شیعە دەربارەی ئیمامەت و بانگەشەی (مافی خوایی)یان:</u>

حەقیقەت و مێژوو ئەوە دەسەلمێنن: کە دیدو تێڕوانینی شـیعە ئەهوەنەکـان _نەک تونـدڕۆ غەلیزەکانیـان_ دەربـارەی (ئـیمامەت) کتومـت وەکـو تیـۆرە ئەوروپاییەکەی (مافی خوایەتی)یە، کە وەکو باسمانکرد، ئەوروپاییەکان پێـوەی پابەندبوون[1]...

ئێمە دوای دیراسەکردن و توێژینەوەی وردەکـارانە گەیشـتووینەتە ئەوە: کە دیـدو تیرِوانینـی عەقائیـدیی شـیعە دەربـارەی ئـیمامەت (دەسـەڵاتی بـاڵای حوکمڕانیی و ئاڕاستەوانیی) پەڕیدەیەو دوورە لە گۆڕانی موسوڵمانان.

لە بەڵگەنەویسـتەکانی دیـن ئەوەیە: کە موناقەشـەی ڕاسـتیی و چەوتیـی هەمـوو دیـدو ڕاو بۆچـوونێکی غەیـری قورئـان و سـوننەت دەکرێـت و دیـدو بۆچوونی هەموو تاک و کۆمەڵێک بە تەرازووی قورئان و سوننەت دەکێشرێت، ئەگەر لەگەڵ ئەوانـدا نەهـاتەوە، رەفزدەکرێـت، بـێ ڕوانیـنە خـاوەن دیـدو بۆچوونەکەو پلە و ئاستی..

---

(١) د. محمـد ضياء الدين الريس: النظريات السياسية والاسلامية. مكتبـة دار الـتراث/ قـاهيره چـاپی شەشـەم ١٩٧٦ ل: ١٦٩_١٧٠. هەروەهـا: د. حـازم عبـدالمتعال الصـعيدي: النظريـة الاسـلامية في الدولة. ل: ١٦٤_١٦٥.

موسـوڵمانان کە موناقەشـەی هەمـوو دیـدو راو بۆچـوون و بـزاوت و هەڵوێستێکی رۆژهەڵاتناسان دەکەن و لە تیۆرەکانیان دەکۆڵنەوە لە هەر کات و شـوێن و نەوەیەکـدا بـووبن، ئەوە لە پێشـترە کەموناقەشـە دیـدو راو بۆچـوونی عەقائیدیی و فیکریی تاقم و دەستەیەک بـکەن کە خـۆ بە موسـوڵمان دەزانـن و لەسـەر ئیسـلام حسـێبن،لە کاتێکـدا کە نە موسـوڵمانن و نە لە ئیسلامییشـەوە هەموو دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی خۆیان وەرگرتووە.

موسوڵمانان بە درێژایی مێژوو، ڕا و بۆچوونی جیاوازی تاک وکۆی مەزهەب و دینی جیاوازیان کردووەو بـێ گوێـدانە پلەوپـایەی خـاوەنەکەی، یـان زۆریـی زانست و لایەنگرانی، بە پێـوەری قورئـان وسـوننەت پێواویـانە، کە لەگەڵیانـدا نەهاتبێتەوە رەفزیانکردووە.

ئەگەرچی لەو رێگایەدا تووشی جۆرەها ژان و ناسۆریش بـووبن.. ئەمە هەم لە چوارچێوەی دیدو رێی مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەت و جەمـاعەت بـووە، هەم لە موناقەشەی دین و مەزهەبی غەیری ئەواندابووە.

بۆیە دیدو بۆچوونی عەقائیدیی شیعەشـیان موناقەشـەکردووەو، لە ئەنجامـدا گەیشـتوونەتە ئەو ئەنجـامە، کە هەر هەمـوو دەسـتەو تـاقمە جیاوازەکانیـان لە قورئان وسوننەت دوورن و خاوەن دیدو رای نامۆو پەڕیدەی جوداو دوورن.

بەڵام هەموویـان لەسـەر یەک هیـواو ئامـانج رێکەوتـوون کە گەیشـتنە دەسـەڵات و حـوکمکردن و دیکتـاتۆرێتی نوانـدنە، تـا لە رێـی خۆهەڵواسـین بە(مەزهەبی ئالوبەیت)ەوە بـگەنە ئەو مەرامەی،کە هەمـوو شـتێکی لە پێنـاودا بەشیاو دەزانن.

سـەیر ئەوەیە: کە لە دوای دیراسـەکردنی دیـدو رای شـیعەکان دەربـارەی ئیمامەت و حـوکم و بەراووردکردنـی بە (تیۆرەکـانی مـافی خـوایی) ئەورووپـای سـەدەکانی ناوەڕاسـت، نەک هەر وەکـو یەکـن (لە زاهیریانـدا)، بەڵکـو لە

ناوەرۆکدا دیدو تێڕوانینی شیعە زۆر لە دیدو تێڕوانینی کڵێسـای ئەو سـەردەمە لە حەق و ماف و دادپەروەریی دوورتـرە! لە جەوهەریانـدا لێکـدوورن ،چـونکە دیدو ڕای شیعەکان مـافێکی بێسـنووریی (خوایـانە) دەداتە (ئـیمام)، کە کڵێسـا نەیداوەتە (پاپا)، یان (ئیمپراتۆر)ەکانیش!

تیۆرەکان مافی خوایی، کە ئەوروپـای چەرخە تاریکەکـانی حـوکم دەکـرد، دەیووت: یاسا لە مەلیک جودایە، پاشـا کاتێـک دێـتە سـەر حـوکم، دەبێـت بەو یاسایانەوە پابەندبێت، کە سـەرەکین و بـوون بە دەسـتوور، کە پاپـا بە پیـرۆزی ناسـاندوون، بەڵام بـۆی هەیە یاسـای ڕۆژانە دەربکـات، کە کاروبـاری خەڵکـی ڕێکدەخات (بۆ نموونە: بۆی نییە زەوی و زاری کڵێسا دابەشـبکات، بـۆی نیـیە چۆنیەتی دینداریی دیاریی بکات) بەڵام لە دیدو تێڕوانینی عەقائیـدیی شـیعەدا، (ئیمام) بە پێی ئیلهامی خوایی ئاڕاستەدەکات (کە وەکو وەحییە)!

هەندێک لە شیعەکان دەڵێن: کە ئیمام هەر بە پێی وەحیی پێغەمبەر (صـلی الله علیه وسلم) ڕەفتاردەکات، بۆیە بەو شـەریعەتەوە پابەنـددەبێت، کە ئیمامـی پێشتر لەسەری بووە.

لە ڕاستییدا ئەگەر بشڵێین: جیاوازییەکی وا لە نێوان تیۆری مافی خـوایی ئەوروپـایی و دیـدو تێڕوانینـی عەقائیـدیی شـیعەدا هەیە، هەر شـتێکی شـکڵی ساویلکەیە ،چونکە لە جەوهەری یاساداڕشتندا هەر یەکن، لە جەوهەری ویسـت و ئیرادەی ڕەهاییدا یەکن، لە هەبوونی مافی یاساداڕشتندا یەکن.

لە هەر دوولایاندا، هەر خوای گەورە دەسـەڵات و کەسـەکانی دیـاریکردووە (ئەگەرچـی لە تیـۆرە ئەوروپـاییەکەدا بە نـاو دیـاریی نەکـردوون وەکـو فیرعەونێتیەکە) هەر دوولایان دەڵێن : حاکم لەژێـر سەرپەرشـتیی و چـاودێریی خوادان، گەل لە هیچیاندا بەشداریی هەڵبژاردن و موراقەبەو موحاسەبە ناکات و مافی ڕەخنەگرتنی نییە..

ئەمە خاڵێکی جەوهەریی هاوبەشی نێوان (تیۆری مافی خـوایی) ئەوروپـا و دیدو تێروانینی عەقائیدیی شیعەیە.. کەس جگە لە پاپا بۆی نەبـوو موناقەشـەی رەفتارێکی ئیمپراتۆر بکات، چ جای رەخنەلێگرتنی.

ئەمە لە عەقیدەی شیعەدا توندترە، هیچ کەسێک بۆی نییە موناقەشەی هـیچ رەفتارێکی ئـیمام بکـات! چـونکە ئـیمام مەعسـوومە، دوورە لە گونـاح و هەڵەو سەهوو.

شەرعناسـانی شـیعە دەربـارەی فەرمـان و بڕیـاری ئیمامەکانیـان دەڵـێن: فەرمانیـان فەرمـانی خـوایەو، نەهیکردنیـان نەهیکردنـی خـوایەو ملکەچیـی و گـوێڕایەڵیی ئـیمام، ملکەچیـی و گـوێڕایەڵیی خـوای گەورەیەو گونـاحکردن بەرامبەریان گوناحکردنە بەرامبەر خوای گەورە.

ئەوی دۆستی ئیمامەکانە دۆستی خوای گەورەیەو، ئەوی دوژمنیانە دوژمنی خوای گەورەیە.. نابێت فەرمایشتیان ڕەتبکرێتەوە، ئەوی فەرمایشتیان رەتکاتەوە حـوکمی ئەوەیە: کە فەرمایشـتی پێغەمـبەری خـوای (صـلی اللـه علیـه وسـلم) رەتکـردۆتەوە، ئەوی فەرمایشـتی پێغەمـبەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) رەتکاتەوە وەکو ئەوەیە کە فەرمایشتی خوای گەورەی رەتکردبێتەوە.. دەبێت بە هەموو شێوەیەک فەرمانیان قبوڵبکرێت و جێبەجێبکرێت[1].

بەم پێناسەو وەسفە،ئایا دەتوانرێـت فەرمایشـتی ئیمامەکـان لە فەرمایشـتی خوای گەورە جیا بکرێتەوە؟!

سوودی مەعسومێتی ئیمام و پابەنـدبوونی بە خێـرو چاکەکـانەوە چیـیە، کە مادام موراقەبەو موحاسەبە ناکرێت؟!

ئەمە وەک سیستمی حوکمەکەی ئەسینای یۆنانە، کە دەیووت: حوکمی یاسـا

(١) سەرچاوەی پێشوو ل: ١٩٠_١٩١.

لەسەر هەموانەو گەل حوکم دەکات، بەڵام لە توێژینەوەدا دەردەکەوێت: کە خەڵکی مافی هەڵبژاردنی سیستمی حوکم و موراقەبەو موحاسەبەی حاکمەکانیان نەبوو... ئیتر دیموکراسییەکەی لە کوێدابوو؟

<u>*دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی شیعەو تیۆرەکەی (بوسێ Bossuet) دەربارەی حوکم:</u>

باسمان کرد :کە چۆن تیۆرەکانی مافی خوایی لە ئەوروپا باڵی بەسەر ژیانی تاک وکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەتیاندا کێشابوو، بەڵام چۆن لە سەرەتای چەرخی ڕاپەڕینەوە- بە تایبەتی لە سەدەی شازدەیەمەدا- چۆن هەرەسی هێناو داڕما، بەڵام دواتر فەیلەسووفی وەکو: (هۆبز ١٥٨٨-١٦٧٦) لە بەریتانیا ویستی بە ناوی دەسەڵاتی ڕەهایی پاشایەتییەوە بیهێنێتەوە کایە،بەڵام ئەمجارە بە ناوی گرێبەستی نێوان پاشاو گەل، کە دەبێت گەل تەنازول لە هەموو مافێکیان بکەن بۆ پاشاو دەسەڵاتی، بێئەوەی پاشا هیچ لە دەسەڵاتە بێسنوورەکەی کەم بکاتەوە..

لە فەرەنساش (بوسێ Bossuet) هەمان دیدو هەڵوێستی هەبوو، لەگەڵ ئەو جیاوازیەی، کە ئەم دەیووت: دەبێ حوکمی بێسنوور بدرێتە دەست کەسێک لە چوارچێوەی دیدو تێڕوانینی دینییدا... ئەم دەیووت: سەرچاوەی دەسەڵات خوایەو ڕەعییەت هیچ مافێکی تێدا نییەو، پێویستە لەسەریان وەکو هەر پابەندبوونێکیتری دینیی بە فەرمانی پاشا دیندارەکەوە پابەندبن[1]..

ئەم دەیووت : ئەوەی کە سنوور بۆ دەسەڵاتدار دادەنێت، یاسا دینییە سروشتییەکانەو بەس.

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. ثروت بدوي: أصول الفكر السياسي ل: ١٤٩و دواتریی.

ئەم تیۆرییە بە تەواویی لەگەڵ دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی شیعەدا دێتەوەو، تیۆری (بۆسێ) پڕاوپڕ وەکو (ئیمامەت)ی شیعەیە.

## ڕەواندنەوەی گومانی سێیەم:

گومانی هەندێک لە ڕۆژهەڵاتناسانی وەکو: (سانتیلانە)یە، کە دەڵێ: (ئیسلام، حکومەتی ڕاستەوخۆی خوایە، کە هەمیشە سەرپەرشتیارێتیی و چاودێریی گەلەکەی خۆی دەکات... دەوڵەت لە ئیسلامدا ،خوا نوێنەرێتیی دەکات.. تەنانەت کارمەندو فەرمانبەرە گشتییەکانیشی فەرمانبەری لای خوان)[1]..

مەبەستی لەم پێناسەو وەسفە ئەوەیە :کە بڵێ: سیستمی حوکمی ئیسلامیی، هەر سیستمی تیوکراسیی (حوکمی دینیی) یەکەی ئەوروپایە، کە لە چەرخە تاریکەکانی ناوەڕاستدا حوکمیدەکرد.

کە بووترێت: حکومەتی ئیسلامیی، حکومەتێکی دینییە، بێگومان ئەوە ڕاستە ،چونکە حکومەتی ئیسلامیی لە بنەماو ڕێسای سەرەکیەکانی قورئان و سوننەتە.. ئەگەر حکومەتێک لە وڵاتی موسوڵمانانداسیفەتە دینییەکەی نەما، پێناسەی حکومەتی ئیسلامییشی بەسەردا ناچەسپێت.

دەبێتە حکومەتی غەیرە ئیسلامیی و یاساو دەستوورو بڕیارەکانی، هیچ موسوڵمانێک ناچاری پابەندبوونی پێیانەوە ناکات (مەگەر بە زۆرە ملێ وەکو کە ئێستا وایە).

پێشتر وتمان: کە هەر هەموو سیستمەکانی ڕێکخستنی ژیانی تاک وکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەت، دەبێ ئیسلامیی بن.

---

(١) لە پەڕاوێزی ژمارە (٧٧)دا ئینگلیزییەکەشمان هێنایەوە.

هەموو بزاوت و هەڵوێستێکی کۆمەڵگەو دەوڵەتەکە، دەبێت لەسەر بنەما عەقائیدییەکان و زەمینە فیکرییە ئیسلامییەکە دامەزرابن.

ئەمە شتێکی تازە نییە.. ئیبنوتەیمییەی شەرعناس –رحمەالله- دەفەرمووێ: (پێویستە ئەوە بزانرێت کە حوکمڕانی خەڵکی، لە گەورەترین فەرزەکانی دینە.. تەنانەت دین بە بێ هەبوونی دەسەڵاتی حوکمڕانیی، وجودی نییە)[1].

ئیبنوخەلدون –رحمەالله- دەفەرمووێ: (حەقیقەتی خیلافەت جێگرێتی خاوەنی شەرعە (کە پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم)) بۆ پاراستنی دینەکەو رێکخستنی دنیا پێی (بە دینەکە)، خاوەن شەرع (صلی الله علیه وسلم) دوو ئەرکی هەبوو: یەکەمیان ئەرکی گەیاندن و ڕوونکردنەوەی دینەکە، بە ڕوونکردنەوەی ئەو فەرزە شەرعییدانەی لەسەر خەڵکن، کە دەبێ پێیانەوە پابەندبن.

دوومیان: بەرێوەبردنی کاروباری ژیانی دنیای خەڵکی لە ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمین و دادپەروەریی نێوانیان.

پێشتر وتمان: کە دەسەڵات و هێزداریی بۆ هێنانەدیی ئەم بەرژەوەندییانە پێویستن.. بەڵێ.. بێگومان کە بە پێی ئەحکامەکانی شەرع ئیدارەدەکرێت ڕاستترو تەواوترە ،چونکە شەرع، زیاتر رەچاوی بەرژەوندیی خەڵکی کردووە)[2].

(ئیبنوخەلدون) مەسەلەکان زیاتر ڕوون دەکاتەوە، کە دەفەرمووێ: هەبوونی یاسا لە دەوڵەتدا زەرورەتە، تا هەموو رەعییەتەکە بزانن: ماف و ئەرکیان چییەو لە کوێدا سنووریان کۆتاییدێت.. دەفەرمووێ: ( ئەگەر ئەم یاسایانەی بەسەر خەڵکییدا دەچەسپێنرێت، لە لایەن هزرەوانانی بیرمەندو گەورەپیاوانی دەوڵەتەوە

(١) السیاسة الشرعیة ل: ١٨٤.

(٢) مقدمة ابن خلدون ل: ١٩٥.

داڕێژرابێت، ئەوە سیاسەتێکی ژیرانەیە، ئەگەر ئەو ئەحکامانەی شەرع بوون، کە خوای گەورە فەرزی کردوون و داوای جێبەجێکردنی کردوون، ئەوە سیاسەتێکی دینیانەیە، کە بۆ دنیاو قیامەتی خەڵکەکە بەسوودە،چونکە نابێت مەبەستی خەڵکی، هەر دنیایان بێت ،چونکە ژیان وچێژی دنیا، هەر هەواوهەوەس و گەمەو خۆخافڵاندنەو کۆتاییەکەی بە مردن کۆتایی دێت.

خوای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا﴾ المؤمنون: ١١٥ .

واتە: چما وا دەزانن هەر وا بە هەوانتە خەلقمانکردوون؟

خوای گەورە مەبەستێتی کە خەڵکی بە دینەکەیەوە پابەندبن، کە دەیانگەێنێتە بەختیاریی و ئاسوودەیی قیامەتیان.

شەرعیش کە پەرستن و مامەڵەکاریی هێناوە بۆیان، مەبەستی ئەوە بووە: کە دیندارانە رەفتار لەگەڵ یەکتریی بکەن... تەنانەت لە دەسەڵاتدارێتیشدا _کە سروشتیەو دەبێت لە هەموو کۆڕو کۆمەڵێکی بەشەرییدا هەبێت_ دەبێت بە پێی مەنهەجی دینەکە بێت، تا هەموو لایەک لەژێر سەرپەرشتی شەرعدا بن)... پاشان دەفەرمووێ: (ئەم دەسەڵاتدارێتییە مافی پێغەمبەرانە (علیهم السلام) ئەوان دەیگرنەدەست، دوای ئەوان ئەو خەلیفانە دەیگرنەدەست، کە دێنە جێی ئەوان)[1].

دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە دەردەکەوێت: کە دەوڵەتی ئیسلامیی و حکومەتی ئیسلامیی دەوڵەتێکی دینیی و حکومەتێکی دینییە، بەڵام بەو پێناسەو واتایە دینی نییە، کە رۆژئاوا پێیدەڵێت: (تیوکراسیی).

بەو شێوەیەش دینیی نییە، کە رۆژهەڵاتناسەکان دەیانەوێت پێناسەو وەسفی

(١) مقدمة ابن خلدون ل: ١٧٠.

بکەن، کە گوایە: فەرمانبەرانی دەوڵەت هەموو کارمەندانی خوای گەورەن!

چونکە رۆژئاواییەکان بە گشتیی و رۆژهەڵاتناسەکانیان بەتایبەتیی، وان لەژێر دیدو پێناسەی چەمکی فیکریی و فەلسەفیی و مێژوویی خۆیاندا، کە هەمووی لە ململانێی سەختی کڵێساو ئیمپراتۆرەکانەوە هاتووە (هەموو ئەوەی ئەوان لە زەینیاندا، لە ئەقڵی ناوەوەیاندا هەیە) وا لە ژێر کاریگەریی ئەو ململانێ و ناکۆکییەدا، کە شتی وا لە ناو موسوڵمانان و مێژوویاندا ڕووی نەداوە.

ئیسلام کیانێکی سەربەخۆی جودایە، دیدو تێڕوانینی گشتگیرانەی ژیانبینیی وجیهانبینیی لە هی کەس ناچێت، لە تیۆری هیچ دین و دیدێکی فەلسەفیی و فیکریی ناچێت، تیکەڵ بە هیچشیان نابێت و ناکرێت تێکەڵ بکرێن، ئەگەرچی هەندێک لایەنی بەشەرییان هەبێت، کە هاوبەش بێت، یان لێک بچن.

زۆر بەداخەوە هەندێک لێکۆڵەرەوەی سیستمی حوکمی ئیسلامیی ،لە کاتی پێناسەو پۆلێنکردنی سروشتی سیستمی سیاسیی ئیسلامییدا دەشڵەژێن و نازانن داخۆ سیستمێکی دینییە، یان غەیرە دینیی؟

ئایا وەکو سیستمی حوکمە دینییەکەی ئەوروپایە؟

یان سیستمی حوکمی دینیی شوێنانیتر؟

ئینجا لە هەموو لایەکەوە هەوڵدەدەن سیماو سیفەتی دینێتیی لە سیستمی حوکمی ئیسلامیی بکەنەوە! وەکو ئەوەی دینداریێتیی سیستمی حوکم پەڵەو نوقسانی بێت، یان تاوان و تۆمەت بێت! ئەمە لە واقیعدا، ترس و وەهمێکە لە جێی خۆیدا نییەو ئەو کەسانە، ئەگەر موسوڵمانن پێویستە خۆ لەو دڵەڕاوکێ و شڵەژان و لێکچوونە قوتاربکەن، تا دیدو تێڕوانینی فەلسەفیی مرۆیی تێکەڵ بەبنەماو رێسا عەقائیدییەکانی ئیسلام نەکەن.

ئیسلام دینە، دیدو ڕێ و بەرنامەو ڕێبازە، سیستمی حوکم و بەڕێوەبردنی هەموو لایەنێکی ژیانی تاک وکۆی کۆمەڵگەو دەوڵەتە، ئاڕاستەوانی مرۆڤە، تا لە ژیانی دنیاو قیامەتیاندا سەرکەوتوو سەرفرازبن..

ئیسلام لە واقیعی ژیانی کۆمەڵگەیەکی بەشەریی ئیسلامییدا، دەوڵەتی ئیسلامییانەی خۆی بە سیستمی حوکمی خۆی دادەمەزرێنێت و، ئوممەتەکەی بەرەو بریکارێتیی خوای گەورە لەسەر زەمینیدا ئاڕاستەدەکات.

بەوەی کە خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتی مروڤیان بۆ دەسەلمێنێت و، بۆ دابینکردنی دادی کۆمەڵایەتیش شەریعەتی خوایان لەناودا دەچەسپێنێت.

*شەرعناسانی سەردەم،هەڵوێستی ئیسلام لە تیۆری مافی خوایی رادەگەێنن:

ئیمام محمد عەبدە –رحمەالله- دەفەرمووێ: (١خەلیفە لای موسوڵمانان مەعسووم نییەو وەحیشی بۆ نایەت، بۆشی نییە بڵێ: هەر من قورئان و سوننەت لێکدەدەمەوە، ملکەچی بۆ دەنوێنرێت مادام لەسەر رێی  قورئان و سوننەت بێت.

موسوڵمانان لە (بورجی موراقەبە)دان بۆی، ئەگەر لە مەنهەجی قورئان و سوننەت لابدات شۆڕشی لەدژ بەرپادەکەن.. سەرەتا بە ئامۆژگاریی و بیرخستنەوەو عوزربۆهێنانەوە دەبێت، بەڵام ئەگەر حوکمی قورئان و سوننەتی لە رەفتارو بڕیارییدا لادابوو، ئەوە حەتمەن دەبێ لای بدەن و یەکێکیتری بخەنەجێ.

خەلیفە وەکو پاشاکانی رۆژئاوا نییە، دەسەڵاتیشی ئەوە نییە کە ئەوان لەسەری دەڕۆیشتن.

پاشا لای ئەوان دەسەڵاتی رەهای هەبوو، گوایە: هەر خۆی شەریعەتی خوای دەچەسپاندو، هەر ئەو مافی یاساو رێسا داڕشتنی هەبوو، ئەوەش لەسەر

خەڵکەکە فەرزبوو، کە دەبێ گوێڕایەڵیی بکەن و فەرمان و بڕیارەکانی جێبەجێ بکەن.. ئیتر بێ ئیمانداریی و بێ بەیعەت و بێ هەقی دادپەروەریی)[1].

شێخ عبدالوهاب خەللافیش -رحمەاللە - دەفەرمووێ: (دەسەڵاتدارێتی خەلیفە _بە شێوەیەکی گشتی و گشتگیریی دینییانە_ بریتیی نییە لە دەسەڵاتدارێک کە پەیوەندیی بە خوای گەورەوە هەبێت، یان دەسەڵاتی حوکمڕانێتییەکەی لە هێزێکی نادیار (غەیب)ییەوە وەربگرێت.

نا ،خەلیفەی موسوڵمانان یەکێکە لە خۆیان، متمانەیان پێکردووە کە دەتوانێت دینی خوایان لەناودا بچەسپێنێت و ژیانی دنیایان _بە دینەکە_ ڕێکبخات، لەسەر ئەمە بەیعەتیان داوەتێ و ویستوویانە ئەو بەرژەوەندییەکان بهێنێتەدیی.

لەبەرامبەردا ئەمیش مافی گوێڕایەڵیی و ملکەچیی بەسەر موسوڵمانانەوە هەیە، دەسەڵاتدارێتی خەلیفە لەم بەیعەت و متمانەیەی موسوڵمانانەوە هاتووە، کە پێیانداوە)[2].

-شێخ ئیمام (مەحمود شەلتوت) دەفەرمووێ: (هەروەها شەرعناسان لەسەر ئەوە ڕاکۆن کە خەلیفەی موسوڵمانان و سەرۆکی دەوڵەتەکەیانو هەر کەسێکی ئاسایی ناوخۆیانەو، نە هیچ ئیمتمیازێکی زیادەی هەیەو نە هیچ شتێکی لە هی ئەوان زیاترە، مەگەر ئەوەی کە بۆتە جێگریان لە هەڵگرتنی بەرپرسێتیە گەورەکەدا)[3].

- (سەیید ئەمیر عەلی) دەفەرمووێ: (ئیسلامیی محمد (صلی اللە علیە وسلم) ئیعتیراف بە کەهنوتیی دەسەڵاتی باڵای پیاوانی کڵێسا ناکات، کە لە ئیسلامدا هەبێت.. لە ئیسلامدا چینی پیاوی دینیی نییەو، کەس بۆی نییە

---

(١) الاسلام والنصرانية ل: ٦٣.

(٢) السياسة الشرعية چاپی دار الأنصار _ مصر ١٣٩٧ک/١٩٧٧ز ل:٦٠.

(٣) من توجيهات الإسلام چاپی دارالقلم. قاهیرە ل: ٥٦٤.

زانستە رۆحییەكان بۆخۆی قۆرخ بكات و بڵێ: هەر من دەیزانم، یان هەر من بۆم هەیە مانایان بكەم...

ئیسلام پیرۆزكردنی خەڵكی تێدا نییە، كە موبارەك بن، یان پیاوی خوایی بن و،ببنە واسیتەی نێوان خوای گەورەو عەبدەكانی.

لە ئیسلامدا هەمـوو كەسـێك بـۆی هەیە ڕاسـتەوخۆ داوا لە خـوای گەورە بكات و لێـی بپـاڕێتەوە، بێـئەوەی كەسـێك لە نێـوان خـۆی و خـوای گەورەدا هەبێت، تا دوعاو تۆبەكەی بگەیێنێتو هەموو موسوڵمانێك خۆی كاهینی خۆیەتیو لە دینی محمـددا (صلی الله علیه وسلم) كەس لە خوای گەورە وا نزیك نییە، تا ببێت بە ئاڵقەی پەیوەستی نێوان خوای گەورەو خەڵكی)[1].

<u>ڕەو اندنەوەی گومانی چوارەم:</u>

ئەمـــیش ئەو گومـــانەیە، كە لە (١٩٢٥)دا (شـــێخ عەلـــی عبـــدالرزاق) وروژاندیی، كە دەڵێ: (ئەوەی كە خەلیفەی موسوڵمانان دەسەڵاتی خۆی لە خوای گەورە وەردەگرێت لەناو موسوڵماناندا بڵاوە)، بەرپەرچدانەوەی ئەم گومانەی ئەم لەدوو لایەنەوەیە:

یەكێكیان: ڕەتكردنەوەی بەڵگە لاوازەكانی ئەوە.

دووەمیان: بەڵگەهێنانەوەیە لەسەر پێچەوانەی دیدو بۆچوونەكەی ئەو.

وا دەزانم لەم باسەدا بەڵگەی تەواومان لەسەر ئەوە هێنـایەوە كە شـتی وا لە ئیســلامدا نیــیەو خەلـیفەی موســوڵمانان هەر یەكـێكە وەكـو هەر یەكێـك لە ڕەعـیەتەكەی و هـیچ ئیمتیـازاتێكی زیـادەی _جـگە لە بەرپرسـێتی كـارەكەی خۆی_ نییە... ئەوەمان زۆر باسكرد.

(١) روح الإسلام ل: ١٩٣.

لایەنی یەکەمیش کە بریتیە لە: پوچەڵکردنەوەی بەڵگەکانی، کەسانیتر زۆر هەبوون کە لە لایەنی زانستیی و ئەکادیمییەوە بەرپەرچیانداوەتەوە،بە تایبەتی دکتۆر (محمد ضیاءالدین) کە دەڵێ: (راو بۆچوونەکەی شێخ عەلی عبدالرزاق هیچ بەڵگەیەکی نییە، نەک هەر زۆر دوورە لە ڕاستیەوە، بەڵکو هەر بوختان و درۆهەڵبەستنە بەناوی موسوڵمانانەوە.

هیچ زانایەک، هیچ شەرعناسی هیچ مەزهەبێکی ئەهلی ئیسلام شتی وایان نەوتووە. ئێمە هەموو بەڵگەی دیدو راو بۆچوونی موسوڵمانان لە مەزهەبەکانیانەوە وەردەگرین کە لە شەرعناسانەوە هاتووە، یان لە زانایانی علم الکلام (عەقیدە)ەوە، نەک لە شیعرو پەخشان و پێشەکی ئینشائیی کتێب و دەستەواژەی مەجازیی واتایی، یان لە وتارێکی خەلیفەیەکەوە)[1].

(١) الاسلام والخلافة في العصر الحديث ل: ١٨٧_١٩٠. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی رەتکردنەوەو رەواندنەوەی ئەم گومانە بڕوانە:

_ د. عبدالحميد متولي: مبادىء نظام الحكم في الاسلام. دارالمعارف/ مصر_ چاپی ١٩٦٦ ل: ٥٧٥ و دواتریی.

_ د، حازم عبدالمتعال الصعيدي: النظرية الاسلامية في الدولة ل: ١٥٢ و دواتریی.

**بڕگەی چوارەم:**
**تیۆری مەودودی دەربارەی حاکمێتیی خوای گەورەو بەرگریی لێی:**

**خاڵی یەکەم: کورتەی تیۆرییەکەی:**

ئاشکرایە کە مامۆستا (ئەبولئەعلای مەودودی) تیۆرێکی تایبەتی خۆی دەربارەی حاکمێتیی و سەروەرێتیی (دەسەڵاتی هەرە باڵای وڵات) هەیە، کە بەزاراوەی (حاکمێتیی Sovereignty) ناوی دەبات.

کورتەی ئەم تیۆرییە ئەوەیە: کە حاکمێتیی ماف و موڵکی خوای گەورەیەو بەس، ئەو بە تەنها مافی یاساو ڕێساداڕشتن (حق التشریع)ی هەیە، وەک دەفەرمووێ: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝٤٠﴾ یوسف: ٤٠

واتە: حاکمێتیی تەنها بۆ خوایەو مافی ئەوە، ئەو فەرمانیداوە: کە جگە لەو، هیچیتر نەپەرسترێت، ئەوەشە دینی ڕاست و دروست و ڕەوا.. ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ﴾ آل عمران: ١٥٤ .

واتە: دەڵێن :ئایا ئێمە کاریگەرییمان لە سەرکەوتن و بەزینی جەنگدا هەیە؟ پێیان بفەرموو: هەموو ڕووداوێک بە پێی قەدەری خوای گەورەیە. (واتە لە: زانست و ویست و تواناو دانایی ئەوەوەیە).

کەوابوو: هیچ کەسێک کاریگەریی لەسەر هیچ ڕووداوێک _بەویستی خۆی_ نییە، پێغەمبەری خواش (صلى الله علیه وسلم) موکەللەفبوو،کە ڕابگەیێنێت کە: ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾ الأنعام: ٥٠ .

واتە: من خۆشم هەر شوێن ئەوە دەکەوم، کە بە وەحی بۆم دێت، بە پێی ئەو ڕەفتاردەکەم.

کەملکەچیی وگـوێڕایەڵیی پێغەمـبەری خـواش (صـلى اللـه علیـه وسـلم) لەسەر موسوڵمانان فەرزبووە، هەر لەبەر ئەوەیە، کە فەرمان و بەرهەڵستییەکانی هەر لە خوای گەورەوە وەرگرتوون.

ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت: کە هیچ کەسێک هیچ پشکێکی لە حاکمێتییدا نییە ،چـونکە حـاکمی حەقیقـی خـوای گەورەیە، نەک عەبـدەکانی، هەر عەبـدێکی ڕۆڵێکی لە حوکمدا هەبێت، ئەوە ڕاپەڕاندنی حاکمێتیی خوای گەورەیە..

دەوڵەتی ئیسلامیی، کە دادەمەزرێت ،بە پێی شەریعەتی خوا دادەمەزرێـت و بەس، لەسەر هیچ دیدو ڕا و یاساو دەستورێکی تر نادامەزرێت.

لەمەوە دەزانین: کە حکـومەتی ئیسـلامیی لەسـەر سیسـتمی دیموکراسـیی ناڕەوات، کە مافەکانی حاکمێتیی دەداتە دەست گەل، تا بە پێی دیـدو بۆچـوون و بەرژەوەندیی مرۆڤەکان دەستوورو یاسـا دابڕێژرێـت و ڕاپەڕێنرێـت و داوەریـی پێبکرێت.

بەم ماناو سیفەتەش دیموکراسیی، هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە، نە ئەو لەمەو نە ئەم لەوە، بۆیە جائیزیش نییە بووترێت: ئیسلام دیموکراسییە!

لەو نزیکتر ،ئەگەر پێی بوەترێت:حکومەتی تیۆکراسییە (theoctacy)، بەڵام ئەمیش لە زۆر لایەنیەوە لە تیوکراسی جیاوازە... تیۆکراسی ئەوروپا بریتی بوو لە:حوکمی چینێـک سـەدەنە (پیـاوانی دینـی)ی تـایبەت، کە بە پێـی دیـدو راو بەرژەوندیی خۆیان یاسایان بۆ خەڵکی دادەڕشـت و، خۆیـان لێـدەکردن بە خـواو خوایەتییەکەیان بەو شـێوەیە بەسـەردا فەرزدەکـردن و، خۆیـان دەخسـتە قەڵای (یاسـای خـوایی) یەوە، کە هەر یاسـای حەزو دیـدو بەرژەوەنـدیی خۆیـانبوو، بە ناوی خواوە دایاندەڕشت و دەیانچەسپاند!

تیۆکراسـی ئیسـلامیی وا نەبـووەو واشـنییە، حـوکمی دینیـی موسـوڵمانان ئەوەیە: کە بە پێی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صـلى اللـه علیـه وسـلم)

حکومەتی خۆیانیان دادەمەزراند، کە دەشێت پێی بووترێت: (ثیۆ_دیموکراسیی theo - Democracy)، یان حکومەتی خواویستی دیموکراسیی،چونکە (موسوڵمانان مافی ئەوەیان تێیدا هەیە کە حاکمێک هەڵبژێرن بەو مەرجەی بە قورئان و سوننەتەوە پابەندبێت، حکومەتەکەش _کە بۆ راپەڕاندنی ئەحکامی قورئان و سوننەتە_ هەر لە لایەن خەڵکەکەوە دەشێت هەڵبژێررێت، لابردنیشی هەر بە رای خەڵکەکە دەبێت.

ئەمە هەموو بڕیارو بوارێک دەگرێتەوە کە شەرع دەقێکی ئاشکراو راشکاوی دەربارەی نەفەرمووە، ئەحکامەکانی شەریعەتیش (دەستورو یاسای دەوڵەتی ئیسلامیی) لە لایەن ئەو موسوڵمانانەوە دەبێت کە گەیشتوونەتە ئاست و پلەی ئیجتیهادکردن.

ئەم تیۆرەی حاکمێتیی وا دەبینین، کە کامڵ نایاتە بەرچاو ئەگەر تیۆری بریکارێتیی مرۆڤ لەسەر زەمینیشی لەگەڵدا نەخوێندرێت.

ئیمامی مەودودی ئەم تیۆرەی بریکاریشی زۆر بەتەفسیل باسکردووەو سەلماندویەتی: کە چۆن خوای گەورە مرۆڤی تەکلیفکردووە کە لە جیاتی خوای گەورە، ئەم بریکارێتیە لەسەر زەمیندا بهێنێتەدیی.

مامۆستا مەودودی ئەوە بەتەفسیل باسدەکات: کە کاربەدەستان لە سیستمی حوکمی ئیسلامییدا، بریکاریی حەقیقی خوای گەورەن ،چونکە یاسای خوایی لەسەر زەمیندا ڕادەپەڕێنن: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ النور: ٥٥ .

واتە: خوای گەورە بەڵێنی بەو کەسانەتان داوە، کە باوەڕیانهێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، کە دەیانکاتە بریکاریی دەسەڵاتداری خۆی لەسەرزەمیندا، هەر وەکو کە ئیماندارانی پێش ئەمانیشی کردە دەسەڵاتداری خاوەن هێز.

ئەمە دووخاڵ لەتیۆری دەوڵەتی ئیسـلامییدا ڕوونـدەکاتەوە، کە زۆر زۆر گرنگ و کاریگەرن:

یەکەمیان: ئیسلام زاراوەی خیلافەت (Vicegerency) لە جیـاتی حـاکمێتیی (Sovwreignty) بەکاردەهێنێـت،چونکە حـاکمێتیی مـاف و سـیفەتی خـوای گەورەیە، بەڵام دەشـێت ببێـتە مـافی ئەو کەسـەش کە لەسـەر زەمینـدا بە پێـی دەسـتووری خـوایی حـوکمڕانیی دەکـات، بەم سـیفەتە خەلیفـایەتییە (Vicegerency)، دەسـەڵاتداری بـاڵای دەوڵەتـی لەدەسـتدایەو بەو شـێوەیە رەفتاردەکـات، کە خـوای گەورە ئەرکـی خەلیفـایەتی (بریکـاریی) خـۆیی لەسەرزەمین پێسپاردووە.

دووەمیان: خوای گەورە بەڵێنی بە هەموو موسوڵمانە سەرڕاستەکان داوە، کە بریکـارێتیی خۆیـان لەسـەر زەمـین پێدەسـپێرێت. ئەمە (بریکـارێتیی گشـتی / Popular Vicegerency) یە، تاکێک یان خانەوادەیەک، یان چینێک ناتوانێت بۆ خۆی زەوتبکات،چونکە هەموو موسوڵمانێک (خلیفةالله)یە[1].

واتە: لە جیـاتی خـوای گەورە لەسـەر زەمینـدا رۆڵـی بـانگەوازی خـوایی (خـوایەتی خـوای گەورەو عەبـدێتی مـرۆڤ ) و چەسـپاندنی دادپەروەریـی (بە چەسپاندنی حوکمی شەرع) لە نێوان خەڵکدا دەبینێت).

پێناسـەو سـیفەتی خیلافەتـی ئیسـلامییش ڕۆشـنتر باسـدەکات، کە دەفەرمووێ: (بە هەڵە تێنەگەن وا بزانن بریکاریی و لەجیاتی (خیلافەت) بریتیە لە پاپـایەتیی، یـان سـێبەرێتی خـوای گەورە (ظـل الـله فـی الارض)، یـان

(١) بڕوانە: نظرية الاسلام السياسـية. دارالفكـر _ بيـروت و قـاهيرە چـاپی ١٣٨٨ک/١٩٦٨ز ل: ٢٦و دواتریی. هەروەها:

_ الحكومة الاسلامية بەعەرەبیكردنی: احمد ادريس چاپی المختار الاسـلامي لە قـاهیرە ١٩٧٦ ل: ٦٤و دواتریی.

دەستکەوتنی ئەو ماف و دەسەڵاتانەی (پاشاخوا)کان هەیانبوو..،چونکە قورئان پێناسەی بنبڕیی خۆیی بۆ خیلافەت کردووە، کە مافی هەموو ئەو کەسانەیە کە حاکمێتیی خوای گەورەیان قبوڵکردووەو باوەڕیان بە سەروەرێتیی و دەسەڵاتی باڵای یاسای خوای گەورە هێناوە، کە لە ڕێی وەحییەوە لە خوای گەورەوە (بۆ نێرراوان و پێغەمبەرانی خوا) هاتووە)[١].

مەبەست ئەوەیە: کە حکومەتی ئیسلامیی هەر دەبێت بە رای جەماوەرێک بێت، بە پێی راوێژی ئەوانە، ئەوانیش کارە (چارەنووسسازو گرنگ و گەورە)کان ئەنجامدەدەن..

هەر کەسێک متمانەی بە توانایی و لێوەشاوەیی لە جەماوەرەکەوە دەستکەوت، دەبێتە جێگری هەموویان لە بە جێهێنانی ئەرکەکانی خیلافەتدا.

هەر کەسێکیش لەسەردەسەڵات بوو، بەڵام متمانەی جەماوەرەکەی لەدەستدا، دەبێ بێتەخوارەوەو پلەی خیلافەت زەوت نەکات.

ئەم سیستمە جەماوەرییە ئیسلامییە، لە سیستمی کۆماری رۆژئاوایی جودایە، کە ئەمڕۆ لە رۆژئاوادا کاری پێدەکرێت، سیستمەکانی سیاسەت و حوکم لە رۆژئاوا، لەسەر (حاکمێتیی گەل) دامەزراون.

سیستمی حوکمی ئیسلامیی لەسەر (خیلافەتی گەل)دا دەمەزرێت[٢]..

واتە: هەڵبژاردنی خەلیفە لە لایەن ئوممەتەوە، تا خەلیفەو رەعییەتەکە پێکەوە ئەرکی بریکارێتیی خوای گەورە بەرێکوپێکی لەسەر زەمیندا بهێننەدیی).

---

(١) بڕوانە: ئەبولئەعلای مەودوودیی: _تدوين الدستور الاسلامي دارالفكر. بيروت و قاهيره ل: ٢٧. _ الحكومة الاسلامية ل: ٧٨. _ منهاج الانقلاب الاسلامي دارالفكر. بيروت و قاهيره ل: ٢٨_٢٩.

(٢) المودودي: نظام الحياة في الاسلام دارالفكر. بيروت و قاهيره ل: ١٥٨ و دواتریی.

**خاڵی دووەم: رەخنە لە تیۆرییەکەی مەودودی و وەڵامی:**

ئەمە تیۆری مامۆستا (ئەبولئەعلای مەودودی) بوو دەربارەی سەروەریّتی دەسەڵات، کە پێیان چاکە هەر وا ناوی بهێنن، وەکو خۆی ناوی لێناوە: (حاکمێتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا).

وەکو دەیبینت، تیۆرییەکە کامڵەو کەلێنێکی تێدانییە،ئەگەرچی هەندێک رەخنەیان ئاراستەکردووە[1].

لە کاتێکدا کە ئەو باسی لە ئەسڵی پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیی کردووە،هەروەها زەمینە عەقائیدییەکەی دەسەڵاتی سیاسیی ئیسلامیی و وەسفێکی تیۆرییە دیینەکەی (تیۆکراسیی) ئەوروپاشی خستۆتە نێوانیەوە.

ئەو رەخنانەی لە تیۆرەکەی مامۆستا مەودودی گیراون، زیاتر رواڵەتیین وەک لەوەی جەوهەریی بن.

گرنگترین رەخنەی ئەوانە لێی، ئەمانەن:

١- (مەودودی) وشەی حاکمێتیی بەرامبەر وشەی سەروەریّتیی دەسەڵات (Sovwreignty) داناوە.

٢- (مەودودی) جیاوازی ناخاتە نێوان بنەماو رێسای دەسەڵات لە دەوڵەتە ئیسلامییەکەی یەکەمجاردا، کە لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتەکایەوە، لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی سەردەمەکانی دوایی... پاشان دەکەوێتە باسی جیاوازیی نێوان ئەو دوو جۆر دەوڵەتە ئیسلامییە.

٣-ئەو ئایەتانەی ئەو بۆ شەرعاندنی (حاکمێتی) هێناونییەوە، ناشێن بکرێتە

---

(١) د. حازم عبدالمتعال الصعيدي: النظرية الاسلامية في الدولة ل: ١٥٨ و دواتریی.

بەڵگە لەسەر ئەوە کە سەروەرێتی دەسەڵات لە حکومەتی ئیسلامییدا هی خوایەو بەس.

٤- تیۆرییەکەی (مەودودی) شتێکی تازە نییە. پێشتر لە ئەوروپا لە چاخەکانی ناوەڕاستدا هەندێک لە گەورە پیاوانی ناوداری کڵێسای مەسیحێتی وتوویانە، وەکو: (سانە تۆماس) و(بارمان) و (سوارێز).

٥- ئیسلام لە هەموو لایەنێکەوە جیاوازە لە (تیۆرەکانی مافی خوایی لاوەکی ناڕاستەوخۆ) یان (تیۆکراسیی کۆماریی) یان (حکومەتی خواویستیی جەماوەریی) وەکو مامۆستا مەودودی ناویلێناوە.

پاشان ڕەخنەیەکیش ئاڕاستەی زانایان و شەرعناسانی ئیسلام دەکات، لەوانەی کە ئەو تیۆرییەی (مەودودی)یان پێ ڕاست و پەسەندە،کەدەڵێ: (حکومەتی ئیسلامیی سیاو سیفەتی دینیی هەیە) ،چونکە ئەمە (بە لای دکتۆر حازم عبدالمتعاله) وەلە دیدی ڕۆژئاوادا دەبێتە جێ ڕەخنە! جگە لەوەی لە دیدو رای زانایان و یاساناسانی سەردەمدا جێی نابێتەوەو دوژمنانی ئیسلام دەتوانن بیکەنە کاریگەرترین چەک و دژی ئیسلام خۆی بەکاری بهێننەوە[1].

## وەڵامی ئەم ڕەخنانە:

لە ڕاستییدا ئەم ڕەخنانە وەکو وتمان، هەر رواڵەتیین، خاڵێکی جەوهەرییان تێدا نییە، کە ڕەخنەیەکی زانستیانەی لە تیۆریەکەی مامۆستا (مەودودی) گرتبێت، کە لە کامڵێتیی و هەیبەتی دیدو تێڕوانینەکەی ئەو کەمبکاتەوە،چونکە بەڕاستی تیۆرییەکەی (مەودودی) لە هەموو لایەکەوە کۆشکەو تەواوە.

بۆیە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر فیکری ئیسلامیی سەردەم هەبووە،بە لای ئێمەوە ڕەخنەکان زیاتر لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە، کە ڕەخنەگر بە تەواوی

(١) تەفسیلاتی ئەم ڕەخنانە وا لە سەرچاوەی پێشوودا ل: ١٥٨ و دواتریی.

له تیۆرییه‌كه‌ی (مه‌ودودی)دا قاڵنه‌بۆته‌وه‌و زۆر سه‌تحیانه روانیوێتی بۆی، كه ده‌شێت یان له یه‌ك دوو كتێبی (مه‌ودودی)یه‌وه بۆچوونی ره‌خنه‌گرانه‌ی بۆ دروستبوو‌بێت، یان لاوه‌كیی و ناڕاسته‌وخۆ له كه‌سێكیتریه‌وه وه‌رگرتبێت،چونكه پێیان وایه ده‌بوو زیاتر له بواری سه‌روه‌رێتیی بالاو ده‌سه‌لاتی سیاسیی دروستبوونی ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی بكۆڵیایه‌ته‌وه‌و، به دواداچوونی گشتگیرتری بكردایه.

خاڵیكی تریش زه‌روییه ئاماژه‌ی پێبده‌ین: ره‌خنه‌گر كاتێك ره‌خنه‌كانی ئاراسته‌ی تیۆره‌ییه‌كه‌ی مامۆستا مه‌ودودی كردووه، به‌داخه‌وه تیۆرییه‌كه‌ی زۆر به كورت وپچڕیی هێناوه.

ده‌بینیت له هه‌ندێ جێدا (۳-۵) دێری لێك جیاوازی هێناوه‌و وای نیشانداوه كه ئه‌وه دیدو تێروانینی تیۆرییه‌كه‌ی (مه‌ودودی)یه! كه واشنییه.

ده‌بوایه تیۆرییه‌كه‌ی به هه‌موو روكنه‌كانیه‌وه بهێنایه‌و ئاماژه‌ی به كتێبه‌كانی( مه‌ودودی) بكرادیه، تا سه‌ره‌تا خوێنه‌رانی له خودی تیۆره‌یه‌كه بگه‌یشتنایه... به‌هه‌ر حاڵ واینه‌كردووه‌و ئه‌و ره‌خنانه‌ی گرتووه، كه ئێمه لێره‌دا وه‌لامی ره‌خنه‌كانی ده‌ده‌ینه‌وه:

١-كه مامۆستا (مه‌ودودی) زاراوه‌ی (حاكمێتیی) به‌رامبه‌ر (سه‌روه‌رێتیی) به‌كارهێناوه، بۆ نزیككردنه‌وه مه‌به‌سته‌كه‌ی بووه،چونكه سه‌روه‌رێتیی له فه‌رهه‌نگی ده‌ستووریی و یاساناسییدا زانراوه‌و دیاره، به‌لام حاكمێتییه‌كه به‌شێوه‌یه‌كی زۆر لێڵ و كزو تێكه‌ڵ نیشاندراوه.

هه‌ندێكیش هه‌ر نكوولی له بوونی كردووه، یان هه‌ر وه‌كو وتمان: خۆی ماندوونه‌كردووه‌و وتوویێتی: بریتییه له تیۆكراسیی ئیسلامییانه! ده‌نا له ڕاستیدا مامۆستا مه‌ودودی، هه‌موو توێژه‌ره‌وه‌یه‌كی موسوڵمان ده‌زانێت، كه حاكمێتیی زۆر له سه‌روه‌رێتیی یاسا گشتگیرتره.

حاکمێتیی زۆر بواری زیاتر لەوە دەگرێتەوە کە سەروەرێتیی دەیگرێتەوە.

سەروەرێتیی یاسا لە دەستووردا یەعنی: ئەو دەسەڵاتە باڵایەی لە وڵاتێکدا هەیە، کە هیچ دەسەڵاتێکیتر لە سەروو ئەوەوە نییە،دەسەڵاتیشی بەرفراوانەو سنووری نییە.

ئێ زاراوەی (حاکمێتیی) لەمە زیاترە،مەودودی کە دەڵێ: حاکمێتیی ماف و سیفەتی خوای گەورەیە، واتە: لەو سەروەرێتییە یاساییە باڵاترە ،کە پاشایەک، یان ئیمپراتۆرێک هەیبووە،چونکە حاکمێتیی یەعنی:

١-بڕیاری خاوەن حاکمێتییەکە، یاسایەو دەبێ جێبەجێبکرێت.

٢-خاوەن حاکمێتییەکە دەسەڵاتی رەهاو بێسنووری هەیە.

٣-دەسەڵاتی بەسەر تاک وکۆی مرۆڤایەتییدا دەشکێت.

٤-هەموو مرۆڤ و مەخلووقاتیتر _بەخۆشیی بێت یان بە ناچاریی_ ملکەچی دەسەڵاتی ئەون و فەرمانی ئەو رادەپەڕێنن.

٥-هیچ بەربەستێک لە ڕێی بڕیاردان ڕاپەراندنی بڕیارییدا نییە.

٦-بڕیاری بە ویستی خۆی دەردەکات و کەس بۆی نییە تەدەخول لە بڕیارییدا بکات.

٧-ئەوەی ئەو بە تاکەکانی دەبەخشێت، لوتفی خۆیەتی و هەرچییەکیان لێبگرێتەوە لە: زانایی و دانایی و دادپەروەرێتی خۆیەوەیەتی.

٨-هەموو یاسایەک بە پێی ویست و حەزی ئەوەو، کەس بۆی نییە نە پێشنیاری بۆ بکات و نە رەخنەی لێ بگرێت و، نە پرسیاری چاکەو خراپەی لێبکات،چونکە ئەو دەزانێت چی چاکە بۆیان و چی خراپە بۆیان![١]

(١) أبوالأعلى المودودي: تدوين الدستور الأسلامي ل:١٨ ودواتریی.

**ئەمە حـاکمێتیی خـوای گەورەیە.. ئەم مـاف و سـیفاتانە بـۆ غەیـری ئەو شیاونین،چونکە  هەموویـان لە قورئانـدا بە (حصرـ) دیـاریکراون. واتە: مـاف و سیفەتی خوای گەورەن و بەس، وەک دەفەرمووێ:**

-﴿فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٦﴾ البروج: ١٦........ **بکەری هەر شتێکە، کە بیەوێت، هیچ شتێک نییە کە توانای بەسەریدا نەشکێت.**

-﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ٢٣﴾ الأنبياء: ٢٣ .

**واتە: کەس لەو ناپرسێت لەوەی دەیکات، ئەو لە هەموان دەپرسێت.**

-﴿بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ يس: ٨٣ ............**مولـک و ئیـدارەو هەڵسـوڕاندنی هەموو شێتک بەدەست ئەوە.**

-﴿يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ﴾ المؤمنون: ٨٨............... **ئەو داڵدەو پەنـای هەر کەسێک دەدات، کە هانای بۆ دەبـات، بەڵام کەس ناتوانێـت یەکێـک داڵدەبـدات کە ئەو بەدوایەوە بێت و بیەوێت بیخاتەبەر سزای خۆی.**

-﴿ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ﴾ الحشر: ٢٣ .............**خـــــوای گەورە خـــــاوەن و بەدەسەڵاتەو خۆی لە خۆیدا پیرۆزو پاک و بـێ لەکەیەو دوورە لە هەمـووکەم و کورتیی و نوقسانییەک[(١)].**

**مامۆستا مەودودی دەیزانی، کە حاکمێتیی ماف و سیفەتی خوای گەورەیە، دەیزانی کە هەر سیفەتێکی خوایی رەهاو بێسنورو بێوێنەیە. بەڵام لە شـەرحییدا لەگەڵ سیفەتی هاوناوی بەشەرییدا دەهێنرێت، وەکو: زانست و ویست و هیتر.**

**بەڵام زانیاری خوای گەورە بە جۆرێکە، کە لایەقی سیفەتی خوایەتییە، رەهاو**

---

(١) سەرچاوەێ پێشوو ل:٢١.

بێســنوورو بێــوێنەیە، زانیــاریی بەشــەر ســنووردارو کەم و کــورتە، وەکــو سیفەتەکانیتری مرۆڤ وایە...

ئەویــش لە بــواری بەراووردکردنــدا نیــیە، کە (حــاکمێتیی) بەرامــبەر (سەروەرێتیی) هێنـاوەتەوە،چونکە دەزانێـت هەمـوو سـەروەرێتیی دەسـەڵاتی باڵای مرۆڤ، بە هیچ ڕادەو بڕو شـێوەو چـۆنیەتیەکی حـاکمێتیی خـوای گەورە بەراوردناکرێت، بەڵام هەر دەبێت وا بڵێ، بۆ ئەوەی لە حاکمێتیی تێبگەین.

پێم وا نیـیە ئەم ڕەخـنەیە لەمە زیـاتر ڕوونکـردنەوەی بوێـت، لە ڕاسـتییدا ئەگەر ڕەخنەگر زیاتر لە تیۆرییەکەی مامۆستا مەودودی بکۆڵیـایەتەوە، ئەمەی ئاوا بۆ ڕووندەبۆوە.

٢-کە دەڵێ: تیۆرییەکەی( مەودودی) جیاوازیی ناخاتە نێوان بنەماو ڕێسـای دەسەڵات لە دەوڵەتە ئیسلامییەکەی یەکەمجاری زەمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و دەوڵەتی ئیسلامیی سەردەمەکانی دواتر.

ئێمە ئەم خاڵەمان لە تیۆرییەکەی مامۆستا (مەودودی)یدا تێبینی نەکردووە، ڕەخنەگریش ڕوونی نەکردۆتەوە کە لە کوێوە بۆی دروسـتبووە، یـان چ خاڵێـک وایلێکردووە ئەمە بە ڕەخنە ببینێت و چۆن..

بە تایبەتی کە دەزانین مەودودی زۆر جـار جەخـت لەوە دەکـاتەوە کە کەس بۆی نییە، ئەگەر پێغەمبەرێکیش بێت (علیهم السلام) بێفەرمـانی خـوای گەورە فەرمان دەرکات، یان بەرهەڵستی ڕەفتارێک بکات.

ئەوەش کە لەسەر خەڵکی فەرز بووە:کە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیه وسلم) بکەن و ملکەچیی بـۆ دەرببـڕن، لەبەر ئەوەیەتـی کە نێـرراوی خوای گەورەیەو لە خوای گەورەوە ئەحکامی شەرعی خوایی بۆ هێناون...

ئا ئامە کە مامۆستا مەودودی باسی لێوەکردووە ڕاست و دروسـت و ڕەوایەو

بە درێژایـــی مێـــژوو زانایـــانی ئیســـلام و شەرعناســـان هەمـــان ڕێســـایان دووپاتکردۆتەوەو فەرموویانە :کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسـلم) بەو سـیفەتەی کە نێـرراوی خـوای گەورەیە ملکەچـی بـۆ دەردەبڕێـت... ئەمـا خەلیفەکـانی ڕاشـیدین خـوا لێیـان ڕازی بێـت بەڵگەنەویسـتە کە گـوێڕایەڵیی دەکرێن و ملکەچییان بـۆ دەردەبڕێـت، لەبەر ئەوەیە کە جێنشـینی پێغەمـبەری خـوان (صـلی اللـه علیـه وسـلم) لە ڕاپەڕانـدنی دینـی خـواداو کاروباریشـیان بەراوێژکاریی موسوڵمانان دەبێت.

خۆ وەحییان بۆ نایات و کەسـیش نەیوتـووە، کە بە بـێ قورئـان و سـوننەت دەشێت حوکم بکات و خەڵکیش ملکەچی بن... ئیتر نازانین ڕەخنەگـر ئەوەی لە کوێـــوە هێنـــاوە: کە مامۆســـتا مەودودی دەســـەڵاتی خەلـــیفەی لە ســـەردەمە جیاوازەکانی دەوڵەتی ئیسلامییدا تێکەڵکردووە؟!

-ئەما بەراوردکردنی سیماو سیفاتی حکـومەتی ئیسـلامیی پێغەمـبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) بە حکومەتە دینییە (تیۆکراسی)یەکان _بە دیدو پێناسەو وەســـفی ڕۆژئاواییەکـــان_ ئەمە شـــتێکە ڕێســـای بەراووردکـــاریی قبـــووڵی ناکات،چونکە بەراووردکاریی و قیاسکردن لە نیوان دووشتی لێکچوونی لێک نزیکدا دەبێت...

لێرەدا دوو حکومەتی لێکجوداو لێکنەچووی سروشت جیاواز هەیە، کە هەر یەکەیان سیماو سیفاتی تایبەتی خۆیی هەیە.. ڕەخنەگر ئەوەی بەدوورگرتـووە کە حکومەتەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حکومەتێکی تیۆکراسیی بێت..

کەچـی خـۆی خسـتۆتە تەنگـژەیەکیترەوە دەڵـێ: ئەگەرچـی حکـومەتەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) لە ڕواڵەتێـدا دینیـی بـوو، ئیعتـیمادی

دەکردە سەر ئیمانداریتی موسوڵمانان و باوەڕیان بەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەر لە خۆیەوە نادوێت، بەڵکو وەحیەو بۆی دێت و لە گوناح و هەڵە دوورەو مەعسومە.

بەڵام ئەم مەعسومێتییەی تەنها لە کاروبارە دینییەکانییدا بوو، ئەمما کاروبارەکانیتری دنیای وا رەفتاری دەکرد وەکو هەر مرۆڤێک کە دەشێت بکەوێتە هەڵەو ڕاستەوە.

ئێمە لەمە حاڵی نابین کە چۆن حکومەتەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە رواڵەتییدا دینیی بووە؟!

ئایا ئەمە ئەوە دەگەیێنێت کە لە جەوهەری (باطن)یدا دینیی نەبووە ؟!

ئایا لەسەر بنەماو زەمینەی شەریعەت و دەستووری غەیری دینیی دامەزرابوو؟!

ئەوەی ئێمە هەموو دەیزانین و بەڵگەنەویستی مێژووییە ئەوەیە کە (باطن) و (ظاهر)ی حکومەتەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ، هەر دینیی بووە.

بێگومان (باطن) و (ظاهر)ی نەبووە، ئەوە بۆ ڕوونکردنەوەی رەخنەی رەخنەگرەکە وا دەڵێین، دەنا دینی خوای گەورەو شەریعەتەکەی (باطن) و (ظاهر)ی نییەو هەر یەکە.

- ئەوەش کە جیاوازی خستۆتە نێوان جۆری رەفتارەکانی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) لە دیندا مەعسومە (بێ گوناح و بێ هەڵەیە) کە وەحییەو ڕایدەگەیێنێت، لەگەڵ ئەو رەفتارانەی تریدا، کە لە بازنەی (بەشەریتی)یەکەییدان.

ئەمە کە موسوڵمانان راجوێ نین لەسەریی، کەس لە موسوڵمانان نەیوتووە کە

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فریشتەی بێهەڵەبووە،بەڵێ، جەنابی (صلی الله علیه وسلم) مرۆڤێک بووە وەکو مرۆڤیتر، بەڵام وەحی خوایی بۆ جەنابی هاتووە ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾ الكهف: ١١٠ .

واتە: بفەرموو کە من هەر مرۆڤێکم وەکو ئێوە، بەڵام من وەحیم بۆ دێت.

٣-ئەوە کە دەڵێ: (ئەو ئایەتانەی مەودودی بۆ شەرعاندنی (حاکمێتی) هێناونێتیەوە، ناشێت بکرێتە بەڵگەی سەروەرێتیی دەسەڵات لە حکومەتی ئیسلامییدا ،چونکە هی خوایەو بەس) .

هەر رەخنەگرەکەش دەڵێ: (دەبێت مەبەست لەو ئایەتانە ئەوە بێت کە خوای گەورە دارێژەری ئەسڵی شەریعەتی ئیسلامە، کە یاسای دینییەو ئەسڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وەحی ئاسمانی.

کەوابوو: حاکمی ئەم شەریعەتە خوایە، بەڵام رێگاکانی شیکاریی و لێکۆڵینەوەو چۆنیەتی ناساندنی ئەم شەریعەتە بەرنامەی زانینی حوکمی خوای گەورەن.. موسوڵمانانیش لەسەر ئەمە یەکدەنگن... هتد).

پاشان دەڵێ: (ئەمما ئەگەر بووترێت: ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دەسەڵاتدار لە ئیسلامدا کاروباری خەڵکی دەگرێتەدەست و بەڕێوەیان دەبات ،چونکە دەسەڵاتی لە دەسەڵاتی خواوە وەرگرتووە، ئەمە بوختان و درۆیەو دین شتی وا قبوڵناکات.

لە ئیسلامدا دەسەڵاتێکی دینیی نادیار (غەیب)یی نییە کە خوای گەورە بە خەلیفەی دابێت، تا بە زۆری زۆرداریی بچێتە سەر تەخت و ئەمە بکات بە بەهانەی تاکڕەویی بێسنووریی فەرمان و بڕیارو دەسەڵاتی خۆی.

خەلیفە لە ئیسلامدا دەسەڵاتی لە ویستی ئوممەتەوە وەردەگرێت، کە رای خۆیانی دەدەنێ و تەعینیدەکەن. ئەگەر ویستیشیان لایدەدەن. ئەگەر هۆیەکی وایان بەدەستەوەبوو کە لادانی پێویستبکات).

لەو باوەڕەداین ئا ئەمەی رەخنەگر هێناویەتییەوە، کە گوایە: رەخنەیە، لە تیۆرییەکەی مامۆستا مەودوویی دەگرێت، بەڕاستی پشتگیریی و لایەنگیرییەتی هەر وتنەوەی بڕگەکانی تیۆرییەکەیە..

تەنانەت بە وشەکانی مەودودی خۆشی! ،چونکە مەبەست لە حاکمێتیی هەر ئەمەیە، کە رەخنەگر باسی لێوەدەکات.

خۆ مەبەست لە حاکمێتیی خوای گەورە بێگومان ئەوە نییە کە خوای گەورە خۆی دێتە سەر زەمین و دەسەڵاتدارێتی دەگرێتەدەست و حوکم دەردەکات!!

بێگومان مەبەست لە حاکمێتیی خوای گەورە: حاکمێتیی شەریعەتەکەیەتی... دینی خوا دەبێت خاوەنی سەروەرێتیی دەستووریی باڵا بێت و بەس... ئێ خۆ تیۆرییەکەی مامۆستا مەودودی غەیری ئەمەناڵێت!.

لە تیۆرییەکەیدا هیچ ئاماژەیەکی تێدانییە کە بڵێ: دەسەڵاتدارێتی خەلیفە لە دەسەڵاتدارێتی غەیبی خواوە هاتووە... مەودودی واینەوتووە.. ئەوەندە بەسە بۆ سەلماندنی ئەمە کە رەخنەگر خۆی هێناویەتییەوە، کە دەڵێ: ئەو (تیۆکراسی)یەی ئیسلام هێنای، ئەوە نییە چینێک لە پیاوانی دین (سەدەنە) یان (شێخ و مشایەخ) بیگرنەدەست و بڵێن لە خواوە پێماندراوە.

بەڵکو دەسەڵاتێکە بە گشتی لە دەست موسوڵماناندایە. موسوڵمانان تاوتوێی دەکەن و بە پێی قورئان و سوننەت کاروباری دەسەڵاتدارێتیی بەڕێوەدەبەن...

ئێ کە رەخنەگر خۆی جەخت لەمە دەکاتەوە کە دەسەڵاتدارێتی حوکم لە ئیسلامدا مافی رەعییەتەکەیەو مافی هیچ چین و توێژێکی دینیی و غەیرە دینیی

نیـیە، كە موسـوڵمانان خۆیـان خەلـیفە هەڵـدەبژێرن، ئیـتر ڕەخنەگرتنـی لە دیـدو بۆچوونی مامۆستا مەودودی چییە، كە هەردووكیان هەر یەك رایان هەیە.

ئـا ئەمەی ڕەخنەگـر تەئكیـدی لێـدەكاتەوە هەر ئەوەیە كە لە تیـۆرەكەی مەودودیدا بووە بە تەوەری سەرەكی.

٤-ئەوەی كە دەڵێ: تیۆرییەكەی مەودودی تـازەنییەو پێشـتر لە ئەوروپـا لە چاخەكانی ناوەڕاستدا هەندێك لە گەورەپیاوانی ناوداری كڵێسـای مەسـیحێتی وتوویانە.

وەكو (ساتەتۆماس و بارمان و سوارێز) كە وتوویانە: دەسـەڵاتی حـوكمڕانی بە شێوەیەكی لاوەكی ناڕاستەوخۆ لە خواوە دێت، بەڵام بە ڕێگایەكی ڕاستەوخۆ لە گەلەوە دەبێت.

خوای گەورە ئەو مافەی بە جەماوەری خەڵكی داوە كە حاكمی دەسەڵاتداری باڵایان هەڵبژێرن. كەوا بوو دەسەڵات ڕاستەوخۆ لەگەلەوەیە، بەڵام ناڕاسـتەوخۆ هەر لە خواوە دێت.

ئەمە پێویســتی بە باسـێكی زۆرتــر هەیە ،چــونكە ڕەخنەگــر زیــاتری ڕووننەكردوتەوە، كە چۆن تیـۆرەكەی مامۆسـتا مەودودی هەر وەكـو ئەوەیە كە ئەو پیاوە بیرمەندانەی ئەوروپا وتوویانە:

ا-ڕەخنەگر هیچ ئاماژەیەكی بەوە نەكـردووە كە لە كوێـوە ئەمەی هێنـاوە، كە ئەو پیاوانەی كڵێسا وایان وتووە! .. ئەگەرچی ئێمە لە بەدواداچوونییـدا زانـیمان كە دكتـۆر (عبدالحمـد متـولی) وەكـو ئامـاژە پێكردنێـك نووسـیوێتی كە

دەستورەوانی فەرەنسایی (دۆجی)[1] باسـیكردووە. (دكتـور ثـروت بـدوي)یـش ئاماژەی بەمە داوە[2].

ب-رەخنەگر ئامـاژەی كـورتی بەم دیـدو تیـۆری ئەو پیـاوانەی كڵێسـا داوە. دەڵـێ: ئەوە تیـۆری ئەوانە، كەچـی (پێـنج دێـڕ)ی لەسـەر دیـدو ڕاو تیۆریـان هێناوەتەوە! بێگومان پێـنج دێـڕ دیـدو تیـۆری فیكریـی سیاسـی ناناسـێنێت، بە تایبەتی لە بواری بەراووردكارییدا.

ج-یەكسەر ئەوەی بە ڕاسـت و دروسـت دانـاوە كە لە تیـۆری ئەو پیـاوانەی كڵێساوە وەریگرتووەو كردویێتی بە پێوەرو تەرازوی حوكم دەركردن پێی!

بێـئەوەی باسـێك دەربـارەی بـارودۆخی ئەو دیـدو تیـۆرییە بكـات كە لەسەردەمی گەرمەی ململانێی سـەختی كڵێسـاو دەسـەڵاتی ئیمپڕاتـۆرێتی ئەو كاتەدا بوو.

لەوانەش گرنگتر بنەماو ڕێسا فەلسـەفییەكەیە، كە بـۆتە زەمیـنەی تیـۆری پیـاوانی كڵێسـا، ڕەخنەگـر باسـی ئەمەی هەر نەكـردووە، كە گەورەتـرین و كاریگەرترین خاڵی جیاوازی دیدو تێڕوانین و پێناسەكانە.

بۆیە بە ڕاستی بەراوردكردنی تیۆرییە كامڵەكەی مامۆستا مەودودی بە دیدو تێڕوانێیكـی دوورو جـودا، ڕاسـت نیـیەو ئەنجـامێكی وا ناخـاتەوە كە ڕێسـای زانسـتیانەی بەراوورد قبوڵیبكـات، ئەگەر بـۆ موجـامەلەش لەگەڵ ڕەخنەگـردا بڕۆین و بڵێین: باشە با بەراوردیان بكەین دەبینین:

-تیـۆری پیاوەكـانی كڵێسـا _كە تیـۆری مـافی خـوایی ناڕاسـتەوخۆیە_ دەسـەڵاتدار دەكـاتە تـاكرەوێكی رێ بۆخۆشـبوو، ئەگەرچـی گەلـیش

---

(١) مبادیء نظام الحكم ل:٥٥٥.

(٢) النظم السياسية ل: ٩٠ و پەڕاوێزەكەی.

هەڵیدەبژێرێت،چونکە دەسەڵاتەکەی بەوە شەرعێتی وەرگرتووە کە لە خواوەیەو، هەر خوای گەورەش مافی موراقەبەو موحاسەبەی ئەوی هەیە.

ئەمە تەوەرەیەکیتری سەرەکی جیاوازیی نێوان ئەم تیۆرییەو تیۆریی (حاکمێتی)یەکەیە کە مەودودی خستوتێیە بەردەست.

مەودودی دەڵێ: (موسوڵمانان مافی ئەوەیان هەیە کە دەسەڵاتداری حکومەتەکەیان هەڵبژێرن) (حکومەتی ئیسلامیی هەر دەبێت بە هەڵبژاردنی ئوممەتەکە بێتە سەرکار) لابردنیشی هەر لەسەر داوای ئوممەتەکە دەبێت.

بەڕێوەبردنی هەموو ئەو کاروبارانەشی کە دەقێکی راشکاوایان لە شەریعەتدا (لە قورئان و سوننەتدا) لەسەر نییە، هەر دەبێت بە کۆڕا (ئیجماع)ی موسوڵمانان بێت.

ئەمما شەرح و ڕوونکردنەوەو تەفسیلاتی یاساکانی دەوڵەت (کە ئەحکامەکانی شەرعە) هەر دەبێ ئەو کەسانە پێی هەستن کە لە شارەزایی شەرعدا گەیشتوونەتە پلەی ئیجتیهاد)...

وا نازانین دوای ئەم بڕگە رۆشنەی تیۆری (حاکمێتی) جیاوازی نێوان حاکمێتیی و حکومەتی ئیسلامیی لە تیۆری مامۆستا مەودودیدا، ئەمە لەگەڵ تیۆری پیاوانی کڵێسا _کە حوکمی خوایی ناڕاست وخۆیە_ ڕوون و ئاشکرا نەبێت.

٥-رەخنەگر کە هەر دوو تیۆرییەکانی (حاکمێتیی یان حکومەتی خواویستی جەماوەریی) کە مامۆستا مەودودی دایڕشتووەو (تیۆرییەکانی مافی خوایی ڕاستەوخۆ)و (ناڕاستەوخۆ)ی یەکسان داناوەو هەر دووکیانی پێکەوە رەفزکردووە...

ئەمە بەڕاستی رەفتارێکی ناڕەواو ئەنجامێکی هەڵەیە،چونکە تیۆری (حاکمێتیی) مافی خوایی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی تێدا نییە، تاکڕەویی

بێسنووری حاکمی تێدا نییە، موراقەبەو موحاسەبەی ئوممەت روکنی هەبوون و بەردەوامییەتی... جگە لەوەی کە حاکمێتیی لەسەر بریکارێتییەکەی مرۆڤ لەسەر زەمین دامەزراوە.

مامۆستا مەودودی خۆی ئەمەی ئەوەندە رۆشن باسکردووە کە نەدەبوو رەخنەگر ئاوا رەفتاربکات و ئەوەش بکاتە ئەنجام، کە وەکو حوکمی پێشوەخت دەردەکەوێت!.

مامۆستا مەودودی بریکارێتیی و خیلافەتەکە ئاوا ڕوونەدەکاتەوە: (بە هەڵەتێنەگەیت، وابزانیت بریکاریی (خیلافەت) بریتیە لە: پاپایەتیی، یان سێبەرێتیی خوای گەورە: (ظل الله فی الأرض)، یان دەستکەوتنی ئەو ماف و دەسەڵاتانەی کە (پاشا خوا)کان هەیانبوو،چونکە قورئان پێناسەی بنبڕیی خۆیی بۆ خیلافەت کردووە، کە مافی هەموو ئەو کەسانەیە کە حاکمێتیی خوای گەورەیان قبووڵکردووەو باوەڕیان بە سەروەرێتیی و دەسەڵاتی باڵای یاسای خوای گەورە هێناوە، کە لە رێی وەحیەوە لە خوای گەورەوە بۆ نێرراوان و پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) هاتووە).

ئەمە ئیزافەکەرە سەر ئەو جیاوازیانەی باسمانکردن کە لە (تیۆری حاکمێتی)یەکەدا هەن.

٦-سەیر ئەوەیە :کە رەخنەگر دەستەواژە (عیبادەت)ی شێخ عەلی عبدالرزاق دەهێنێتەوە، کە دەڵێ: (وا دیارە ئەوانەی کە ئەمە دیدو رایانە (کە حکومەتی ئیسلامیی بە حکومەتێکی دینیی دەزانن) لە زانایانی ئیسلام، نازانن کە لە دیدو تێڕوانینی رۆژئاوادا هیچ شتێک نییە کە بۆ ئیسلام خراپ بێت، وەکو ئەم دیدو رایە).

ئینجا رەخنەگر لای خۆیەوە ئەمەی بۆ ئیزافەدەکات: (لەبەرچاوی زانایانی سەردەمیش بە شێوەیەکی گشتی هەر وایە) ئینجا دێتەوە سەر قسەی شێخ علی

عبـدالرزاق و تەواویـدەکات، کە دەڵـێ: (لەوە بێئاگـان کە بەم دیـدو رایەیـان چەکێــک دەدەنەدەســت دوژمنــانی ئیســلام، کە هەر دژی ئیســلام خــۆی بەکاریدەهێننەوە) .

ئینجا وتەیەکـی مامۆسـتا (بلّنچلـی) دەهێنێـتەوە کە دەڵـێ: (دەوڵەتـی دینـی تیۆکراسیی لە دیدو پێناسەی زانایانی رۆژئاوادا شـێوازێکی نـاسراوی دەوڵەتە، کە لەسەردەمانی سەرەتایی ژیانی مرۆڤدا دادەمەزرا).

ئێمەش دەڵێین: (الطیور علی اشکالها تقع).

واتە: باڵندە لای هاوشێوەی خۆی دەنیشێتەوە...

پێش نیو سـەدە (شـێخ عەلـی عبـدالرزاق) حەملەیەکـی سـەختی کردەسـەر ئیسلام، بەو ئومێدەی لە بناغەوە هەڵیتەکێنێـت! بنـاغەو سـەربانی تێکڕمێنێـت! بەوەی کە دەیویست: نکوولّی لە هەبوونی شەریعەت بکات لەئیسلامدا.

واتە:نەفیکردنــی سیســتمەکانی سیاســەت و حــوکم و کــۆمەڵایەتیی و ئابووریی تا وەکو دینێکی رۆحی ئامۆژگـاریی رەوشتسـازیی بیناسـێنێت، بەڵام خــوای گەورە وایکــرد کە شــێخ عەلــی و ئەوانەی لە پشــتیەوە بــوون خۆیــان نەخشەیان تێکشکاو بەزین و دواتر هەر خۆی تەبەڕای لە دیدو رای خۆی کرد.

ئەگەرچـی ئەو قسـەیەی سەروەشـی وا نیشـانیدا کە گـوایە: بەرگریـی لە ئیسلام دەکات و نایەوێت لەکەدار ببێت! سەیر ئەوەیە: کە ئێسـتا وا رەخنەگـری لەمەڕ خۆشیان دوای پەنجا ساڵ هاتووەو هەمان دیدو را دەخاتەوەڕوو!

بە حساب ئەمیش هەر بەرگریی لە ئیسلامەکە دەکات و نایەوێت لەبەرچاوی زانایــانی رۆژئــاوایی و جیهانیــان وا بناسرێــت، کە حکــومەتی ئیســلامیی حکومەتێکی دینییە!! هەر دووکیان خۆ لەوە گێڵـدەکەن کە چەنـد دژ بە ئیسـلام وەستاونەتەوەو زیانیـان پێگەیانـدووە، لە کاتێکـدا وا دەزانـن پیاوەتیـان لەگەڵ ئیسلامدا کردووەو بەرگریی لێدەکەن!

( شێخ عەلی عبدالرزاق) وا بەرگریی لە ئیسلام دەکات کە هیچ بەندو بڕگەو بنەماو بەڵگەیەک لەسەر هەبوونی سیستمی سیاسی ئیسلامیی نییەو، ئیسلام هەقی بەسەر دامەزراندن و لادانی حکومەتەوە نییە (دین لە سیاسەت جودایە) و ئەو کاتەش کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حکومەتی دامەزراندووە، دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی لە خوای گەورەوە وەرگرتووە.

بەوەش ویستی تیۆرە رۆژئاواییەکەی حکومەتی دینیی تیۆکراسیی بهێنێتە ناو ئیسلام و موسوڵمانانەوە، کە دەڵێ: بە پێی مافی خوایی ناڕاستەوخۆ دەسەڵاتی تاکرەویی پیرۆز دادەمەزرێت.

رەخنەگری بەرامبەریشمان دەیەوێت بنەماو رێسا دینیی و عەقائیدییەکە لە حکومەتی ئیسلامیی بکاتەوەو بڵێ: لە ئیسلامدا پێکهێنانی حکومەت هەقی بەسەر دین و دیندارییەوە نییە، بەڵام کەوتۆتە پشێویی و تەنگژەیەکی سەختەوە.

حکومەتی ئیسلامیی نە ئەو سیماو سیفەتەی هەیە، کە شێخ عەلی عبدالرزاق لە کتێبی (الاسلام وأصول الحکم)ەکەیدا باسیکردووە، کە لە (١٩٢٥) بڵاویکردەوە، نە ئەو سیماو سیفاتەشی هەیە کە دکتۆر (حازم عبدالمتعال الصعیدي) دەیەوێت بیکات بەبەریدا کە لە( ١٩٧٧) دا بڵاوی کردەوە..

حکومەتی ئیسلامیی بە ڕاستی ئەوەیە کە مامۆستا ئەبولئەعلای مەودودی لە تیۆری (حاکمێتی)یەکە خۆیدا، پێناسەو باسی کردووەو بە شێوەیەکی هێندە گشتگیرو ریشەیی و کاملانە خستویێتیەڕوو، کە زەحمەتە رەخنەی لێ بگیرێت،مەگەر لە نەزانێکەوە.

لە کۆتاییدا ئەوە پێویستدەکات کە ئاماژەی پێبدەین، کە رەخنەگر (دکتۆر حازم عبدالمتعال) لەگەڵ ئەوەشدا کە نکوڵی لە سیماو سیفاتی دینییانەی دەسەڵات دەکات لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، لە کۆتاییدا دێتەوەسەر بڕیارلەسەردانی! کە وەکو پێچەوانەکاریی و تەنگژەو دیدلێڵیی دەردەکەوێت.

دەڵـێ: (پێویسـت دەکـات هەمـوان لەوە ئاگـاداربکەینەوە، کە نەفیکردنـی شـێوازی تیۆکراسـیی لە دەوڵەتـی ئیسـلامییدا (کە حکـومەتێکی دینیـیە) بە شێوەیەکی گشتی ڕاست نیـیە ،چـونکە دەبێـت ئەوە ڕۆشـن بیێـتەوەو بـاوەڕی پێبهێنرێت، کە لە ئیسلامدا خوای گەورە خاوەن مافی داڕشتنی یاساو ڕێسایە.

هەر خۆی خاوەنی دین و شەریعەت و دەوڵەتە ئیسلامییەکەیە، مەبەسـتیش لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی:هەر چەسپاندنی شەریعەتی خوای گەورەیە، کە دەوڵەت و حکومەتەکەی هەر بە پێی ئەو شـەریعەتە دامەزراون، ئەگەرچـی سیستمی تیۆکراسیی بە تەواویی ـوەکـو کە خـاڵە جیاوازییەکـانیان باسـکرد ـ ناکرێت بە تەواویی ببێت بە سـیماو سـیفەتی تیـۆری سیاسـی ئیسـلامیی، بەڵام ئەمە ڕێ لەوە ناگرێت کە هەندێک خاڵی لێکچوویان هەبێت... ئەوەشە کە ئـێمە مەبەستمان بوو)[1].

بەم ڕستەکورتەی دواییـنی ـکە وا دیارە دەقـاودەق نەقڵیکـردووە ـ هەمـوو ڕاو بۆچوون و ڕەخنەکانی خۆی سڕیووەتەوەو بە شێوەیەکی ڕۆشن و ڕاشـکاوو بنبڕانە ئیعتیرافی بەوە کردووە ،کە دەوڵەتی ئیسلامیی و حکـومەتی ئیسـلامیی دەوڵەت و حکـومەتێکی دینـیـن و تیـۆری حـوکم لە ئیسـلامدا لەگەڵ تیـۆری تیۆکراسیی ڕۆژئاوادا یەکناگرنەوەو لێکیش نزیک نین.

ئەو نزیکییەی ئەو مەبەستی بوو،کە بیسەلمێنێت وبۆی نەسەلمێنرا..

---

(١) بڕوانە کتێبەکەی ڕەخنەگر: النظرية الاسلامية في الدولة ل: ١٦٣.
ـ پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێین: کە ئەو ڕەخنانەی لەسەرەوە لە تێکستەکەدا هێناومانەتەوە، هەموویان لە کتێبەکای د. محمـد ضياءالدين الريس دەقاودەق نەقڵکردووە، کە لە کتێبەکەی خۆیدا: (النظريـات السياسية الاسلامية ل: ٣٧٤ چاپی شەشەم ١٩٧٦) هێناوێتیەوە، کە دەبوو ڕەخنەگـرییش ـکە هەر لەوێوە وەریگرتووە ـ ئاماژەیەکی پێبدایا!.

**بڕگەی پێنجەم:**
**ڕادەی شیاوێتی ناوبردنی حاکمی موسوڵمان بە :(خليفة الله):**

*واقیعی مێژوویی سەردەمی خولەفای ڕاشیدین:

کتێبەکانی سیاسەتی شەرعیی و سیستمی حوکم لە ئیسلامدا، مەقولەیەکی (ماوەردی)یان دەماودەم هێناوەتەوە کە هۆی ناوبردنی حاکمی باڵای دەوڵەتی ئیسلامییە بە(خەلیفە)، لەبەر ئەوە بوو کە جێنیشنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوون لەئاڕاستەکردنی ئوممەت و چەسپاندی حوکمی شەرع لە نیوانیاندا.

بۆیە: جائیزبووە پێیان بووترێت: (يا خليفه رسول الله (صلى الله عليه وسلم)).

بۆ ئاسانکاریش هەر وتوویانە: خەلیفە، بەڵام هەر مەبەست لێی خەلیفایەتیی، واتە: جێنشێنێتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە.

لەسەر ئەمە ڕێکەوتوون... بەڵام ئەو پرسیارەشیان هاتۆتەپێش: کە ئایا جائیزە بووترێت: (خليفة الله)؟

هەندێک لە زانایان و شەرعناسان فەرموویانە: بەڵێ، جائیزە پێی بووترێت: (خليفة الله) ،چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ﴾ الأنعام: ١٦٥ .

واتە: ئەوە خوای گەورەیە کە کردوونی بە جێنشینی سەرزەمین (بە بریکاری خوای گەورە لەسەر زەمین) و جیاوازیی پلەو ئاستی لە هەموو شتێکدا لەناودا دروستکردوون و هەندێکتانی پلەباڵاترکردووە (لە هەندێکیترتان: لە دەوڵەمەندیی و ناوداریی و پلەو پایەو... هتد)دا.

بەڵام جمهوری شەرعناسان فەرموویانە: جائیز نییە وا بووترێت ،چونکە جێنشینی بۆ یەکێک دەشێت کە غائب ببێت، یان بمرێت.

خوای گەورەش نە غایب دەبێت (واتە لەوێ نامێنێت) و نە دەشمرێت.. شەرعناسان فەرموویانە: هەر کەسێک بڵێ: (یاخلیفة الله) گوناحباردەبێت، بەڵام خەلیفەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جائیزە.

بۆیە کاتێک بە سەیدنا ئەبوبەکری صددیقیان - خوالێی ڕازی بێت -وت: (یا خلیفة الله) .

فەرمووی: من خەلیفەی خوای گەورە نیم، من خەلیفەی پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم)[1].

لەگەڵ ئەمەشدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە لە هەندێک ریوایاتی مێژووییدا هاتووە کە وشەی خەلیفەو (سلطان الله) بەکارهاتووە. لەوانە کە دەگێڕنەوە: کە ماڵ و سامانی زەکات و دەستکەوت هێنرابووە بەردەست سەیدنا عومەر - خوالێی ڕازی بێت -خەڵکیش قەرەباڵغییان لە دەوری سەیدنا عومەر دروستکردبوو، سەیدنا سەعدی کوڕی ئەبووەققاص - خوالێی ڕازی بێت - تەشریفی هێنا (کە خاڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و فەرماندەی جەنگی قادسییە بوو) دڕی بە خەڵکی داو خۆی گەیاندە سەیدنا عومەر.

سەیدنا عومەر کە بینی (دیڕە)کەی دەرهێناو یەک دوانێکی پێکیشاو فەرمووی: (إِنَّكَ أَقْبَلْتَ لا تَهابُ سُلْطَانَ اللهِ في الأرضِ، فَأَحْبَبْتُ أنْ أُعَلِّمَكَ أنَّ سُلْطَانَ اللهِ لَنْ يَهابَكَ).[2]

---

(١) الأحكام السلطانية ل: ١٥ هەروەها: مقدمەی ابن خلدون ل: ١٧١.

(٢) نووسەری بەڕێز ئاماژەی وا داوە کە لەم سەرچاوەوە وەریگرتووە: (د. سليمان الطماوي: عمر بن الخطاب ل: ٢٧٣) بەڵام عادەتەن بۆ ریوایاتی وا دەبێت بگەڕیینەوە سەر نزیکترین سەرچاوە. وا منیش لە (طبقات بن سعد/ریوایەتی ژمارە ٣٧٠٥)ەوە نەقڵیدەکەم: (عَنْ رَاشِدِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ ←

واتە: وا هاتیت کە گوایە لە دەسەڵاتی خـوا لەسـەر زەمـین ناترسـیت! بـۆیە حەزمکرد پێت بڵێم :کە دەسەڵاتی خوا لە تۆ ناترسێت.

-هەروەها کە لە سـەیدنا عەلـی کـوڕی ئەبـو تالیـب - خـوالێی ڕازی بێـت - دەگێـڕنەوە کە لەئامۆژگـارییەکی دوورو درێژییـدا بـۆ والیـی کە کـی پـێ ی فەرموو (ثُمَّ امْضِ الَيهِمْ بالسَّكِينَةِ و الْوقَارِ حَتَّى تَقُومَ بَينَهُمْ فَتُسَلِّمَ عَلَيهِمْ، و لا تَخْدِجْ بالتَّحِيَّةِ لَهمْ ثُمَّ تَقولُ: عِبَادَالله، اَرْسَلَنِى اِلَيكُمْ وَليُ الله وَ خَليفَتُهُ لآخُذَ منكُمْ حَقَّ اللهِ فى اَمْوالِكُمْ، فَهَلْ لله في اَموالِكُم مِنْ حَقٍّ فَتُؤَدُّوهُ اِلَى وَلِيِّه)[1] .

واتە: پاشان بە ویقار و هێمنییەوە بچۆرە لایان تـا ڕووە و ڕوویـان دەبیـتەوە، سڵاویان لێ بکە، بەخیلی لە سڵاولێکردنیاندا مەکە.

پاشان پێیان بڵێ: ئەرێ هـۆ بەنـدەکانی خـوای گەورە! وەلـی و خەلـیفەکەی خوای گەورە ناردوومی بـۆ لاتـان، تـا مـافی خـوای گەورە (زەکـات) لە مـاڵ و سامانەکانتان دەربکەن و من وەریبگرم و بیبەمەوە بۆ وەلیەکەی خوای گەورە .

**سەردەمانی دوای خولەفای راشیدین:**

لە هەموو سەردەمانی حوکمی خەلیفەکانی ئەمەوییدا (٤١-١٣٢ک) نابینین هـــیچ خەرمـــانەیەکی پیرۆزیـــی و موبـــارەکیی بە دەوری کەســـانێکەوە دروستکرابێت، بەڵام لەسەردەمی عەبباسییەکاندا لە مـاوەی حـوکمی خەلـیفەی دوومیان، ئەبوجەعفەری مەنسوور (١٣٦-١٥٨ ک = ٧٥٤-٧٧٥ز) دەبینین نازناوی وای لێنراوە، کە نەسەبێک بێت بۆ لای خوای گەورە (وەکـو سـلطان الـله وظـل

الْخَطَّاب أُتيَ بمَالٍ فَجَعَلَ يَقْسِمُهُ بَيْنَ النَّاس، فَازْدَحَمُوا عَلَيْه، فَأَقْبَلَ سَعْدُ بْنُ أَبي وَقَّاص يُزَاحِمُ النَّـاسَ حَتَّى خَلَصَ إِلَيْه، فَعَلاهُ عُمَرُ بالدِّرَّة ، وَقَالَ : إِنَّكَ أَقْبَلْتَ لا تَهَابُ سُـلْطَانَ اللَّـهِ فِي الأَرْضِ، فَأَحْبَبْـتُ أَنْ أُعَلِّمَكَ أَنَّ سُلْطَانَ اللَّهِ لَنْ يَهَابَكَ).

(١) نهج البلاغة ل: ٢٩٩و دواتریی.

الـله) لەو بەدواوە، ئیـتر بـوو بە بـاوی رەسـمی! دوای بەیعەتپێـدانی خەلـیفە نازناوێکی وایان لێدەنا.

-رۆژهەڵاتناس (ئادەم متز) دەڵێ: (پێشتر نازناوی وا لەکەس نەنرابوو)[1].

لە زەمانی عەبباسییەکاندا هەر ئەوە نەما، کە وەکـو زەمـانی ئەمەوییەکـان خەلیفە هەر دەسەڵاتداری دنیایی بێت، بەڵکو بە (زەعیمی رۆحی)یش دادەنرا!!

ئەو هەموو ناوو نازناوو ئەلقابانەی لێیاندەنراو بەڵگەی زیرەکیـی و لێزانیـی ئەبـوجەعفەری مەنسـوور بـوو، کە هەر دوو دەسـەڵاتی سیاسـیی و رۆحیـی لە دەست خۆی و دوای خۆشی لە خەلـیفەدا گیـردا!! دەنـا خـۆ زۆریـنەی ئەو نـاوو نازناوانە وەزیرە بەهێزەکان لە خەلیفە لاوازەکانیان دەنا، تا کـاری خۆیـان ئاسـان بکەن!

تا وا حاڵی بکرێن کە هەموو دەسەڵاتەکان بەوانە! بێگومان لە سەردەمەکانی دواییندا (کە ئوممەت زۆر دواکەوت) ئەم نازناوانە هەر زۆرتردەبوو...

تەنانەت لەسەردەمی نوێشدا لە پەیماننامەی (الحزب الوطني)ی کۆنی زەمانی شۆڕشی عـورابی پاشـا لە میسری بە دەق لە باسـی سـوڵتانی عوسـمانییدا ئـاوا نوسرابوو: (يرى الحزبُ الوطني محافظـةً علـى العلاقـات الوديَّـة الموجـودة بـينَ الحكومةِ المصريةِ والبابِ العالي واتخاذَ ذلكَ الباب رُكناً يَستنِدُ عَليهِ ويَعتقَـدُ أنَّ جَلالَةَ السَلطان عَبدالحميد مولاهم وخليفَةُالله في أرَضهِ وإمـام المسـلمينَ لا يريـدُ قطعَ الصلاتِ والعلاقاتِ مادامتْ الدولةُ العَلِيَّةُ في الوجودِ).[2]

واتە: حزبی نیشتیمانی وا دەبینێت کە پێویستە پەیوەندیی دۆسـتانەی نێـوان حکومەتی میسری و بابولعالی (دەوڵەتی عوسمانی) پایەداربێت ،چونکە دەوڵەتی عوسمانی قەڵایەکە کە پشتی پێ قایم دەکرێت.

---

(١) الحضارة الاسلامية ب١ ل:٢٥٨.

(٢) سيد أمير علي: مختصر تاريخ العرب ل:٣٤٧.

حیزبی نیشتمانی وا دەبینێت، کە جەنابی( سولّتان عبدالحمید) سەروەری حزبە ،چونکە خەلیفەی خوای گەورەیە لەسەر زەمین و ئیمامی موسوڵمانانە، بۆیە هەتا دەوڵەتی مەزن و خاوەن شکۆ (ی عوسمانی) مابێت، حزب نایەوێت ئەو پەیوەندییەی نێوان هەردولا بپسێت.

**توێژینەوەیەکی زانستیانە دەربارەی ئەم بابەتە:**

ئەگەر لەو واقیعانە دەربچین و بچینە سەر توێژینەوەیەکی زانستیانە، کە ئایا دەشێت نازناوی (خليفة الله) لە حاکمێک بنرێت و بەو ناوەوە بانگ بکرێت؟

لە کاتێکدا کە وەکو پێشتر بەتەفسیل باسمانکرد: کە وشەی خەلیفە بە مانای بریکاری خوای گەورە لەسەر زەمین لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، وا لێرەشدا بۆ بیرخستنەوە دەڵێین :کە بریکاریی (الخلافة) دووجۆرە:

-بریکارییەکی گشتیی کە وەسفی هەموو مرۆڤێکە.

-بریکاریی تایبەتی کە دەوڵەت دەگرێتەوە، مادام فەرماندەێتی مرۆڤ دەکات. هەروەها حاکمی سەرۆکایەتی گشتی و رێبەریی خەڵکی.

- لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا شیکارییەکی زمانەوانی (زانا زەجاج) هەیە کە دەڵێ: دەشێت بە پێشەوایان و رێبەران بووترێت: (خليفة الله)، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلۡأَرۡضِ﴾ ص: ٢٦ .

واتە: ئەریٚ داود ! ئێمە تۆمان کردووە بە خەلیفەی سەرزەمین[١].

- لەفەرهەنگی (المصباح المنير)یشدا هاتووە: خەلیفە _کە بە مانای

(١) ابن منظور: لسان العرب . حرف:خ ل:٨٨٣.

دەسەڵاتداری مەزنە_ دەشێت بکەر (فاعل) بێت و بووترێت: (خَلَفَ مَنْ قَبْلَهُ فهـوَ خليفَةٌ).

واتە: جێی ئەو کەسەی گرتەوە کە پێش ئەو لەوێ بوو، ئەو خەلـیفەیە. هەر وەکـو کە دەشـێت کـراو (مفعـول) بێـت ،چـونکە خـوای گەورە کردوێتـی بە خەلیفە،چونکە لە دوای کەسانیتر هاتووە، وەکو:هاتنی نەوەکـانی مـرۆڤ، یەک لەدوای یەک، کە مەبەستی ئایەتەکەیە:﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ فاطر: ٣٩ .

واتە: ئەوە خوای گەورەیە کە نەوە بەدوای نەوە بەدوای یەکتردا هێناونی.

هەندێک لە زانایانی زمانەوانی فەرموویانە: تەنها بۆ سەیدنا ئادەم و سەیدنا داود (عليهما السلام) جـائیزە بووترێـت: (خليفـة الـله) ،چـونکە دەقـی ئایەتیـان لەسەرە.

دەشـڵێن: جـائیزە بە بەراووردکـاریی بەم دوو پێغەمـبەرە بەڕێـزە (علـيهما السلام)،چونکە خوای گەورە باسی لە (خليفة) و (سلطان) کردووە، بۆیە وتراوە : (خليفة الله، سلطان الله، جنودالله، حزب الله، خيل الله)[1].

-لە فەرهەنگی ئیسلامییدا هـاتووە کە: الخليفـة: نازنـاوێکە لە دوای کـۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) داهات.

کاتێک بەیعەت بە سەیدنا ئەبوبەکری صددیق درا، پێیانووت: (خليفة رسول الله (صلى الله عليه وسـلم)) پاشـان گـۆڕرا بە (اميـر المـؤمنين)، بەڵام زاراوەی (خەلیفە)بوو نازناوی هەر کەسێک کە دەبووە خاوەن دەسەڵاتی باڵای دەوڵەتـی ئیسلامیی، بەو سیفەتەی کە جێنشینی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) لە چەسپاندن و راپەڕاندنی ئەحکامەکانی ئیسـلام و ئاڕاسـتەکردنی ئـوممەت و بەرێوەبردنی کاروباری دنیای رەعییەتەکە.

جاری واش هەبوو لە دواندندا بە خلیفەیەک دەوترا: يا خليفة الـله، ياخليفـة

(١) احمد بن علي المقري: المصباح المنير المجلد الأول. كلمة: خلف ل: ٩٠_٩١.

رسول الله (صلی الله علیە وسلم) ، یان یاخلیفة الله في ارضە ونائبە فی خلقە!)[1].

- لە فەرهەنگی (معجم الفاظ القرآن الکریم)دا هاتووە: الخلیفة: مَنْ یَخْلُفُ غَیرَهُ وَیَقومُ مَقَامَهُ: واتە: خەلیفە: ئەو کەسەیەکە دەچێتە جێی یەکێکیترو پلەو شوێنی ئەو دەگرێتەوە.

کۆیەکەشی: (خلائف و خلفاء و خلیفة)یە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ البقرة: ٣٠ .

واتە: خوای پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرمووو: من دەمەوێت بریکارێک لەسەر زەمیندا دانێم.

تەفسیرەوانان دەفەرموون: واتە: یەکێک دادەنێم کە لە جیاتی من ئەحکامەکانی دینی من بچەسپێنێت و ویستی من ڕاپەڕێنێت، لە ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمین و بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکییدا.

کە دەشفەرموێ:﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ص: ٢٦ .

واتە: ئەرێ داود! ئێمە تۆمان کردووە بە بریکار لەسەر زەمیندا.

واتە:لە جیاتی خوای گەورە ببە بە دەسەڵاتدار، بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە لە ئیدارەدانی کۆمەڵگەی مرۆڤدا.

-ماناو واتاکانی بریکارێتیی (ئیستیخلاف) کە لە سورەتەکانی: (النور/٥٥، الانعام/١٣٣، هود/٥٧، الاعراب/١٢٩، الحدید/٧ )دا هاتووە، بە مانای بریکارێتیی خوای گەورەیە، کە ئەمیش بریتییە لە: ڕەفتارکردن لەسەرزەمیندا بە پێی فەرمانی خوای گەورە.

هەروەها کردوونی بە نەوە بە نەوەی دوای یەکتریی، تا ئەگەر نەوەیەکیان

[1] أحمد عطیة الله: القاموس الاسلامي. المجلد الثاني ١٣٨٦ک/١٩٦٦ز مکتبة النهضة المصریة ل:٢٧٩.

کەمتەرخەمبوو لە بریکارێتییەکەیدا نەوەی دواییتر بە تەواویی ئەنجامیبدات[1].

-پێشتر ئایەتەکانی خیلافەمان _بە تەفسیریانەوە_ هێنایەوە، کە پێشـەوایانی تەفسیر مانایان کردبوون،پێویست ناکات لێرەشدا بیانهێنینەوە، کە هەموویـان بە جائیزی دەزانن بە دەسەڵاتداری باڵا بووترێت: (خلیفة الله).

هەر پێشـوتر ئەوەشـمان سـەلماند: کە مـرۆڤ ئەرکـی بریکـارێتیی خـوای گەورەی لە ئەستۆدایە، کە دەبێ لەسەزەمین بیهێنێتەدیی.

بۆیە جائیزبوو پێی بووترێت: (خەلیفة) یان (النائب عن الله فی ارضه).

واتە: بریکاری خوای گەورە... ئەمما ئەو زانایانەی فەرموویانە: جائیز نییە وا بە مرۆڤ بووترێت ،چونکە (خەلیفة) دێتە شوێنی کەسـی غایـب و مـردوو، ئەمە رایەکی لاوازە لە بەرامـبەر هەبـوونی ئـایەتی رۆشـن و راشـکاودا، کە بـاس لە خەلیفەو خیلافەتی مـرۆڤ دەکـات لەسـەر زەمـین و گەیانـدنی بە دەسـەڵات و تەمکین، تا فەرمانی خوای گەورە بچەسپێنێت و سەرزەمین ئـاوەدان بکـاتەوە.. ئەگەر جائیزنەبێت بۆ خوای گەورە بووترێـت: جێنشـین، دیـارە کە لەبەر ئەوەیە شتێکی نامومکینە (چونکە ئایا خوا جێگای هەیە؟

جێی دەهێڵێیت؟

کێ دەچێتە جێی؟!

ئەمانە هەمووی پرسـیاری سۆفسـطائی بێمانـان)، بەڵام بەکارهێنـانی وشـەی (خلیفە) بۆ خـوای گەورە بەو مانـایە نیـیە، وەکـو کە مرۆڤێـک دەچێـتە شـوێن مرۆڤێکیتری غایب یان مردوو..

ئەمە ئاشـکرایە کە بـۆ مـرۆڤ سروشـتیی و ئاسـاییە، بەڵام بەتەئکیـد ئەمە

(١) مجمع اللغة العربیة/مصر: معجم ألفاظ القرآن الکریم. المجلد الأول چاپی دووەم ١٣٩٠ک/١٩٧٠ز ل:٣٦٥ و دواتریی.

مەبەست نییە بۆ خوای گەورە، بەڵکو مەبەست لە (خلیفة الله) ڕەفتارکردنە لە جیاتی خوای گەورە:

_ لە پێناسەو ناسین و ناساندنی خوایەتی و

_ ئەرکی عەبدێتیی و

_ چەسپاندنی دادی خوایی و

_ ئاوەدانکردنەوەی سەرزەمین بۆ ئاسوودەی مرۆڤ[1]...

،چونکە خوای گەورە بێوێنەو بێهاوتاو بێهاوشێوەیەو هیچ وەکو ئەو نییە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١ .[2]

لەوانەیە کە سەلەف پێیان چاک نەبووبێت بووترێت: (خلیفة الله) لەبەر ئەوەیان بووبێت نەبادا لە زەین و هەست و هۆشی خەڵکییدا تێکەڵ بە خەلیفایەتی مرۆڤ بۆ مرۆڤ ببێت و هەندێک کەس سیفەتی مرۆڤی مەخلووق وەکو سیفەتی خوای خالق دابنێن، یان نەبادا ئەو کەسەی پێیبوترێت (خلیفن الله) ئەم نازناوەی بۆ بکرێتە مایەی پیرۆزیی و موبارەکیی و مەزنییەکی باڵاتر لە ئاستی مرۆڤ، یان نەبادا ئیتر خەلیفە یان پێشەواو ڕێبەرەکە وا بزانێت ئیتر لەوە دەرچووە فەرزەکان وەکو عمومی خەڵکی ڕاپەڕێنێت، یان بۆی ببێت بە مایەی سیستی نواندن لە دینداریی، یان خۆفریوودانی زیاتر!

ئەگەرچی لە حەقیقەتدا ئەم نازناوە (خلیفە) هیچ مەزنیی و پیرۆزییەکی نائاسایی، یان دەسەڵاتێکی خوایی و پلەیەکی دینیی بە کەسەکەی نادات، بەڵام

---

(١) لەبەر ئەمەبوو ئێمەش نەمانووت (جێشین)، بەڵکو (بریکار) واتە لەبری ئەو، لەجیاتی ئەو، کارەکە دەکات. نەک لەبەر غایب بوونی ئەو، یان نەتوانینی، بەڵکو بۆ بەجێهێنانی ئەرکی خۆی _کە فەرمانەکەی خوای گەورەرەیە_ لە خودی بریکارێتییەکەدا.

(٢) الاسلام وأوضاعنا لاسياسية ل: ١٠٠_١٠١.

هەر بۆ ڕێزی زیاتر لە عمومی خەڵکی بە خەلیفەیـان دەوت: (خلیفـة الـله)، هەر وەکــو کە بە مزگەوتیــان دەوت: (بەیتــوالله) یــان بە هەنــدێک مــانگی ســاڵ: شهرالله[1].

(١) أبوهلال العسكري: الأوائل ل:١١٧.

**بڕگەی شەشەم:**
**مرۆڤێتیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):**

سەلماندنی مرۆڤێتیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆتا رازاندنەوەی ئەو ئەنجامەیە ،کە گەیشتینێ بە باس و بڕگەکانی پێشوو دەربارەی تیۆرەکانی مافی خوایی بۆ دەسەڵاتگرتنەدەست.

کە وەکو بینیتان وردەکارانە تیۆرییەکانمان شیکردەوەو بە رەخنەی زانستیانە وەڵامیانمان خستە بەرچاوان...

ئەگەر مافی خوایی ڕاست بوایە بدرێت بە مرۆڤ، کەس لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شیاوترو لەپێشتر نەدەبوو کە بیدرێتێ... ئەگەر خوای گەورە لە دەسەڵاتی خوایەتی خوای بدایا بە مرۆڤێک، دەبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو پلە رێزو تەقدیرە وەربگرێت...

ئەگەر ئەو تیۆرییە لە ئیسلامدا هەبوایە، لە یەکەم رۆژی پێغەمبەرێتی سەیدنا محمدەوە (صلی الله علیه وسلم) دەبوو رابگەیێنرێت و، موسوڵمانانی یەکەم _کە ئەوەندە هۆگری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوون_ دەیانخستە سەرچاوو سەرسەریان، وایان رێزلێدەگرت کە تەواویی مافی خوایەتییەکەیان لە دەسەڵاتدارێتییدا بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەسەلماندو دەچەسپاند...

بەڵام هەر هەموو یاوەران لە ئاراستەکانی قورئان و سیرە و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حاڵیی بووبوون، دەیانزانی کە شتی وا لە ئیسلامدا نییە...

لە ئیسلامدا بە هیچ رادەو برو شێوازو چۆنییەتییەک سیفاتی خوای گەورە

نادرێت بە بە هیچ مەخلووقێک، تەنانەت بە پێغەمبەرانیش- سەلامی خوایان لێ بێت-..

بۆیە لەو ڕۆژانەی سەرەتای وەحییەوە، هەتا ئێستاو تا ڕۆژی دوایی لێکۆڵەرەوەو توێژەرەوەکان هیچ بەڵگۆکەیەکیشیان دەستناکەوێت کە بڵێین مافی خوایەتی (الحق الالهي) لە ئیسلامدا هەیەو بە گوێرەی ئەوە دەسەڵاتداری باڵای دەوڵەت (کول فی کول) دەبێت و تاکڕەوانە بە ناوی خوای گەورەوە حوکم دەکات!

هیچ بەڵگۆکەیەک لەو بارەوە نییە، نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا، نە لە کۆڕای یاوەران و نە لە ئیجتیهادی پێشەوایاندا (نە لە مەدرەسەکانی سوفیگەرێتیشدا) نە ئاشکراو نە پەنهان، نە راشکاو (صریح) و نە لاوەکی و لابەلا...

سەلماندنی مرۆڤێتیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە پێغەمبەرو خەلیفەو حاکمی باڵای دەوڵەتی یەکەمی ئیسلام بوو، سەلماندنی مرۆڤێتیی هەموو مرۆڤێکیترە، لە هەر ئاست و پلەیەکی ڕێزو گەورەیی و ناوداریی و دەسەڵاتدابێت..

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە مرۆڤێتیی خۆی، بە باوەڕو وزەو ڕەنجی بەشەرێتیی خۆی، ئەم وەحیە خواییەی ڕوونکردەوەو گەیاندی.. خەڵکی موسوڵمان کردو کۆمەڵکارانە خستنیە خەبات و ڕەنجدان (بێگومان لەژێر سەرپەشتی قۆناغ بەقۆناغی وەحییدا)،پاشان بە ڕەنجی خۆی و یاوەرانی بەرێزیی کۆمەڵکارییەکەیان گەیاندە ئاستی دامەزراندنی کۆمەڵگەو دەوڵەتی ئیسلامیی لە مەدینە..

بەرەنجی بەشەریی خۆیان (بە ئارەق و فرمێسک وخوێن) پاراستیان و گەشەو نەشونمایان بە کۆمەڵگەو دەوڵەتدا، تا گەیاندیانە ئەو ئاستە باڵایەی

شارستانێتی پڕدادی شەرع و ئاسوودیی ئیمان و ئەمان و بەگەڕخستنی خێروبێری سەرزەمین (بە پێی تەکنۆلۆژیای سەردەمانی ئەو کاتەی موسوڵمانان) بۆ کامەرانیی و بەختەوەریی مرۆڤ لە دنیاو قیامەتدا...

ئەو کەسانەی لافوگەزافی مافی خوایی بۆ دەسەڵاتداریێتی بۆ ئیسلام رادەگەیێنن، بوختان هەڵدەبەستن ،چونکە شتی وا بە هیچ کلۆجێک لە ئیسلامدا نییە.

**خاڵی یەکەم: مرۆڤێتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە قورئانی پیرۆزدا:**

-خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: کە ئاوا وەڵامی موشریکەکان بدەرەوە: ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ۝٥٠﴾ الأنعام: ٥٠.

واتە: بفەرموو: خۆ ناشێت لە خۆمەوە پێتان بڵێم:من گەنجینەکانی خوای گەورەم بەدەستەو دەتوانم رزق و رۆزیی بدەم... من نە خاوەنی ئەو گەنجینەم و نە خاوەنی قسەی واش دەبم..

من هیچ شتێکی نادیار (غەیب) نازانم، هەر وەکو کە ئێوە نایننن، مەگەر ئەوەی کە خوای گەورە بە وەحی بۆ منی ڕوونکردبێتەوە.. من ناشڵێم من فریشتەم وخوای گەورە منی تایبەتتر لە ئێوەی مرۆڤ خەلقکردووە....

نا من هەر مرۆڤم، بەڵام من لە خوای گەورەوە وەحیم بۆ دێت و بە پێی ئەو وەحییە رەفتاردەکەم.

بفەرموو: دەی سا کوێر (کافر) وەکو چاوساغ (موسوڵمان)ە؟

نەخێر ،چونکە موسوڵمانەکە پێناسەی گەردوون و ژیان و مرۆڤ و پێکهاتەو

چارەنووسی هەموانی لایەو بە وەحی خوایی بۆی ڕوونبۆتەوە..

چۆن ئەم كەسە وەكو ئەو نەزانە وایە، كە هەر رۆژەو لەسەر پێناسەیەكی نامۆو دوورو غەیرە واقیعیە؟

دەی سا بۆچی بیر لەمە ناكەنەوە؟!.

-﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨﴾ الأعراف: ١٨٨ .

واتە: بفەرموو: من ناتوانم سوودێك بە خۆم بگەیێنم، یان زیانێك لە خۆم دووربخەمەوە بێویست و ئیرادەی خوای گەورە ،چونكە سوودو زیان لەدەست ئەو دایە.

من هیچ شتێكی نادیار (غەیب) نازانم. ئەگەر بمزانیایە خۆم لە هەموو زیان و كەم و كورتیەك لا دەدا، كە دەهاتەڕێم: (نەخۆشیی، هەژاریی، ئازاردانی دوژمنان... هتد) ئەوە وەحی خوایەو بۆم دێت، شێت نەبووم، جنۆكە دەستی لێنەوەشاندووم، نابزركێنم، نەخەڵەفاوم.. ئەوەی دەیڵێم قورئانەو وەحی خواییە، من بووم بە پێغەمبەری خوا، تا هۆشداریی بدەمە ئەو كەسانەی دیدو رێی كوفر دەگرنەبەر، كە سزایان دۆزەخ دەبێتو مژدەش بدەمە ئەو كەسانەی كە ئیسلامەتی وەردەگرن، كە پاداشتیان بەهەشت دەبێت.

- خوای گەورە بە موشریكەكانیش دەفەرمووێ: ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ التوبة: ١٢٨ .

واتە: نێرراویان لە خوای گەورەوە بۆ هەڵبژێرراوە، كە هەر لە خۆتانە كەللەڕەقیی و هەڵوێستی دوژمنكارییەكانتانی بەلاوە سەختە، پێیناخۆشە كە

ئاوان و باوەڕ بە پێغەمبەرێتییەکەی ناهێنن، سوورە لەسەر ئیهاندراریتان ،چونکە دەزانێت سەرەنجامی کوفرو ئیهان چییەو چۆن دەبێت، بۆیە بەرامبەر موسوڵمانان ئەوەندە بەسۆزو دڵنەواو بە بەزەییە.

- دوای موجادەلەکردن و شەڕە قسەی موشریکەکان بەرامبەر بانگەوازی خوایی و پێغەمبەرەکەی خوا (صلى الله عليه وسلم)، خوای گەورە پێیدەفەرمووێ: کە ئاوا دیدو هەڵوێستی خۆیان بۆ ڕوون بکاتەوە: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ٩٠ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ٩١ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ٩٢ أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ٩٣ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ٩٤ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا ٩٥ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ٩٦﴾ الإسراء: ٩٠ – ٩٦ .

واتە: وتیان: باوەڕت پێناهێنین تا موعجیزەی بەرجەستەت لێنەبینین، ئادەی کانیاوێکمان لەم دەشتە بۆ هەڵقوڵێنە، یا خواکەت بیکردیتایە بە خاوەنی باخ و باخاتی دارخورما و ترێ و میوەی تر، کە ڕوباریان بە نێواندا بهاتایەو بچوایەو لێرەو لەوێ هەڵقوڵییایەو نافورەیان پێ دروستبوایە، یان ئەگەر ڕاستەو هەڕەشەکانت دێنەدیی _کە خواکەت غەزەبمان لێدەگرێت_ ئادەی سا ئاسمانمان بەسەردا بڕوخێنە، یان بڕۆ خواکەت بێنەو با فریشتە پۆل پۆل بە ریز لەملاتەوە بن (وەکو پاشای رۆم و کیسرای فارس!) با ڕووەوڕوومان ببنەوەو بیانبینین، یان

بـا تـۆ لە ئـێمە دەوڵەمەنـدترو بەدەسـەڵاترکات، بـا کۆشـک و تەلاری زێڕینـت هەبێت،یان لەبەر چاومان بفڕە، پەیژەیەک دانێ و پێدا سەرکەوە بۆ ئاسمان، ئەگەر واشبکەیت و بشتبینین، کە بە پەیـژەکەدا _لەبەرچاومـان_ دەچیـتە ئاسـمان، هەر باوەڕت پێناکەین! تا لەو سەرەوە، لە ئاسمانەوە نامەیەکمان بـۆ دێنیـت، لە خـواوە کە مۆری خوای پێوە بێت، کە محمـد ((صـلى اللـه عليـه وسـلم))ڕاسـتدەکات نێرراوی منە، ئێمەش دەیبینین و دەیخوێنینەوە...

بفەرموو: پاک و بێخەوشی بۆ خـوای پەروەردگـارم، چـما مـن چـیم؟ مـن هەر مرۆڤێکی وەکو ئێوەم، من هەر وەحیم بۆ دێت، تا پێتانی بگەیێنم، من هەر وەکو پێغەمبەرانی پێشووم (عليهم السلام).

ئێمەش هەر وەکو ئێوە بەشەرین، هەر موعجیزەیەکمان پێ بنوێنرێت لە خوای گەورەوە دەبێـت، ئەوەی کە بـۆتە بەربەسـتی رێـی باوەڕهێنـانی خەڵکـی و وەرنەگرتنی هیدایەتی خوایی ئەوەیە کە دەیانوت: چـما خـوای گەورە مرۆڤێکـی کردووە بە نێرراوی خۆی؟! بۆچی فریشتەی لای خۆیی نەناردووە؟!

بفەرموو: ئاخر ئەگەر نیشتەجێیانی سـەرزەمین فریشـتە بوونـایەو هـێمن و ئاسوودە بهاتنایەو بچوونایە، حەتمەن ئێمەش فریشتەمان دەکردە نێرراوی خۆمان و دەماننااردن.

بفەرموو: خۆ خوای گەورە بەسە بۆ شاهێدیدانی نێوانمان کە شـاهێدیی دەدات کە من نێرراوی ئەوم، خوای گەورە بە نیـیەت و رەفتـاری پەنهـان و ئاشـکراتان دەزانێت و نەتانبینێت.

-هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەبەموشریکانی دەفەرموو: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰ

﴿أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَاۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٥﴾ ۞ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾﴾ الأنعام: ٣٣ – ٣٦ .

واتە: بەتەئکید دەزانین چیت پێدەڵێن، دەشزانین کە بەدرۆخستنەوەو تانەو تەشەر لێدانیان لێت خەمباردەکات، بەڵام دڵنیابە لە ناخی خۆیاندا بەدرۆزنت نازانن.

دەزانن ڕاستدەکەیت، بەڵام ستەمکارو دڵڕەق و دڵڕەشن، هەر بۆ بەدرۆخستنەوەو ڕەتکردنەوەی قورئانی خوای گەورە ئەو هەڵوێستە بەرامبەر جەنابت دەنوێنن.

پێغەمبەرانی پێش جەنابت وایان لێ بەسەرهات.. بە درۆیانخستنەوەو دوژمندارێتیان کردن، بەڵام ئەوان هەر بەئارامبوون و خۆیان بەرامبەر دوژمندارێتی قەومەکانیان و ئازارو کێشەکانیان گرت و پشوو درێژانە لەسەر بانگەوازی خوایی بەردەوامبوون، تا سەرکەوتنی ئێمەیان دەستکەوت، شایانیان بوو،جەنابیشت سەبربگرە، سەرکەوتن بۆ خۆت و بانگەوازەکەتەو بەزین و شکستیی بۆ ئەوان و دین و ڕەنجیانە...

ئەمە بەڵێنی خوای گەورەیە، ئەمە ڕێسای بزاوتی دینەکەیەتی، جێگرەو نەگۆڕە، بەهیچ کلۆجێک گۆڕانی بەسەردا نایات، بێخەم بە... باسی پێغەمبەرانی پێشوت بۆ کراوە، تا ببێتە سەلوای دڵ و مایەی ئارامی و خۆگریت.

ئەوانیش وەکو جەنابت دووچاری کەندو کۆسپ بوون و سەبریانگرت تا سەرکەوتنی خوای گەورەیان بۆ هات... کە ئەوەندە لەسەر هیدایەتدان و موسوڵمانبوونیان سووریت، بە لاتەوە زۆر سەختە کە ئاوا ڕوویان لە دینی خوای گەورە وەرگێڕاوە.

چـما تـۆ دەتوانیـت ڕێڕەوێـک بە نـاخی زەویـدا دروسـتبکەیت و پێیـدا

بێیـــت و بچیـــت؟! دەتوانیـــت پەیـــژەیەک بە ئاســـمانەوە رابگریـــت و پێیـــدا ســـەرکەویت؟! نـــا، نەخێـــر جـــا خـــۆ ئەمە لە هیدایەتـــدانیان ئاســـانترە،چونکە هیدایەتـــدانیان بە حەزو ویســـتی جەنابـــت نیـــیە، کـــارو بەرپرســـێتی جەنابـــت نیـــیە، ئەگەر خـــوای گەورە بیویســـتایە هەموویـــانی هیدایەتـــدەداو لەســـەر دینی خوا کۆدەبوونەوە.

ئیـــدیی خـــۆ مەخەرە ریـــزی نەفامـــانەوە، ئەو کەســـانە بە دەنـــگ بـــانگەوازەکەتەوە دێـــن، کە زینـــدوون و گوێـــدەگرن، ئەمـــما کـــافرە دڵ مردووەکـان ئەوە هەر لەسـەر دیـدو رێـی کوفریـان دەمێـنـنەوە، پاشـان خـوای گەورە لە رۆژی دواییدا زیندوویاندەکاتەوە.

ئەوەنـدە ئـایەتەی، کە هێنامـانەوە بـۆ بەڵگەهێنـانەوە لەسـەر مرۆڤێتـی پێغەمـبەری خـوا (صـلی اللـە علیـە وسـلم) بەسـن،کە هەر یەکێکیـان هەمـوو سیفەتێکی خوایەتی لە پێغەمبەری خوا (صـلی اللـە علیـە وسـلم) دادەماڵێـت و دەیسەلمێنێت کە مرۆڤەو وەحی بـۆ دێـت، تـا دینـی خـوا بە خەڵکـی بگەیێنێـت و مەبەستی ناسین و پەرستنی خوای تاکوپاکەوبەس، هیچ مەبەستێکی مرۆیی بۆ خۆی تێدانییە.

بێگومان ئەمانە زەقترین نیشانەی پێغەمبەرێتیی پێغەمـبەری خـوان (صـلی اللە علیە وسلم)، کەهەموو رەنج و مەبەسـتێکی هەر لەبەر رەزامەنـدیی خـوای گەورە بـوو، هـیچ مەبەسـتێکی بـۆ خـۆی تێـدا نەبـووە، نە دەسـەڵاتدارێتیی و ناوبانگ، نە ماڵ و سامان و نە چێژەکان ژیان.. هەرچیشی هەبوو هەر لە پێنـاوی ئەم دینەدا خەرجی دەکردەوە(١).

---

(١) الشیخ عبدالجلیل عیسی: اجتهـاد الرسـول چـاپی دارالبیـان/ کوەیـت ١٣٨٩+ک/١٩٦٩ز ل: ١٠ و دواتریی.

_ مەولانا محمـد عەلی تێبینییەکی جوانی لە پێشەکی کتێبەکەیدا: (دینی ئیسلامی) _کە بە ئینگلیزی نوسیوێتی_ هێناوەتەوە، کە دەڵێ: زۆر لە نووسـەرە رۆژئاواییەکـان سـوورن لەسەر ئەوەی کە دینی ئیسلام بە ناوی دینی محەممەدیی بهێـنن، هەر وەکـو کە دەوترێـت ←

**خاڵی دووەم: مرۆڤێتیی پێغەمبەرێتیی خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسوننەتدا:**

سییره وسوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەمان نیشان دەدەن کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هیچ شێوەیەک پێی پەسەندنەبوو کە شوێنکەوتوانی لە ئاست و پلەیەکی پیرۆزیی و مەزنیی وایدا دابنێن کە لە مرۆڤ باڵاتربێت و خوانەکردە بچێتە ئاستی ناشەرعییەوە.

نەیدەهێشت کەسیان هیچ سیفەتێکی فریشتەی بەبەردابکات، چجای سیفەتی خوایی،بە هەموو شێوەیەک رێی لە موسوڵمانان دەگرت کە لە ئاستی مرۆڤێتیی و پێغەمبەرێتیی باڵاتری ببەن، نەبادا ئەمانیش وەکو دیانەکان بکەونە شیرکەوە وەکو کە ئەوان لە زێدەڕۆیی و بە پیرۆزو مەزن و موبارەکدانانی سەیدنا عیساو دایکییدا (علیها السلام )کەوتنە شیرکەوەو دیدو روانگەو پێناسە عەقائیدییەکەی تەوحیدیان گۆڕی.

---

مەسیحیی و بودایی و ئەوانە.

دەڵێ: ئەمە بە راستی هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە کەس بە درێژایی مێژوی ئەم دینە زاراوەی (دینی محەممەدیی)ی بەکارنەهێناوە.

هیچ بەڵگەیەک نە لە قورئان و نە لە سوننەتدا نییە کە پاڵپشتی ئەم زاراوەیە بێت،ئەو ناوەی خوای گەورە لە دینەکەی ناوە (ئیسلام)ە، چونکە مەبەستیش لێی ئەوەیە کە ئەمە دینی هەموو مرۆڤایەتییە)..

گومانی تێدانییە کە ئەم تێبینییەی مەولاناش ئیزافە دەبێتە سەر ئەو بەڵگانەیتر کە هێنامانەوە کە ناهێڵن هیچ جۆرە پیرۆزیی و مەزنێتییەکی ناسروشتیی بکرێتەبەر کەس، ئەگەرچی پێغەمبەری خواش بێت علیه الصلاة والسلام. ئینتیمای جەنابیشی (صلی الله علیه وسلم) هەر دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ئیسلامەکەو بووترێت پێغەمبەری ئیسلام!

بڕوانە کتێبەکەی مەولانا: (Maulana Muhammed Aly, The Religion of Islam, Cairo by National Puplication, Printing house P.1).

بەمەش ناوەرۆکی پەیامی تەوحیدیان گۆڕیی، کە سەیدنا عیسا (علیه السلام)بۆی هێنابوون و تییێگەیاندبوون.. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەمە دەترسا، بۆیە نەیدەهێشت هیچ کەسێک-ئەگەر موشریکیش بوایە- لەو ئاستی مرۆڤێتیی و پێغەمبەرێتییەی بەرزتر دابنێت..

ڕۆژێک کابرایەکی هەژار هاتە خزمەتی، کە گەیشتەلای هەموو گیانی کەوتە لەرزین و داهاتەوە بۆ لای پێی. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خێراگرتی و نەیهێشت و فەرمووی: (رُوَيدَكَ يا هذا إنَّما أنَا بَشَرٌ، أنَا ابنُ امْرَأةٍ أعْرَابيَّةٍ كانتْ تَأكُلُ القَديدَ).[1]

واتە: هێدیی و لەسەرخۆ بە، خۆ من هەر مرۆڤێکم، کوڕی ئافرەتێکی ئەعرابییم، کەگۆشتی وشککراوەی دەخوارد.

-موسلیم لە عەدیی کوڕی حاتەمەوە - خوالێی ڕازی بێت -دەگێڕێتەوە (أَنَّ رَجُلًا خَطَبَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ مَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَقَدْ غَوَى فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ قُلْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)[2] واتە: کابرایەک لە پێش پێغەمبەری خوا (صلی

(١) نووسەری بەڕێز ئەم روداوەو ئەوانی دواتری هەروا بێ سەنەد لە کتێبەکەی شێخ عبدالجەلیل عیساوە نەقڵکردووە. ئەو ریوایەتەی سەرەوەم نەدۆزیەوە کە لەفزی (أعرابية)ەکەی تێدا بێت. بەڵام ئەمە ریوایەتی ترێتی (هَوِّنْ عَلَيْكَ ، فَلَسْتُ بِمَلِكٍ، إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ كَانَتْ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ) ئیبنوماجە (٣٣١٢)، حاکم (٤٧/٣) فەرمووشیەتی: سەحیحە بە پیی مەرجەکانی بوخاری و مەسلیمەو ئیمامی ذەهەبیش فەرموویەتی: وایە. شێخی ئەلبانیش رحمەاللە لە (سلسلة الأحاديث الصحيحة/٤٩٦/٤ )دا دەفەرموێ: سەحیحە.

(٢) راستە لای موسلیم ژمارە (٨٧٠)یەو لای ئەبوداوود (٤٩٨١)، نەسائی (٣٢٧٩)یە.

الله علیه وسلم) وتاریـدا، لە وتارەکەیـدا وتـی: هەر کەسـێک ملکەچـی خـواو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بێت بە دڵنیاییەوە خوای گەورە هیدایەتی دەدات، هەر کەسێکیش سەرپێچییان بکات گومڕای دەکات.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: خەتیبێکی خراپ بوویت، بڵێ: هەر کەسێک سەرپێچی خـوای گەورەو پێغەمـبەرکەی (صـلی اللـه علیـه وسلم) بکات.. مەبەستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسـلم) ئەوەبـوو: کە ناشێت ناوی خوای گەورەو ناوی جەنابی (صلی الله علیه وسلم) بەیەک ڕاناوی دوانە (هما) کۆبکاتەوە، تـا بیسـەرانی وا نەزانـن لە یەکێـک لەسـیفەتەکانیاندا هاوبەشن.

هەروەهـا دەبینـین کە قسـەی کابرایەکـت ڕەتکـردەوە کە عەرزیکـرد: (إن شاءَاللهُ وشِئْتَ) فەرمووی: (أتَجَعْلُني للهِ نِدَّاً قُلْ إذا شاءَاللهُ ثُمَّ شِئْتَ).[1]

واتە: ئەگەر خواو جەنابت حەزکەیت فەرمووی: کـردتم بە هاوبەشـی خـوای گەورە، کە ئەو خەلقی کردوویت؟!

بڵێ: ئەگەر خوای گەورە حەز بکات، پاشان جەنابیشت حەز بکەیت.

-بوخـاری لە سـەیدنا عـومەری کـوڕی خەتتـابەوە - خـوالێی ڕازی بێـت – دەگێـڕێتەوە: کە گـوێی لە پێغەمـبەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) بـوو کە

(١) نووسەری بەڕێز ئەمەشیانی هەر ئاوا هێناوەتەوەو وا دەفامرێتەوە کە هەر موسـلیم گێـڕابێتییەوە. وانییە.. بە لەفزی (أتجعلنـي) هەر نەمـدۆزیەوە. لای نەسـائی و ئیبنومـاجەو ئیمامـی ئەحـمەدو بەیهیقی و دەیانیتر هەر بە لەفزی (أجعلتني)یە. وەکو: (أجَعَلْتَنِي معَ اللهِ نِـدَّاً، لا، بَـلْ مـا شـاءَ اللـهُ وحْـدَهُ) بوخـاری لە: (الأدب المفـرد ٧٨٧) ئیبنومـاجە (٢١١٧)، ئەحـمەد (٢١٤/١). شـێخی ئەلبـانی رحمەالله لە (سلسلة الأحادیث الصحیحة/١٣٩ )دا دەفەرموێ: سەحیحە.

فەرمووی: (لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ).(١)

واتە: لە وەسفمدا، لە مەدحمدا زێدەڕۆیی مەکەن، هەر وەکو دیانەکان لە مەدحی عیسای کوڕی مەریەمدا زێدە ڕۆییان کرد، من هەر عەبدێکی خوام و بەس، بڵێن: عەبدی خوای گەورەو نێرراوەکەی.

-ئیبنو حەجەری عەسقەلانی -رحمەاللە - دەفەرمووێ: هۆی ئەوە کە پێغەمبەری (صلی اللە علیە وسلم) وای فەرموو ئەوە بوو، کە ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە: کە موعازی کوڕی جەبەل - خوالێی ڕازی بێت -_دوای ئەوەی لە یەمەن گەڕایەوە- عەرزی پێغەمبەری خوای (صلی اللە علیە وسلم) کرد (یا رسولَ اللهِ رأيتُ رِجالاً باليَمَنِ يَسجُدُ بعضُهم لِبعضٍ، أفَلا نَسْجُدُ لَكَ؟ فقال رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): لا تَطروني.... ).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ! خەڵکم لە یەمەن بینی سوجدەیان بۆیەکتریی دەبردو ئەرێ ئێمەش سوجدە بۆ جەنابت نەبەین؟!

فەرمووی: زێدەڕۆیی لە مەدحمدا مەکەن... باقی فەرموودەکە.

-زۆر جار پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) لە کاتی زۆر لێنزیکی یاوەراندا پێیدە فەرموون: (انَّمَا انَا بَشَرٌ) لە هەموو بۆنەیەکدا وایدەفەرموو، کە یاوەرێک بێئاگا لە شتێکدا هەڵەیەکی بکردایەو یەکسەر ڕاستیدەکردەوە پێی..

بوخاری وموسلیم گیڕاویانەتەوە، کە جارێک پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) کە نوێژی چوارینەی بە یاوەران کرد، پێنج رکاتی کرد، کە سەلامی دایەوە، عەرزیانکرد: ئەرێ ئەی پێغەمبەری خوا، نوێژ زیادیکردووە؟ !

---

(١) راستە. بوخاری (٣٢١٤)، ئەحمەد (١٥٢).

فەرمووی: چییە وادەپرسن؟ !

عەرزیانکرد: جەنابت پێنج رکاتت کرد!

فەرمووی: (إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي).(١)

واتە: منیش وەکو ئێوە بەشەرم، بیرم دەچێتەوە وەکو کە ئێوە شتتان بیردەچێتەوە، سەهوو دەکەن ئەگەر شتێکم بیرچۆوە، بیرم بخەنەوە.

-تەنانەت لە ساتەوەختی سەرەمەرگیشییدا جەختی لەم مرۆڤێتییەی خۆی دەکردەوە، تەئکیدی لە پلەو پایەی بەشەرێتیی و عەبدێتیی خۆی بۆ خوای گەورە دەکردوە...

موسلیم لە جوندوبی کوڕی عبداللەوە - خوالێی ڕازی بێت -دەگێڕێتەوە :کە پێنج شەوو رۆژ پێش کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) فەرمووی: (وَإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ فَإِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ).(٢)

واتە: ئەو قەومانەی پێش ئێوە، گۆڕی پێغەمبەرو پیاوچاکانی خۆیانیان کردە جێ نوێژو نزرگەی پەرستن، نەکەن ئێوە مزگەوت لەسەر گوڕو مەرقەدان دروستبکەن، من بەرهەڵستی ئەوەتان لێدەکەم!

-(مومیریی) رۆژهەڵاتناس لەم بارەوە دەڵێ: (لە سەرەتای دینی (محمد)ەوە بگرە تا کۆتایی، بەڵگەیەکت بەرچاو ناکەوێت بڵێت: کە ئەم پیاوە ویستوێتی پلەیەک، یان سیفەتێکی خوایی بدرێتێ، یان قەومەکەی لە پلەو ئاستی مرۆڤێتیی باڵاتر دابینێن)، پاشان دەڵێ: (ئەمە لە کاتێکدایە، کە ئەگەر وای

---

(١) بوخاری (٣٨٩)، موسلیم(٨٩٧).

(٢) نووسەری بەڕیز نوسیوێتی:(بگەڕێرەوە سەر الشیخ عبدالجلیل عیسی: اجتهاد الرسول ل: ١٢ و دواتریی. هەروەها: ابن تیمیە: منهاج السنة ل: ٣٣١.. فەرموودەکە: موسلیم ژمارە (٥٣٢)ە.

بویستایە بۆی دەچووەسەر ،چونكە زەمانەكەی سەردەمی ئەو شتانە بوو)[١].

دیارە كە ویستی خوای گەورە وابوو: كە پێغەمبەرە بەڕێزەكەی (صلى الله علیه وسلم) لە سروشت و سیفەتی مرۆڤێتیی بەدەرنەبێت ،چونكە دەیزانی و دەیویست كە ئەم پێغەمبەرە (صلى الله علیه وسلم) بۆ قەومێك، بۆ نەوەیەكی مرۆڤایەتیی نییە، بەڵكو بۆ هەموو نەوەكانی مرۆڤایەتییە، تا ئەو كاتەی ژیان كۆتایی دێت.

ئەمەش ئەو سروشت و سیفەتە مرۆڤیانەی لە جەنابی (صلى الله علیه وسلم) دەویست، خۆ خوای گەورە دەیتوانی هەندێك سیفەتی ئیزافی پێببەخشیایەو لە سروشت و سیفەتی گشتی مرۆڤی ئاسایی باڵاتر خەلقی بكردایا، بەڵام خوای گەورە دەیویست هەر بە سیفەتی مرۆڤێتییە راقیەكەی ئەوە بهێنێتەدیی، كە هێنایەدیی.. تا كەس وا نەزانێت كە ئەم دینە بە خودی پێغەمبەری خواوە (صلى الله علیه وسلم) و بە ژیانیەوە پەیوەستەو سەلماندن و چەسپاندنەوەی فەرماندەو رێبەرێكی لە مرۆڤ بەدەر دەخوازێت..

خوای گەورە ویستی وا بوو:كە ئەم پەیامە مەزنە جیهانییەی بەو پێغەمبەرە مرۆڤە بەڕێزەی (صلى الله علیه وسلم) و بەو قەومە عەرەبە نەخوێندەوارە بچەسپێنێت و بڵاوبكاتەوە[٢].

**خاڵی سێیەم: یاوەران لەسەر دیدو رێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) بوون:**

كە ئەم دەقانەی قورئان و سوننەت (گوفتارو كردار و بڕیار) شاهێدیی مرۆڤێتیی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەدەن و ئەوە دەسەلمێنن: كە جەنابی (صلى الله علیه وسلم) عەبدو هەڵبژێرراوی پەیامی خوای گەورەیە، تا

(١) لە كتێبەكەی سەید ئەمیر عەلییەوە: (روح الاسلام ل: ٤٥) وەرگیراوە.

(٢) اجتهاد الرسول ل: ٢٦.

خوایەتی خوای گەورەو عەبدێتیی بەشەر بۆ خوا بسەلمێنێت و شـەرعی خوایـان لەناودا بچەسپێنێت.

دوای ئەمە هەر جۆرە پاڵدانی سیفەتێکی خوایی بە جەنابی (صلی الله علیـە وسلم) قسەی بەتاڵ و نارەوا دەبێت.

جا کە بۆ ئەم زاتە بەڕێزە (صلى الله علیه وسلم) وابێت، بە تەئکید بۆ هەموو خەلیفەو حاکم و دەسەڵاتدارو ڕێبەرانی ئوممەت و دەوڵەتی ئیسلامییش هەر وا دەبێت.

بۆیە هەر کەسێک لافی هەر جۆرە سیفەتێکی خوایی بۆ خـۆی یـان بـۆ هەر دەسـەڵاتدارێک لێـدابێت، زانایـان و تەقواکـارانی ئـوممەت بەرەنگـاری وەستاونەتەوەو نەیانهێشتووە ئەو ئینحیرافە خۆی بگرێت.

ئەوە بەڵگەنەویستە کە خولەفـای راشـیدین و یـاوەران -خـوا لێیـان رازی بێت-، هەروەها پێشەوایان و زانایانی تابعین و تابیعی تـابیعین زۆر سـووربوون لەسـەر ئیقتیـداکردن بە پێغەمـبەری خـوا (صـلى اللـه علیـه وسـلم) لە هەمـوو شتێکییدا، بەتایبەتی لە پاراستنی (تەوحید)دا بەپاکیی.

نەیاندەهێشت بە هیچ کلۆجێک کەس سنووری مرۆڤێتیی وعەبدێتیی خـۆی ببەزێنێت... دیهان کە چـۆن سـەیدنا ئەبـوبەکر - خـوالێی ڕازی بێـت -نەیهێشـت بە(خلیفة الله) بـانگی بـکەن، بەڵکـو بە (خلیفـة رسـول الـله (صـلی اللـه علیـه وسلم)).. لە یەکەمین وتاری خیلافەتەکەشییدا دوای بەیعەتپێـدانی فەرمـووی: (أَيُّها الناسُ فَإِني قد وُلِّيتُ عليكم ولست بخيركم فإِنْ أَحْسَنْتُ فَأَعِينُوني وإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُوني)[1] .

---

(١) نووسەری بەڕێز هەروا بێ سەنەد هێناوێتییەوە. دوای بەدواداچوونم لەم سـەرچاوانەدا دۆزیـمەوە الحمدلله: سیرة ابن هشام : ٢٤٠/٤، عیون الأخبار لابن قتیبة : ٢/ ٢٣٤، ابن کثیـر: البدایـة والنهایـة ٣٣٢/٤.

واتە: هۆ خەڵکینە! وا دەسەڵاتدارێتیتانم خرایە ئەستۆ من چاکتر ینتان نیم، ئەگەر کاری چاکم کرد یارمەتیم بدەن، ئەگەر کاری چەوتم کرد ڕاستم بکەنەوە.

-سەیدنا عومەری کوڕی خەتتابیش - خوالێی ڕازی بێت -لە وتاری یەکەمییدا کە بوو بە خەلیفە فەرمووی: (فإنِّي امْرُؤ مُسلمٌ وَعَبدٌ ضعيفٌ الا ما أعانَ اللهُ، ولَنْ يُغَيِّرَ الذي وَلَّيتُ من خلافتكُم من خُلُقي شَيئاً إنْ شاءَ اللهُ. إنَّما الْعَظَمَةُ لله، وَلَيسَ للْعباد منها شَئٌ فَلا يَقولَنَّ أَحَدُكُمْ انَّ عُمَرَ تَغَيَّرَ مُنْذُ وَلَّى، وإنيِّ أعْقلُ الْحَقَّ من نَفسي، وأتَقَدَّمُ وأُبَينُّ لَكُمْ أمْري، فَأيَّمَا رَجُل كانَتْ لَهُ حَاجَةٌ أو ظُلمَ مَظْلَمَةً أو عَتَبَ علينا في خُلُقٍ، فَليؤذنيِّ، فإنَّما انَا رَجُلٌ مِنْكُم)[1].

واتە: من کابرایەکی موسوڵمانم ،عەبدێکی لاوازی خوای گەورەم و هیچم پێناکرێت غەیری ئەوەی کە خوای گەورە تێیدا یارمەتیم دەدات.

ئەوەش کە دەسەڵاتدارێتیم گرتۆتەدەست بەسەرتانەوە، هیچ رەفتارو رەوشتێکم پێناگۆڕێت، مەزنیی و گەورەیی هەر بۆ خوای گەورەیەو عەبدەکانی هیچ پشکێکیان تێیدا نییە... کەستان نەڵێت: عومەر لەوەتای بووە بە دەسەڵاتداری باڵا گۆڕاوە، نا ،خۆم هەر بە حەقەوە بەستۆتەوە، دیدو هەڵوێستی خۆمتان بۆ ڕووندەکەمەوە. هەر کەسێک پێویستییەکی هاەبێت یان ستەمێکی لێکرابێت یان گلەیی لە رەفتارێکمان هەبێت، با بێتە لام و حەقی خۆی وەرگرێت، من هەر یەکێکم لە خۆتان.

دەبینین سەیدنا عومەر - خوالێی ڕازی بێت -کە سەیدنا سەعدی کوڕی ئەبووەققاصی کرد بە ئەمیری لەشکری موسوڵمانان لە جەنگەکانی عێراقدا، پێش هەموو شتێک ئاوا ئامۆژگاریی کرد: (يا سَعدُ بنُ وُهَيب لا يَغُرَّنَّكَ من الله أنْ قيلَ خَالُ رسول الله ﷺ وصاحبُهُ، فإنَّ اللهَ لا يَمحُو السَّيءَ بالسَّيءِ، ولكنْ يَمحُو السَّيءَ بِالْحَسَنِ، وإنَّ اللهَ ليسَ بينَهُ وبينَ أحَدٍ نَسَبٌ إلاَّ بِطَاعَته، فَالنَّاسُ شَرِيفُهم

---

(١) محمد حسين هيكل: الفاروق عمر ب١ ل:١٠٦.

ووَضيعُهم في ذات الله سواءٌ، اللهُ ربُّهمْ، وهُمْ عِبَادُهُ، يَتَفَاضَلُونَ بالعَافية وَيُدْركُونَ ما عَنْدَ الله بالطَّاعَةَ، فَانْظُرْ الأمرَ الـذي رأيـتَ رَسـولَ اللـهِ ﷺ مُنْذُ بُعِـثَ إلى أنْ فارَقَنَا علَيهِ فَالْزمْهُ، فإنَّهُ أمْرٌ ).

واته: هـۆ سـەعدی کـوڕی وهەیـب ! مەغروورنەبیـت کە دەڵـێن: خـاڵی پێغەمبەری خوایت (صلى الله عليه وسلم) و یاوەری ئەویت، خوای گەورە خراپە بەخراپە ناسڕێتەوە، خراپە بە چاکە دەسڕێتەوە.

خوای گەورە خزمایەتیی ونەسەبی لەگەڵ کەسدا نییە، هەموو پەیوەندییەک بە خوای گەورەوە لە ڕێی گوێڕایەڵیی و ملکەچبوونەوەیە بۆی، نـاودارو بێنـاوی خەڵکی لای خوای گەورە یەکسانن.

پلەکارییـــان بەســـاغێتی ئـــیمان و چـــاکی دینـــدارێتییانە، بە ملکەچیـــی فەرمانەکانیی دەستیان لە پاداشتی خوای گەورە گیردەبێت... تۆش بڕوانە ئەوەی کە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) لەسەر بـووەو پێـوەی پابەنـدبووە، تۆش خۆتی پێوە پابەندکەو سەبریشی لەسەربگرە.

لەم دیدو ڕوانگەوەیە، کە دەبینین سەیدنا عـومەر هەڵوێسـتی لە خێـزان و خانەوادەو خزمانی خۆی و هەموو هۆزی( بەنی عەدیی) خۆی، توندو تیژبوو، تـا کەس ئومێدی بۆ دروست نەبێت کە مادام سەیدنا عومەری خزمم بـۆتە خەلـیفە زیاترم دەستدەکەوێت... وایان لێهاتبوو خۆزگەیان دەخواست بە قەدەر خەڵکییان پێببڕێت!! یان زوو بیاندرێتێ!.

زەیـدی کـوڕی ئەسـلەم - خـوالێی ڕازی بێـت –دەگێـڕێتەوە: کە کاتێـک سەیدنا عومەر کەوتە ڕێکخستنی دیوان (ناو تۆمـارکردنی ڕەسـمی خەڵکـی، تـا هەر یەکە پشـکی خـۆی لە زەکـات و بەیتولمـال وەربگرێـت) ،(بەنـوعەدیی) هاتنەخزمەتی، تا ئەوانیش ناونووس بکات..

عەرزیـانکرد: مـادام جەنابـت نـاوی خەڵکـی تۆماردەکەیـت، نـاوی ئـێمەش تۆماربکە..

فەرمووی: (بَخٍ بَخٍ يا بَني عَدِي! إنْ أرَدْتُمْ إلَّا الأكْلَ عَلَى ظَهري وأنْ أذهبَ حسَناتي لَكُم! لا واللهِ حتَّى تَأتِيَكُمْ الدَّعوةُ وَلو انْطَبَقَ علَيكُم الدَّفْتَرُ. إنَّ صَاحِبَيَّ سَلَكَا طَرِيقاً فَإنْ خَالَفْتُهمَا خُولِفَ بِي واللهِ مَا أدْرَكْنَا الْفَضْلَ في الدُّنيا والآخِرَةِ ولا نَرْجُو الثَّوابَ عِندَ اللهِ عَلَى عَمَلِنَا إلَّا بِمُحَمَّدٍ، فَهوَ أشْرَفُنا وَقَومُهُ أشرَفُ العَرَبِ ثُمَّ الأقْرَبُ فَالأقْرَبُ، واللهِ لَئِنْ جاءتْ الأعَاجِمُ بِعَمَلٍ وَجِئْنَا بِعَمَلٍ دُونَهم لَهُمْ أوْلَى بِمُحَمَّدٍ مِنَّا يَومَ الْقِيامَةِ فإنَّ مَنْ قَصَرَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ)[1].

واتە: هەی هەی بەنوعەدیی!... نیازتان وایە بە شانوباهوی من بخۆن! دەتانەوێت چاکەکانمتان بۆ بێت؟

نا، والله ناونووستان ناکەم ،تا نۆرەتان دێت، ئەگەر لە تیانووسەکەدا شوێنی زۆر مابێت جارێ ئێوە ناونووس ناکەم... (مەبەستی ئەوەبوو: کە بڕۆن دوای هەموو خەڵکی وەرن ناوتان دەنووسم) .

پاشان فەرمووی: دوو هاوڕێکەی پێشم (پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و سەیدنا ئەبوبەکری صددیق - خوالێی ڕازی بێت -کە هەردووکیان دەسەڵاتداری باڵای ئوممەت و دەوڵەتی ئیسلام بوون) ڕێبازێکیان گرتەبەر، کە ئەگەر پێچەوانەی ڕێبازی ئەوان ڕەفتاربکەم لە منەوە ئینحیراف دەستپێدەکات و دەمکەنە بەهانەی گۆڕینی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و سەیدنا ئەبوبەکر...

ئێمە هەر چاکەیەکمان لە دنیاو قیامەتدا بێتەدەست و هەر پاداشتێکمان _کە ئومێدمانە_ دەستبکەوێت، هەمووی سەرەنجامی ئاڕاستەکردنەکەی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) کە شەریفترین کەسی ناومانە، هۆزەکەشی شەریفترینی عەرەبن، ئینجا نزیکترین کەسیی، پاشان نزیکتر،ئینجا نزیک لێی(واتە :جارێ ئەوانەی خانەوادەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

(١) احمد بن علي القلقشندي: صبح الأعشى ب١٣ ل:١٠٧.

ناونووس دەکەم، پاشان (بەنوهاشـم) و ئینجـا تیـرەو بەرەبابەکـانیتری قـورەیش ئینجا خەڵکیتر)..

بەخوا قەسەم کە قیامەت دێت، ئەگەر غەیرە عەرەب بە دینداریێتیی و تەقوای چاکتر لە عەرەب هاتن ئەوان نزیکتر دەبـن لە محمــد (صـلی اللـە علیـە وسـلم) وەک لە ئـێمە، ئەو کەسـەی بە کـردەوەی چـاک پێشـنەکەوێت، بە نەسـەب و خزمایەتی پێشناکەوێت.

دەورانی سەیدنا عەلی کوڕی ئەبوتـالیبیش - خـوالێی ڕازی بێـت –وابـوو. هەندێکیـان لەکاتی ڕەتکردنەوەی زێدەڕۆیی دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی شـیعەدا باسـکرد، کە شـیعە لە مەنـهەج دەرچـوون ،چـونکە سـیفەتی خوایەتییـان بەبەر ئیمامەکاندا کردووە.. لەسەیدنا عەلی یەوە، تا ئیمامەکانی تریان[1].

مامۆستا (سەیید ئەمیر عەلی) بە چەنـد رسـتەیەکی کـورت و ڕەوانبێـژانە حـــاڵەتەکە وێنادەکـــات کە دەڵـــێ: ســـەرۆکی دینـــی لە ئیســـلامدا کە (امیرالمؤمنین)بـوو، هـیچ خەرمـانەیەکی پیـرۆز بە دەوری نـاوو کەسـایەتییەوە نەنەخشێنرابوو.

لەبەردەستی ڕەعییەتەکەیدا بەرپرسبوو، هەر وەکو کە لێیـان بەرپرسـبوو... خەلیفەکـانی یەکەم _تـا کۆتـا پـلەی بەشـەرییـ_ سـووربوون لەسـەر زوهـدو دنیانەویســتی، بە قەدەر ئەوەنــدەی کە ســووربوون لەســەر نــان و ئەمــان و ئاسوودەیی خەڵکی...

ئەو ژیـانە زاهیـدانەی ئەوان ژیـان، هەمـوو سـیماو سـیفەتێکی لە سـیرەی پێغەمبەری خوا (صلی اللـە علیـە وسـلم) دەچـوو کە پێـی پەروەردەبووبـوون و هەمیشە لەبەرچاویان بوو...

(١) سەرچاوەی پێشوو ل:٩٩.

هەر لە جێ و ڕێی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژیاندەکردو وتاریان دەدا، هەر لە ماڵەکانی خۆیاندا پێشوازیی و میوانداریی هەژارو نەدارو غەریبەیان دەکرد، گوێیان لە گلەیی و بۆڵە دەگرت،چجای لە سکاڵای ستەم کە لە ئاستییدا وا دەوەستان دەتوت وشکبوون! خۆیان زۆر دوورگرتبوو لە هەموو سیماو سیفەتێکی دەسەڵاتی شاهانە، لە کۆشک و تەلارو مەراسیمی، لە حاشیەو خزمەت و ڕەسمییاتی..

هەموویان پێ کاو با بوو،ئەما خۆشەویستیی و ڕێرو قەدریان لە ناخی هەموو ڕەعییەتەکەیاندا ڕەگی داکوتابوو، هەموو خەڵکی بەرامبەریان بەوەفابوون. کەس لێیان نەدەترسا ،چونکە لە دادپەروەرییدا نموونە بوون.

ڕەوشتیان زۆر باڵابوو، بە قەدەر ئەوەندەی زاهیدی دنیابوون، زاهیدی دەسەڵات و حوکمیش بوو [1]. لە دیدو تێڕوانینی عەقائیدیی موسوڵمانەوە ئەوە ڕۆشن و نەگۆڕە کە مرۆڤێک لە قوڕ دروستبووبێت و ئەو هەموو کەموکورتیی و لاوازیی و نەزانییەی لەخۆگرتبێت، چۆن دەبێتە خاوەنی پشکێک لە سیفەتی خوایی؟!

چجای هەموو سیفەتێک و یەکسان بوون پێی! مرۆڤێک کە ناتوانێت لە ڕووی ویستی خوادا بوەستێت، چۆن سیفەتی خوایەتی بەخۆی دەدات؟!

مرۆڤێک با بەڕێزو مەزن و ڕەوشتبەرزیش بێت، با پێغەمبەرێکی مەعسوومیش بێت، چۆن لە عەبدێتی خوای گەورە دەردەچێت؟!

چجای لەوەی خۆی بەگەلی خوا بزانێت! یان یەکێک بە کوڕی خوا

---

[1] روح الإسلام ل:٢٧٢.

بزانێت.. خوای تاک و پـاک کە بە هـیچ شـێوەو رادەو بـڕو چـۆنیەتیەک، هـیچ مەخلوقێک نییە لە هیچ سیفەتێکی خوای گەورەو بێوێنەدا هـاوبەش بێـت... کە لە هیچ سیفەتێکییدا هاوبەش و هاوشێوە نییە، ئیتر چون خوایەتی بۆخۆی زەوت دەکات؟![1].

** ** **

## بەفەزڵی خوای تاکوپاک

لەبەشی یەکەمی وەرگێڕانی کتێبی :(رقابة الامة علی الحکام.. د. علی محمد حسین) بـوومەوە سـەعات ٢٢,٤٥ (دەی شـەو) لە ٩-٢٠١٥/١٠/١٠ = ١٢/٢٤ذی الحــجە /١٤٣٦ ک لە زینــدانی (کـۆنگس ڤیــنگەر)ی نەرویجــی ،کە رۆژی (١٢٤١)ەم رۆژی زیندانمەو والحمدلله، تـا تەواوبـوونی ئەم بەشـەی ئەم کتێـبە بڕی (٧٩٧٠) لاپەڕەی دەستیم لە زینداندا نووسیووە...

خوای گەورە لێمی قبوڵ بکات و بیکاتە خێـری بەردەوامـی خـۆم ودایـک و باوک وخەسوو خەزورو ئەولادو کەسوکارم هەموو... ئامین...

بێگومان خێزانی دڵسۆزیشم، کە( الحمدلله) دوێنێ لە حەج هاتەوە و،منـیش دووسبەی بۆ (٥٤)ەم جار دەچمەوە دادگای ئەم سـتەمکارانە، بـۆ وەڵامـدانەوەی تۆمەتی (٣٧) سی وحەوتەم! لەماوەی ئەم (١٣) سێزدەساڵ و نێوەدا !!

(١) هارولد ب. سمێث: مذهب الإسلام في الإنسان ل: ٥٩. خصائص التصور الإسلامي ل:٢٢٣.

والحمدلله رب العالمين

به قەڵەمی ژماره ١٣٧.

دادگـــایی یەکەم له١٠/١٢ – ١٠/١٧ دەخایەنێـــت بەڵکـــو (ان شـــاء الـــله )له دوومانگی داهاتوودا وەرگێڕانی ئەم کتێبه تەواو بکەم.

کریکار

١٢٤١ رۆژ زینــــدان – ١٢٢ رۆژ که تێمــــدا نەنووســــیون = ١١١٩ رۆژ ١١١٩/٧٩٧٠= ١٢ر٧ ..

رۆژی (٧)لاپەڕه دەستخەت (وكان فضل الله عليك عظيما)

# ناوەڕۆک

**باسی سێیەم**

**باسی چوارەم**